بێرتراند ڕاسڵ

# داگیرکردنی بەختەوەریی

براوەی خەڵاتی نۆبڵ

وەرگێڕانی

فەرشید شەریفی



بێراتراند راسڵ

# داگیرکردنی بەختەوەری

((براوەی خەڵاتی نۆبڵ))

وەرگێڕانی
فەرشید شەریفی




هەولێر - ٢٠١٣

ئەم کتێبە وەرگێڕانێکە لە:
تسخير خوشبختي. برتراند راسل. ترجمه فريدوون حاجتي. چاپ چهارم. ايران. تهران ١٩٨٨




**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

- **داگیرکردنی بەختەوەری**
- بێراتراند راسڵ
- نەخشەسازی ناوەوە: **ڕێدار جەعفەر**
- بەرگ: ڕێمان ـ فەرشید
- نرخ: (٣٠٠٠) دینار
- چاپی یەکەم : ٢٠١٣
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- چاپ: چاپخانەی موکریانی (هەولێر)
- **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٢٥٦٨) ساڵی (٢٠١٢)ی پێ دراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٧١٨)**



**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com
**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

ئەم وەرگێڕانە پێشکەش دەکەم بە مامۆستا «**شێرزاد حەسەن**»...

ئەو پیاوە کەموێنە و ڕاستگۆیەی کە کۆمەڵگای کوردیی، تا سەر ئێسقان پێویستی بە هەزارانی تری وەکوو ئەو هەیە بۆ دارِماندنی دیواری «**ترس**» و «**شەرم**»؛ بۆ شکاندنی شووراکانی «**درۆ**» و «**نەزانین**» و «**خورافە**» و «**بیرە سواوەکان**». ئەو پیاوە مەزنەی کە بە هۆی ئەوەوە چیرۆکی کوردییم ناسی و تا ئێستاش چێژ لە خوێندنەوەی چیرۆک و ڕۆمان دەبینم. بەو پیاوەی کە ڕاستگۆیی کەموێنەی لە هەڵسوکەوت و ڕەفتار و کردەوە و نووسین و لێدوانەکان و، لە هەمووشیان گرینگتر لە گێڕانەوەی چیرۆکەکانیدا وامان لێ دەکات دڵخۆش بین بەوەی کە هێشتا کەسانێک لەم کۆمەڵگایەدا هەن کە خەمی شتە گرینگەکان دەخۆن و باوەڕی تەواویان بە دارِماندنی قەڵا هێقمەکانی «**ترس**» و «**شەرم**» و «**نەزانین**» و لادانی پەردەکانی «**درۆ**» و «**تەڵەکە**» و «**فێڵبازیی**» هەیە. هێشتا کەسانێک هەن کە باوەڕیان بە «**حەزە ڕەواکان**» هەیە و، لە پێناوی دەستەبەرکردنی «**بەختەوەریی**» بۆ تاکەکانی کۆمەڵگادا هەوڵ دەدەن. ئەو پیاوەی کە ڕاستگۆیی و پشتگیرییەکانی، لەدایکبوونی ئەم کتێبەی «**داگیرکردنی بەختەوەریی**» لێ کەوتەوە و، وێڕای سوپاس و پێزانینم بۆ بەڕێزیان، هیوای تەندروستیی و تەمەن درێژییان بۆ بە ئاوات دەخوازم.

وەرگێڕی کوردیی

[ئەم کتێبە] پێشکەشە بە هەموو ئەو کەسانەی کە باوەڕیان بە بەختەوەریی هەیە، بەڵام نازانن چۆن بە دەستی بێنن.

**«واشنگتۆن ستار»**

پێشنیاری خوێندنەوەی ئەم کتێبەمان لێ قبووڵ بکەن کە هەڵقوڵاوی ئاوەزێکی تەندروست و ڕێکوپێکە و لەسەر بنەمای ڕاستییەکان و بۆ هەموو توێژە کۆمەڵایەتییەکان نووسراوە.

**«گۆڤاری ئاتلانتیک»**

ستایشی ڕاسل دەکەین بۆ ئەو میتۆدە ئاقڵانە و لۆژیکییەی کە بۆ داگیرکردنی بەختەوەریی، پێشکەشی کردووە.

**«نیۆیۆرک هراڵد تریبۆن»**

## ناوەڕۆک

پێم وایە دەبێ بگەڕێمەوە [بۆ ناو سرووشت] و لە ناو ئاژەڵاندا بژیم، ئەوان بوونەوەرانێکی ئاشتیخواز و خۆڕاگرن. ڕادەوەستم و چەندین کاتژمێر لێیان ورد دەبمەوە و تەماشایان دەکەم. ئەوان شەرم لە پێگە و بارودۆخی خۆیان ناکەن. لە تاریکییدا بە خەبەر نامێننەوە و بە هۆی تاوانەکانیانەوە بە دزییەوە ناگرین.

ئەوان بە پەرستنی خوای گەورە، وەڕسم ناکەن و حەزیان لە بەدەستهێنانی موڵک و شتومەکی زیاتر نییە. ئاژەڵەکان زۆر قانیعن.

ئەوان نە لە بەردەم کەسانی تردا چۆک دادەدەن و نە لە بەردەم پێشینانیاندا کە هەزاران ساڵ پێش ئێستا ژیاون.

هەرگیز چاوەڕێی ڕێز و حورمەت لێگرتن ناکەن و هەرگیزیش نازانن ناکامیی و شکست چییە.

«واڵت ویتمەن»

ڕووی قسەی ئەم کتێبە لە زانایان و هەروەها ئەو کەسانەش نییە کە بەو شێوەیە چاو لە پرس و کێشەکانی بەردەمیان دەکەن کە دەبێ بە تەنها قسەوباس و مشتومڕیان لە سەر بکرێت و هیچی تر. لەم کتێبەی بەر دەستاندا فەلسەفەیەکی قووڵ یان توێژینەوەیەکی تۆکمە بەدیی ناکەن. تەنها ویستوومە هەندێک خاڵ بە تەنیشت یەکەوە دابنێم کە هیوادارم لە زانینی گشتییەوە سەرچاوەی گرتبێت. لەم بارەشەوە دەتوانم تەنها ئەوە بە خوێنەر بڵێم کە ئەم خاڵانە لە ڕێگەی بینین و ئەزموونەکانمەوە سەلمێندراون و هەر کاتێک لەم ڕێڕەوەدا جووڵابێتمەوە، بەختەوەرییم ڕووی لە زیادبوون کردووە. لەم بوارەشدا ئەم هیوایەتەم لە دڵدایە ئەو ژن و پیاوە بێشومارانەی کە ڕەنجی بێهوودەیان کێشاوە، ڕەنگە [بە یارمەتیی ئەم کتێبە] ڕێگای ڕاست و هەروەها ڕێگایەکیش بۆ دەربازبوون لە شکستەکانیان بدۆزنەوە.

لە گەڵاڵەکردنی پرسەکانی ناو ئەم کتێبەدا، لەو باوەڕەدا بوومە کە زۆر کەسی ناکام دەتوانن بە ڕەچاوکردنی بابەتە پێشکەشکراوەکانی ناو ئەم کتێبە، ڕوخساری جوان و شیرینی «بەختەوەریی»ببینن و بە کورتیی، تامی بکەن.

«ڕاسل»

## لە جیاتیی پێشەکیی

یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی مرۆڤ کە خۆی بە بوونەوەری باڵا دەزانێت، توانای تێگەییشتنە، کە ئەم تێگەییشتنەش بە هۆی زانیارییەکان و بە واتایەکی دیکە فێرکاریی و کۆکردنەوەی زانیارییەوە پەرە دەستێنێت.

مرۆڤ بۆ درێژەدان بە ژیان، پێویستی بە چەند پێداویستییەک هەیە کە ئەگەر لە ئاستێکی دیاریکراودا بە دەستیان بێنێت، ژیانێکی ئاژەڵانە و، لە ئاستێکی دیاریکراوی دیکەشدا ژیانێکی ڕووەکانە(ڕوەکئاسا)ی بە سەر بردووە. شتێک کە ئەم ژیانە ئاژەڵیی و ڕووەکییە دەگۆڕێت بە ژیانی ئینسانیی، دەرک پێکردنی ئامانجەکان و هەوڵدانە بۆ گەییشتن پێیان.

مروڤ لە ئاستێکدا تەنها مروڤە و هیچی تر و، دابەش دەکرێت بە سەر دوو جۆری بەختەوەر و بەدبەخت. ئەگەر تێگەییشتن و هەوڵدانێکی گونجاوی مرۆیی لە ئارادا بێت، بەدیهاتنی ئەوەی یەکەم (واتە بەختەوەریی) شتێکی مەحاڵ نییە و، ئەگەریش هەوڵ و تێکۆشانێکی لەباری مرۆیی لە ئارادا نەبێت، ناتوانین ئومێدێکی ئەوتۆمان بۆ قوتاربوون لە بەدبەختیی هەبێت.

جیا لە ژیانی ئاژەڵیی، مروڤ بۆ گەییشتن بە پلە باڵاکان پێویستی بە مەعریفە و دەرک پێکردنی ئەو بارودۆخە هەیە کە تیایدا دەژیت. لە بیرمان نەچێت دەرک پێکردنی پرسەکان شتێکە و بەرەوڕووبوونەوەشیان شتێکی دیکەیە. بە واتایەکی تر، لێکدانەوەی پرسەکان بە مەبەستی چارەسەرکردنیان، لای تاکەکان و تەنانەت لە فەرهەنگە جۆراوجۆرەکاندا تا ڕادەیەک جیاوازە. بۆ نموونە ڕەنگە کەسێک لەوەی کە کێشەکان چارەسەر بکات و بە پلەیەکی ئاسوودەیی و ئارامش بگات، هەست بە بەختەوەریی بکات، بەڵام کەسێکی تر هەر لەم ئاستەدا و لەو پلەیەدا هەست بە بەدبەختیی بکات و خاڵە ئەرێنییەکانی ئەو تەمەنەی کە تێی پەڕاندووە نادیدە بگرێت.

مرۆڤ بۆ بەسەربردنی ژیان دەبێ دەرک بە هەندێ هەلومەرج بکات و ئەگەر لەگەڵ داخوازییەکانیدا نایەنەوە، هەوڵ بدات پێکەوە بیانگونجێنێت. بێرتراند ڕاسل فەیلەسووفی ناوداری بەریتانیی لە کتێبی "داگیرکردنی بەختەوەریی"دا لە درێژەی باسێکی تەواو زانستیی و تویژیاریدا ڕێگەی ناسینی هەلومەرجەکان و دەرک پێکردنیانی خستۆتە ڕوو و، ئەوە بە خوێنەر دەڵێت کە بەختەوەریی و بەدبەختیی چین و چۆن دەبێ بیانناسین.

ڕاسل لە بەشە جۆراوجۆرەکانی ئەم کتێبەدا پێمان دەڵێت کە بۆچی هەست بە بەدبەختیی دەکەین و چۆن دەتوانین بە ناسینی هۆکارەکانی، ڕێگای خۆمان بەرەو ئاراستەی بەختەوەریی بگۆڕین.

لە کتێبی "داگیرکردنی بەختەوەریی"دا هەستکردن بە بەدبەختیی، لە ڕووی مێژووییەوە واتە لە ناکامیی[1] کەسەکیی و کۆمەڵایەتییەکانی ناو فەرهەنگە جۆراوجۆرەکانەوە دەخاتە بەر شرۆڤە و لێکۆڵینەوە و، بەدبەختییە دەسکردەکان لە ڕاستەقینەکان جیا دەکاتەوە و لەو باوەڕەدایە کە ڕووتەکبوونەوەی هەستکردن بە بەدبەختیی، گەورەترین هەنگاوە بۆ داگیرکردنی بەختەوەریی.

نووسەر بێجگە لە لێکۆڵینەوەیەکی بەرفراوانی زانستییانە لە بواری زاڵبوون بە سەر بەدبەختیی و دەستەمۆکردنی بەختەوەرییدا، کەڵکی لە ئەزموونە ناوازەکانی ژیانی خۆشی وەرگرتووە.

سەبارەت بە کتێبی "داگیرکردنی بەختەوەریی"، دەتوانین بە ڕاشکاوانە بڵێین سەرەڕای ئەوەی کە نووسەرەکەی کەسێکی فەیلەسووفە، بەڵام گەلێک پلان و ڕێوشوێنی سادە و ئاسانی خستۆتە بەر دەست بۆ بەرەوڕووبوونەوەی بەدبەختیی و، گەییشتن بە بەختەوەریی، کە بە ڕەچاوکردنیان بە کەمترین هەوڵ و ماندووبوون ئەو کارە لە تواناداد دەبێت.

بە گوێرەی وتەکانی نووسەر، وەک چۆن بەدبەختیی هەستێکی کەسەکییە، بەختەوەرییش بە هەمان شێوە هەستێکی کەسەکییە، بەڵام چوونکە لە هەر دووکیاندا بناغە و هەوێنی ئەم هەستانە هۆکارگەلی دەرەکیین، ناتوانرێت بە خۆسەرقاڵکردن بە خودی تاکەکانەوە کۆتایی بە

---

[1] - لە دەقی سەرەکیی کتێبەکەدا و هەروەها لە وەرگێڕانە کوردییەکەشدا وشەی «ناکامیی» هەندێ جار بە واتای «بەدبەختیی» هاتووە. و. ک.

پرسەکە بهێنرێت. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم بەشە، ڕەنگە هێنانەوەی نموونەیەک بتوانێت باسەکەمان بۆ ڕوونتر بکاتەوە.

لە کۆمەڵگایەکدا کە بەهاکان بە دەوری «مادە»دا دەسووڕێنەوە، تاکێکی دەسکورت و هەژار ڕێزی لێ ناگیردرێت و بۆیە هەست بە بەدبەختیی دەکات. لە کاتێکدا هەر هەمان ئەو کەسە ڕەنگە لە ڕووی زانست و زانیارییەوە لە ئاستێکدا بێت کە خەڵکانی تر لە ئاستیدا خۆیان بە بەدبەخت بزانن. بەڵام بارودۆخی ئەو کۆمەڵگایەی ئەوی تێدا دەژیت، هەلی ئەوەی بۆ نارەخسێنێت کە بۆ زاڵبوون بە سەر هەستی بەدبەختییدا کەڵک لە هەبوونەکانی وەربگرێت، یان لە کۆمەڵگایەکدا کە زانست و مەعریفە و ڕوانگەی زانستیی و فەرهەنگیی، بەهای ڕاستەقینەی خۆی هەیە، تاکی کەمبەهرە و بیرکۆڵ لە ڕووی فێربوونی زانستەوە... هەست بە بەدبەختیی دەکات، لە کاتێکدا هەر ئەو کەسە توانیوێتی [بۆ نموونە] لە بواری ئابووریدا سەرکەوتوو بێت.

ڕاسل بە کەڵکوەرگرتن لە هەبوونەکان، بەرنامەیەک لە دژی نەبوونەکان گەڵاڵە دەکات کە ئەگەر بخرێتە بواری جێبەجێ کردنەوە، دەتوانێت هەستی بەدبەختیی سەرکوت بکات. نووسەر دەزانێت کە بە سەرکوتکردنی هەستی بەدبەختیی، گۆڕەپانەکەی بۆ ئامادەبوونی بەختەوەریی خۆش کردووە.

لە کۆتاییدا پێویستە ئاماژە بەم خاڵە بدەم ئەم کتێبە لە بەر ئەوەی کە بەرهەمێکی زۆر شاز و ناوازەیە، نووسینی شتێک بە ناوی پێشەکیی، هیچ بە بایەخی کتێبەکە زیاد ناکات و تەنانەت ڕەنگە لە نرخیشی کەم بکاتەوە، هەر بۆیە درێژە بەم باسە نادەم و پێم وایە هەر ئەوەندەی کە بە کورتیی ئاماژەیەکمان بە ناوەڕۆکی کتێبەکە کردبێت بەس بێت.

**لە بارەی نووسەرەوە:**

ئەگەرچی بێرتراند ڕاسل[٢] پێویستی بە ناساندن نییە — لانیکەم لە لایەن منێکەوە کە لە چاو پانتایی بەرفراوانی زانستی ئەودا زۆر بچووکم — بەڵام بۆ ئەو خوێنەرانەی کە لە ڕێگەی ئەم کتێبەوە دەیناسن، بیۆگرافییەکی کورتی دەخەینە بەر چاو.

ڕاسل ساڵی ١٨٧٢ی زایینیی لە بەریتانیا لە دایک بوو.

باوکی ڕاسل پیاوێکی ئازادیخواز و لایەنگری ئازادیی بوو. دایکیشی ژنێکی شۆڕشگێڕ بوو کە لە دژی نایەکسانییەکانی مافەکانی مرۆڤ دەوەستایەوە و خەباتی دەکرد.

ڕاسل هەر لە سەردەمی منداڵییەوە حەزی لە بیرکاریی کرد. بەرهەمی ئەو حەزەشی نامیلکەیەک بوو بە ناوی توێژینەوەیەک سەبارەت بە **بنەماکانی ئەندازیاریی** کە ساڵی ١٨٩٥ نووسیویەتی و ساڵی ١٨٩٧ بڵاوی کردەوە.

ڕاسل پاش تەواوکردنی خوێندن لە بواری بیرکارییدا حەزی لە فەلسەفە کرد.

ڕاسل لە تەمەنی ٢٢ ساڵیدا لەگەڵ ژنێکی ئەمریکایی بە ناوی "ئالیس سمیت"دا هاوسەرگیریی کرد و چوو بۆ ئەمریکا و لەوێ درێژەی بە لێکۆڵینەوەکانی دا.

لە گەرمەی جەنگی یەکەمی جیهانیدا (١٩١٤ - ١٩١٨) هێندە خۆی بە دژایەتیکردنی جەنگەوە سەرقاڵ کردبوو کە تووشی دەردەسەرییەکی زۆریشی کرد. هەر لەو ماوەیەدا بوو کە بە تاوانی نووسینی وتارێک بۆ کۆتاییهێنانی جەنگ، حوکمی شەش مانگ زیندانی بە سەردا سەپێنرا.

2 - B. Russel - (1872 - 1970)

ڕاسل ساڵی **١٩٢١** لە هاوسەرە ئەمریکاییەکەی جیا بووەوە و لەگەڵ "دۆرابلێگ"دا هاوسەرگیریی کرد کە ئەم هاوسەرگیرییەشی ساڵی **١٩٣٦** کۆتایی هات و لێک جیا بوونەوە. پاشان لەگەڵ "پاترشیا هێلن"دا هاوسەرگیریی کرد.

ڕاسل ساڵی ١٨٥٠ خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبیی بە دەست هێنا.

خۆشبەختانە زۆربەی بەرهەمەکانی ڕاسل وەرگێڕدراونەتەوە سەر زمانی فارسیی، بەڵام باسکردنیشیان دەبێتە هۆی درێژەکێشانی وتەکانمان.

لێرەدا ئاماژە بە ناوی چەند کتێبێکی ڕاسڵ دەکەین و باسەکەمان کۆتایی پێ دێنین:

**ئەو جیهانەی کە دەیناسین، مێژووی فەلسەفەی ڕۆژئاوا، بۆچی مەسیحیی نیم؟، داگیرکردنی بەختەوەریی، هاوسەرگیریی و ژیانی هاوبەش، دەسەڵات(هێز)، تەسەوف و لۆژیک، پێشەکییەک لەسەر فەلسەفەی بیرکاریی.**

فەرەیدوون حاجەتی

١

## هۆکارەکانی بەدبەختیی مرۆڤ چین؟

ئاژەڵەکان تا کاتێک کە هەست بە ئاسوودەیی دەکەن و بە قەدەر پێویست خواردنیان دەس دەکەوێت، بەختەوەرن. وا تەسەور دەکرێت کە دەشێ مرۆڤیش ئاوها بێت؛ بەڵام لەم دنیایەی ئەمڕۆدا هەمیشە وا نییە. ئەگەر خۆتان بە کەسێکی بەختەوەر نازانن، ڕەنگە ئامادەیی ئەوەتان تێدا هەبێت کە دان بەوەدا بنێن تەنها ئێوە وا نین و ئەگەریش بەختەوەرن، ئەم پرسیارە لە خۆتان بکەن ئاخۆ چەند کەس لە هاوڕێکانتان بەو شێوەیەن؟ کاتێک بیر لە هاوڕێکانتان دەکەنەوە، خۆتان فێری هونەری **ڕوخسار خوێندنەوە** بکەن و ئامادەی ناسینی حاڵاتی [دەموچاوی] کەسانێک بن کە لە ڕۆژێکی ئاساییدا تووشیان دەبن. بلەیک[٣] دەڵێت:

هەموو ڕوخسارێک بە بەر چاومدا هێمایەکە
هێمایەک لە دڵتەنگیی، هێمایەک لە خەم و خەفەت.

بلەیک دەڵێت: هەر چەند بەدبەختیی چەندین جۆری هەیە بەڵام وەک دەبینن، ڕوو لە هەر شوێنێک دەکەیت چاوت بە خەم و خەفەت دەکەوێت. با وای دابنێین لە شاری "نیۆیۆرک"دا دەژیت — نموونەیەکی تەواو و بەرچاوی شارە گەورەکانی ئەمڕۆ. لە کاتێکی قەرەباڵغی ڕۆژدا لە شەقامێکی قەرەباڵغدا ڕاوەستە، یان لە ڕۆژێکی کۆتایی حەفتە، لە گوزەرێکی

---

٣ - William Blake شاعیر و شێوەکاری گەورەی نیوەی دووهەمی سەدەی هەژدە و چارەکی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمی بەریتانیا (١٧٥٥ - ١٨٢٧). یەکێک لە پێشەنگە ناودارەکانی قوتابخانەیەکە کە ڕێگای بۆ سەرهەڵدانی ڕۆمانتیسیزم لە بەریتانیادا خۆش کرد. شێعرەکانیشی کە پێگەیەکی بەرزیان لەناو ئەدەبیاتی بەریتانیادا هەیە، زۆربەیان ئایینیی و عیرفانیین.

قەرەباڵغدا بوەسە، یان شەوێک بڕۆ بۆ کۆڕێکی سەماکردن و خۆت بە تەواوەتیی لە بیر بکە و لێگەڕێ با ڕەفتار و هەڵسوکەوتی کەسانی دەوروبەرتان یەک لە دوای یەک مێشکت داگیر بکات. لەو کاتەدا دەبینیت کە هەر کەسەو ڕەنج و ئازاری تایبەتیی خۆی هەیە. لە کاتی دەوامەکاندا ئێوە دڵەڕاوکێ، کاری لە ڕادەبەدەر، ئازاری گەدە (هەرسی گەدە)، کەمتەرخەمیی بەرانبەر بە هەموو شتێک و هەموو کەسێک دەبینن؛ جگە لە کار و خۆ ماندووبووکردن گرینگیی بە هیچ شتیکی دیکە نادەین؛ حەزمان لە پیاسە و سەیران نییە و گرینگیی بە حاڵ و وەزعی هاوڕەگەزەکانیشمان نادەین. لە پشووکانی کۆتایی حەفتە لە شەقامێکی سەرەکییدا ژنان و پیاوانێک دەبینن کە هەموویان پشوویەکی ئارامبەخش تێ دەپەڕێنن و هەندێکیشیان کە پێدەچێت دەوڵەمەند بن، بە دوای کەیف و خۆشیی و ڕابواردنەوەن. بەدواداچوونی کەیف و خۆشیی و چێژ بینین، ڕەوتێکی یەکدەستی هەیە، واتە لە خێرایی هێواشترین ئۆتۆمبیلی دنیا دەچێت. ئۆتۆمبیلەکان هێندە زۆرن کە خەڵکەکە ناتوانن جادەکە بە چاو ببینن. ناتوانن دیمەنەکانی دەوروبەر تەماشا بکەن چوونکە تەماشاکردنی ئەملاولا دەبێتە هۆی پێکادانی ئۆتۆمبیلەکەیان. سەرنشینەکانیش بە هۆی زۆریی و چڕێتیی ژمارەی ئۆتۆمبیلەکانەوە ناتوانن هیوایەتی خێرایی و پێشەوە کەوتنیان هەبێت. ئەگەر نەتوانن بیریان بە ئاراستەیەکی تردا بەرن، تووشی دڵتەنگییەکی کوشندە دەبن و ئەو خەم و خەفەتەش بە ئاشکرا بە دەموچاویانەوە بەدیی دەکرێت، وەک چۆن ئەم پرسە بۆ هەموو ئەو کەسانە ڕوو دەدات کە خۆیان ئۆتۆمبیل لێ ناخوڕن. چەند ڕەش پێستێک بە کەیف و خۆشییەوە لە جادەوە تێ دەپەڕن، بەڵام جۆری ڕەفتار و هەڵسوکەوتیان دەبێتە هۆی تووڕەبوون و هەڵچوونی ڕێبوارەکانی ئەم جادەیە و سەرەنجام بە هۆی پێکدادانەوە تووشیان بە تووشی پۆلیس دەبێت و بەو ئەنجامە دەگەین کە چێژ و خۆشیی لە ڕۆژانی پشوودا نایاساییە.

یان سەرنج بدەنە کەسانێکی ناو میوانییەکی گەورە و شکۆمەند. هەموویان بڕیاریان داوە شاد و کەیفخۆش بن، وەکوو نەخۆشێک کە ئەوپەڕی هەوڵ و توانای خۆی دەخاتە گەڕ کە لە نووسینگەی پزیشکی دانسازدا خۆی ڕابگرێت. هەندێک پێیان وایە خواردنەوەی شەراب و دەسبازیی و دەس لەملانکردن، دەروازەی چێژ وەرگرتنە. ئەم جۆرە کەسانە زوو مەست دەبن و هەوڵ دەدەن ڕق و بێزاریی هاوڕێکانیان نادیدە بگرن. پاش خواردنەوە دەگرین و لە بەر ئەوەی

کە نەیانتوانیوە خزمەتی دایکیان بکەن خەم و خەفەت دایان دەگرێت. ئەوان هەست بە تاوانباریی دەکەن و لە کاتی هۆشیارییدا ناتوانن دەری ببڕن، بەڵام ئەلکۆل ڕێیان بۆ خۆش دەکات و لەو بەربەستە ڕزگاریان دەکات.

هۆکارەکانی بەدبەختیی لە هەندێک کەسدا پێوەندیی بە سیستمی کۆمەڵایەتییەوە هەیە و لە هەندێک کەسیشدا پێوەندیی بە حاڵەتە دەروونییەکانیانەوە هەیە و، ئەوەشمان لە بیر نەچێت تەنانەت ئەم حاڵەتەی دواییش بێگومان تا ڕادەیەکی زۆر لە سیستمی کۆمەڵایەتییەوە سەرچاوە دەگرێت. من پێشتر سەبارەت بە پێویستیی گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان[٤] بۆ زیاترکردنی ڕێژەی شادیی، هەندێک شتم نووسیوە و لەم کتێبەدا نامەوێ لە بارەی نەمانی جەنگ، چەوساندنەوەی ئابووریی، دڵڕەقیی و هەروەها ترس لە سیستمی پەروەردە و فێرکارییدا بدوێم. دۆزینەوەی سیستمێک بۆ خۆپاراستن لە جەنگ، یەکێک لە پرسە هەرە پێویست و گرینگەکانی شارستانییەتی مرۆڤە، بەڵام تا کاتێک تاکەکان هێندە دەردمەند و بە ئازارن و لەناوبردنی یەکتریی بە لایانەوە زۆر سووک و ئاسانە، کاری ئاوها لە تواناد ا نابێت. ڕێگرتن لە درێژەکێشانی هەژاریی، کارێکی زۆر پێویستە و کاتێکیش دەتوانرێت بنبڕ بکرێت کە سوودی بەرهەمە پیشەسازییەکان، بەر کەسانێک بکەوێت کە زیاتر لە هەموو کەسێکی تر پێویستیان پێیەتی.

بەڵام ئەگەر هەموو تاکەکانی کۆمەڵگا دەوڵەمەند بن چ سوودێکی هەیە، کاتێک دەوڵەمەندەکان خۆیان هەموویان دۆش داماون؟ پەروەردە و فێرکاریی تێکەڵ بە ترس و تووڕەیی شتێکی نەگونجاوە، بەڵام کەسانێک کە گیرۆدەی ئەم هەست و حاڵەتانەن، چاوەڕێی شتێکی لەوە زیاتریان لێ ناکرێت. ئەم تێبینییانە سەرنجمان بەرەو پرسی "**تاک**" پەلکێش دەکەن: ژنان یان پیاوان لەم ڕۆژگارە بێ فریاڕەسییەدا چ شێوازێک دەگرنە بەر بۆ ئەوەی لە کۆمەڵگادا بەختەوەر بن؟ لێرەدا سەبارەت بەم پرسە سەرنجی خۆم دەخەمە سەر ئەو تاکانەی کە گیرۆدەی جۆرە بەدبەختییەکی دیاریکراو نین کە هەڵقوڵاوی هۆکارە دەرەکییەکان بێت. مەبەستم لەو تاکانەیە کە بە قەدەر پێویست داهات و خانوو و تەندروستییان هەیە و دەتوانن درێژە بە

1 - Principles Of Social Reconstrution

کارەکانی ڕۆژانەیان بدەن — مەبەستیشم لەو تاکانە نییە کە تووشی کارەساتگەلێکی گەورەی وەکوو مەرگی هەموو منداڵەکانیان و هەڵوەشانەوەی شیرازەی خێزان، یان ڕیسوایی لە ناو کۆمەڵگادا بوونەتەوە. قسە لەم بوارەدا زۆرە بەڵام بابەتی باسەکەی ئێمە نییە. مەبەستم پێشنیارکردنی ڕێگایەکە بۆ چارەسەرکردنی بەدبەختییە ئاساییەکانی ژیانی ڕۆژانەی زۆربەی تاکەکانی ئەو وڵاتە شارستانییانەی کە بە دەستیانەوە دەناڵێنن و بەرگەیان ناگرن و هەر چەندە هیچ هۆکارێکی بەرچاو و دیاریکراویان نییە، بەڵام بەردەوام بەرەوڕوویان دەبنەوە. من پێم وایە زۆربەی ئەم بەدبەختییانە لە جۆری ڕوانینمانەوە بۆ ڕووداوەکانی جیهان و ئاکارگەلی نادروست و خوو و عادەتە بێهوودەکانی ژیانمانەوە سەرچاوە دەگرن، کە لە ئاکامدا دەبێتە هۆی لەناوچوونی شادیی و شەوق و تاسە سرووشتییەکانمان و حەز نەکردن بەو شتانەی کە بەختەوەریی مرۆڤ یان ئاژەڵ بەندە پێیانەوە. هەموو ئەم شتانە لە بەر دەست و لە ژێر کۆنترۆڵی مرۆڤدان و منیش پێشنیار دەکەم بە مەبەستی بەدەستهێنانی ڕێژەیەکی بەختەوەریی، هەندێک گۆڕانکاریی [ لە ژیانماندا] بکەین.

ڕەنگە باشترین سەرەتا بۆ فەلسەفەیەک کە دەمەوێ داکۆکیی لێ بکەم، باسکردنی بەشێکی کورتی ژیانی خۆم بێت. من وەک کەسێکی بەختەوەر لە دایک نەبووم. بە منداڵیی، زیاترین بابەتێک کە هزر و مێشکمی بە تەواوەتیی داگیر کردبوو، بێزاریی لە دنیا و هەستکردن بە تاوان بوو. لە تەمەنی ٥ ساڵاندا بیرم لەوە دەکردەوە کە ئەگەر بڕیار بێت حەفتا ساڵ بژیم، ئێستا تەنها یەک لە چواردەی ئەو تەمەنەم بە سەر بردووە و گرفتارییەکی زۆر دوور و درێژم لە بەر دەمدایە کە قابیلی تەحەمولکردنیش نییە. لە سەردەمی گەنجێتییدا زۆر لە ژیان بێزار بووم و بەردەوام بیرم لە خۆکوژیی دەکردەوە، بەڵام بە هۆی حەزی لە ڕادەبەدەرم بۆ زانست و بیرکاریی، لێی پەشیمان دەبوومەوە. بەڵام ئێستا بە پێچەوانەی ئەو سەردەمانەوە، چێژی زۆر لە ژیان دەبینم و دەشتوانم بڵێم بە تێپەڕبوونی هەر ساڵێک لە ژیانم زیاتر چێژ وەردەگرم. ئەم پرسەش تا ڕادەیەک بە هۆی دۆزینەوە و ناسینی ئەو شتانەوەیە کە حەزم لێیان بوو و وردە وردەش زۆربەیانم بە دەست هێنا و تا ڕادەیەکیش بە هۆی پشتگوێخستنی ئەو حەزانەم بوو کە نەمدەتوانی بە دەستیان بێنم؛ بۆ نموونە خوێندن لەو لقە زانستییانەی کە دڵنیاشم نەمدەتوانی تیایاندا سەرکەوتوو بم و مەعریفەیان لێ هەڵکڕێنم. بەڵام لە سەروو

ئەوانەشەوە ئەم بەختەوەرییەی خۆم قەرزاری کەمکردنەوەی دالْغە فکرییەکانم دەزانم. وەکوو هەموو ئەو کەسانەی کە پەروەردەیەکی وشکی ئایینییان[٥] هەبوو، بەردەوام بیرم لە تاوانەکان و هەڵەکان و کەموکوڕییەکانم دەکردەوە و هەر بۆیە لەو ڕووەوە خۆم بە یەکێک لە بەدبەختترین کەسەکان دەزانی و بە ڕاستیی هەر ئاواش بوو. کەم کەم فێری ئەوە بووم لاوازیی و ناتەوانییەکانم پشتگوێ بخەم و هەموو سەرنجی خۆم بخەمە سەر هەندێک پرسی لە دەرەوەی «بوون»ی خۆمدا: هەندێک پرسی وەک بارودۆخی جیهان، لقە جۆراوجۆرەکانی زانست و هەروەها ئەو شتانەی کە حەزیان لێ دەکەم. ئەمە ڕاستە کە حەزە دەرەکییەکان ئاستەنگ و ئەستەمیی تایبەتی خۆیانیان هەبێت؛ بۆ نموونە ڕەنگە دنیا تووشی جەنگ ببێت و خوێندن لە هەندێ بواردا دژوار ببێت، یان هەندێک لە هاوڕێکانمان بمرن. بەڵام خەم و خەفەتگەلی لەو چەشنە، هێندەی ڕق و بێزاریی تاک لە خودی خۆی، کاریگەریی خراپ لە سەر جەوهەری ژیانی دانانێت و نابوودی ناکات و هەموو حەزێکی دەرەکیی، هەوڵ و تەقەلای تاکەکانی لێ دەکەوێتەوە و تا کاتێکیش ئەو حەزە بەردەوام بێت، ڕێگریی لە خەم و خەفەت دەکات و بە پێچەوانەشەوە گۆشەگیریی و دوورەپەرێزیی تاکەکان هیچ هەوڵ و تەقەلایەکی لێ ناکەوێتەوە کە پێشکەوتنیان مسۆگەر بکات. حەزە دەروونییەکان ڕەنگە ببنە هۆی نووسینەوەی یاداشتە ڕۆژانەکان یان چارەسەرکردنی خۆ لە ڕووی دەروونییەوە و ڕەنگە کەسانی خاوەن ئەم جۆرە حەزانە، ڕوو لە پیرۆزاندن (=تەقەدوس) بکەن بەڵام کەسی ڕاهیب تا کاتێک کاروبارە ڕۆژانەکانی پەرستگە، وای لێ نەکەن خۆی لە بیر بەرێتەوە، کەسێکی بەختەوەر نییە. ئەو بەختەوەرییەی کە ئەو بە ئایینەوە دەیلکێنێت، دەیتوانی بە گسکدانی شەقامەکانیش بە دەستی بێنێت؛ ئەگەر ناچاری بکەن کاری لەو جۆرە بکات. سیستمی دەرەکیی، تاقە ڕێگای بەختەوەربوونی ئەو داماوانەیە کە ئەویش ڕووچوونە ناو خۆیە و، هیچ ڕێگایەکی تریشیان بۆ باشترکردنی حاڵ و وەزعیان لە بەر دەمدا نییە.

ڕووچوونە ناو خۆ، چەند جۆی هەیە کە تاوانباریی، خۆپەرستیی و خۆبەزلزانین، سێ جۆری بەرچاو و باوی ئەو حاڵەتەن. کاتێک باس لە «تاوانبار» دەکەین، مەبەستمان لە

---

٥ - Puritan ئەندامانی لقێکی پرۆتستانەکانی بەریتانیا کە لە سەردەمی شاژن ئەلیزابێت و دوای ئەوەش لە دژی دابونەریتە ئایینییەکان هەستانەوە. ئەوان لایەنگری سادە و ساکاریی لە عیبادەت و باوەڕدا بوون.

کەسێک نییە کە تووشی تاوان دەبێت. مەبەست لە »تاوانبار« مرۆڤێکە کە ویژدانێکی نائارام و نائاسوودەی هەیە. ئەم کەسە بەردەوام لۆمەی خۆی دەکات و ئەگەر کەسێکی ئایینیی بێت، داوا لە خوا دەکات لە کردەوە هەڵە و نەگونجاوەکانی خۆش ببێت.

ئەو لە ناوەوەی خۆیدا جۆرە وێنایەک لە خۆی چێ دەکات کە حەز دەکات هەیبێت؛ بەڵام وێناکە لەگەڵ ئەو زانیارییەی کە لە سەر خۆی هەیەتی نایەتەوە و دژبەری یەکدین. ئەگەر ئەو لە خودئاگا(هەست)یدا ئەو شتانەی کە لە دایکیەوە فێر بووە فەرامۆش بکردایە، ڕەنگە هەستکردن بە تاوانباریی، لە قوڵایی ناخودئاگا(نەست)یدا بزر بوایە و تەنها لە کاتێکدا دەر بکەوێت کە یان مەست بێت یان لە خەودا بێت. بەڵام هەر ئەوەش خۆی بەسە بۆ ئەوەی کە ژیان لە مرۆڤ تاڵ بکات. کەسێکی ئاوها، باوەڕی بە هەموو ئەو ناکامیی و بێبەشییانە هەیە کە هەر بە منداڵیی فێریان بووە. بە باوەڕی ئەو، سوێند خواردن، مەشرووبخواردنەوە و تەنانەت زیرەکیی و زرنگیی لە کار و کاسپیی ڕۆژانەدا و لە سەروو هەمووشیانەوە پرسە سێکسییەکان کارێکی ناڕەوا و نائاسایین. دیارە ئەو خۆی لە کەڵکوەرگرتن لەو چێژانە بێبەش ناکات، بەڵام هەستکردن بەوەی کە ئەو کارانە دەبنە هۆی دابەزینی ئاکار، هەموو ئەو چێژانەشی لێ دەکاتە ژاری مار. تاقە خۆشیی و چێژێک کە پڕبەدڵ ئارەزووی دەکات ئەوەیە کە بکەوێتە بەر سۆز و میهرەبانییەکی دایکانەوە چوونکە بیرەوەرییەکانی سەردەمی منداڵیی لە مێشکدا هەڵگرتووە و کاتێکیش چێژێکی ئاوهای بۆ دەست نادات، هەموو شتێک پشتگوێ دەخات و بڕیار دەدات خۆی نوقمی تاوان بکات. لە کاتی ئەڤیندارییشدا چاوەڕێی لاواندنەوەیەکی دایکانە دەکات؛ بەڵام ناتوانێت قبووڵیشی بکات [واتە لە کەسی بەرامبەری وەر بگرێت] و لە بەر ئەوەش کە خەیاڵی دایکی هەمیشە و بەردەوام مێشک و هزری تەنیوەتەوە، تۆزقاڵێکیش ڕێز لەو ژنە ناگرێت کە سێکسی لەگەڵدا دەکات. ئەم کەسە لە کاتی نائومێدیی و بێ هیواییدا دەبێتە کەسێکی زاڵم و چەوسێنەر و پاشان لە زوڵم و چەوساندنەوەکەشی پەشیمان دەبێتەوە و بەم شێوەیە سووڕی بێهوودەی تاوان و پەشیمانیی ڕاستەقینە دووبارە دەکاتەوە و ئەمەش بارودۆخی زۆربەی کەسە بەدڕەوشتەکانە. شتێک کە دەبێتە هۆی سەرگەردانیی و سەرلێشێواویی ئەم جۆرە کەسانە، حەز و خۆشەویستییانە بەرامبەر بە خۆشەویستێکی دەست نەداو (دایک یان کەسێک کە جێی دایک بگرێتەوە) و هەروەها

یاسا و ڕێساگەلێکی بێهوودە و هەڕەمەی ئاکاریی سەردەمی مێرمنداڵییە. ڕزگاربوون لە ئازاری باوەڕ و سۆزە دێرینەکانی پێوەندیدار بە سەردەمە سەرەتاییەکانی ژیانەوە، یەکەمین هەنگاوە بۆ بەختەوەربوونی ئەوانەی لە سۆزی دایک بێبەش بوونە.

بە واتایەک دەتوانین خودشەیدایی تا ڕادەیەک بە خاڵی بەرانبەری خووی هەستکردن بە تاوانباریی بزانین. مەبەستمان لە خودشەیدایی، خووی پیاهەڵدان بە خود و حەزکردن لەوەیە کە خەڵک ئافەرین و پەسن و پیاهەڵدانی بکەن. ئەڵبەتە ئەم هەستە تا ڕادەیەک سروشتییە و، شیاوی دڵ بۆ سووتاندن و بەزەیی پێداهاتنەوە نییە، بەڵام ئەگەر زێدەڕۆیی تێدا بکرێت، شتێکی نەگونجاو و ناخۆشە. لە ناو ژمارەیەک لە ژنانی سەر بە چینی دەوڵەمەندا، هەستی ئەڤین و خۆشەویستیی بە تەواوەتیی لە ناو دەچێت بەڵام لە جیاتیدا حەز دەکەن هاوڕێیەتیی سەرجەم پیاوانی دیکە بۆ خۆیان دەستەبەر بکەن. کاتێک ژنێکی سەر بەم چینە دڵنیا بێت لەوەی کە کەسێکی خۆش دەوێت، چیدی ئەو پیاوە کەمترین بەهایەکی بە لایەوە نامێنێت. ئەم حاڵەتە بە ڕێژەیەکی کەمتر لە ناو پیاوانی سەر بە چینی دەوڵەمەندیشدا بوونی هەیە. باشترین نموونەش پاڵەوانی چیرۆکی بەناوبانگی "**پێوەندییە مەترسیدارەکان**"ە[٦].

کاتێک لووتبەرزیی و خۆبەزلزانین لە کەسێکدا دەگاتە لووتکە، چیدی حەز و تاسەی ڕاستەقینەی بەرانبەر بە هیچ کەسێک نامێنێت. کەواتە ئەڤین و خۆشەویستیی هەرگیز نابنە هۆی خۆشحاڵیی و ڕەزامەندیی ئەو. کاتێک خۆشەویستیی چارەنووسێکی ئاوهای هەبێت، دیارە حەز و ئارەزووەکانی تریش دۆخێکی لەوە باشتریان نابێت.

بۆ نموونە کەسێک کە تووشی خودشەیدایی بووە، بە بینینی ڕێزێک کە لە شێوەکارە گەورەکانی دەگرن، ڕەنگە حەز لە هونەری شێوەکاریی بکات بەڵام چوونکە شێوەکاریی لای ئەو تەنها حەزێکە بۆ شانازیی پێوەکردن، بۆیە هەرگیز ئاسوودەی ناکات و ئەو بابەتانەی پێوەندییان بە کەسایەتیی ئەوەوە نییە، سەرنجی ڕاناکێشن و بە پێچەوانەی چاوەڕوانییەکانیشی، لە جیاتی ئافەرین و پەسن و پیاهەڵدان، بەرەوڕووی گاڵتە و توانج دەبێتەوە. ئەم حاڵەتە سەبارەت بەو چیرۆکنووسانەش ڕاستیی لە خۆ دەگرێت کە هەمیشە خۆیان پاڵەوانی چیرۆکەکانیانن.

---

٦ - Lisisons Dangerouses نووسینی پییێر لاکلۆ (Pierre Laclos) ی فەرانسیی (١٧٤١ - ١٨٠٣).

هەموو سەرکەوتنێک لە کارەکاندا بەندە بەوەوە کە تاکەکان تا چەند بە دڵ و گیان ئەو کارانە ئەنجام دەدەن [بە واتایەکی تر تا حەز لە کارەکاندا زیاتر بێت، سەرکەوتنیش زیاتر دەبێت]. سەربوردەی خەمهێنەری سیاسەتمەدارە سەرکەوتووەکان، ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەکات کە ئەوان هێدی هێدی تووشی خودشەیدایی دەبن، یان خەڵک و کۆمەڵگا پشتگوێ دەخەن یان بایەخ بەو ئامانجانە دەدەن کە بە دوایانەوەن. کەسێک کە تەنها بیر لە خۆی دەکاتەوە، قابیلی پەسن و پیاهەڵدان نییە، کەواتە کەسێک کە تاقە ئامانجی ئەوەیە کە دەبێ هەموو دنیا ستایشی بکات، زۆر ئەستەمە بتوانێت ئامانجەکەی بپێکێت و تەنانەت ئەگەریش بە ئامانجەکەی بگات، دیسانەوە بە تەواوەتیی بەختەوەر نابێت، چوونکە غەریزەی مرۆڤ هەرگیز بە تەواوەتیی لە سەر تەوەری خۆی ناسوورێتەوە [واتە خود تەوەر نییە] و مرۆڤێکی خودشەیدا کە سنوور و چوارچێوەیەکی دەسکردی بۆ خۆی خولقاندووە، ڕێک هاوشێوەی کەسێک کە هەست بە تاوانباریی بە سەریدا زاڵ دەبێت، خۆی دەخاتە قاوغێکی دەسکردەوە. مرۆڤی سەرەتایی سەردەمانی کۆن ڕەنگە شانازیی بەوەوە کردبێت کە ڕاوچییەکی بە توانایە، بەڵام چێژیشی لە چالاکیی و بەدواداچوونی نێچیرەکەی وەرگرتووە. بەڵام ئەگەر لووتبەرزیی و خۆپەرستیی لە ڕادەیەکی ئاسایی تێ بپەڕێنێت، چێژی هەموو جۆرە چالاکییەک لە ناو دەبات و بێتاقەتیی و دڵتەنگیی بە دواوە دەبێت؛ وەها حاڵەتێک چەندین جۆری هەیە و ڕێگەچارەشی، بەهێزکردنی هەستی ڕێز لە خۆگرتنە. بەڵام ئەم ئامانجەش تەنها بە هەوڵ و تێکۆشان لە چالاکییە ڕاستەقینەکاندا قابیلی بەدیهێنانە.

مرۆڤێک کە سەودای زاڵبوون بە سەر خەڵکانی دیکە باڵی بە سەردا کێشاوە، لەو ڕووەوە جیاوازیی لەگەڵ کەسی خودشەیدادا هەیە کە دەسەڵاتی بە لاوە گرینگترە لە خۆشەویستبوون لای خەڵک و، زیاتر حەزی لە تۆقاندنە وەک لە خۆش ویستن. زۆربەی شێتەکان و زۆرێک لە گەورە پیاوەکانی مێژوو، دەکەونە ئەم خانەیەوە.

حەزکردن بە دەسەڵاتداریی، هاوشێوەی خۆپەرستیی، پاڵنەرێکی کاریگەر و بەهێزە کە بە شێوەیەکی پەسەند و شایستە لە بوونی مرۆڤدا هەیە. کاتێک ئەم پاڵنەرە لە ڕادەی دیاریکراوی خۆی تێ پەڕاند، یان بە قەدەر پێویست واقیعبینیی لەگەڵدا نەبێت، نالەبار و قێزەون دەبێت و هەر کاتێک وەها حاڵەتێک بێتە ئاراوە، تاک تووشی بەدبەختی دەکات یان

گرفتاری هەر دوو چەرمەسەرییەکەی دەکات. شێتێک کە پێی وایە تاجی پاشایەتیی لە سەرە، ڕەنگە تا ڕادەیەک بەختەوەر بێت بەڵام بەختەوەرییەکەی لەو جۆرە نییە کە تاکە تەندروستەکان ئارەزووی دەکەن. "ئەسکەندەری مەزن" لە ڕووی ڕۆحییەوە یەکێک لەو شێتانە بووە کە بە کەڵکوەرگرتن لە بەهرەکانی، توانیی خەونە سەرشێتانەکانی خۆی بەدیی بێنێت؛ هەر چەند نەشیتوانی بە دوائامانجەکەی بگات. کاتێک زانیی گەورەترین سەرکردەی جیهانە، بیری لەوە کردەوە ببێتە خوا. ئایا ئەو پیاوێکی بەختەوەر بوو؟ زێدەڕۆیی لە مەشرووب خواردنەوەدا، گەردەلوولی تووڕەیی و هەڵچوون، بایەخنەدان بە ژنان و بانگەشەی خوایەتیی، نیشاندەری ناڕەزامەندیی و نابەختەوەری ئەو بوون. بایەخدانی زیاتر بە یەکێک لە هێزە فکرییەکانی مرۆڤ، بە زیانی هێزەکانی تری دەشکێتەوە و ئەمە کە تاک هەموو دنیا وەک ئامێری دەست و ئیرادەی خۆی تەسەور بکات، ڕەزامەندیی و شادمانیی ڕاستەقینە نییە.

سەوداسەرەکانی دەسەڵات — چ شێت بن یاخود بە ڕواڵەت تەندروست بن — زۆربەی کات گیرۆدەی جۆرە گرێیەکی گەورەی خۆبەکەمزانین.

"ناپلیۆن" لە سەردەمی قوتابخانەی سەرەتاییدا لە هەمبەر هاوپۆلەکانیدا کە سەر بە چینی دەوڵەمەند و ئەریستۆکرات بوون، هەستی بە خۆبەکەمزانین دەکرد، چوونکە ئەو قوتابییەکی هەژار بوو کە بە خۆڕایی دەیخوێند و لەو ڕووەوە زۆر ئازاری دەبینی.

کاتێک مۆڵەتی گەڕانەوەی پەنابەرانی[٧] دا و دەیبینی کە هاپۆلەکانی جارانی کڕنۆشیان لە بەر دەمدا دەکرد، چێژی دەبینی. هەر ئەم ڕەزامەندیی و بەختەوەرییە ئەو ورووژانەی تێدا دروست کرد کە چێژێکی هاوشێوە لە لایەن "تزاری ڕووس"ەوە بە دەست بێنێت و هەر ئەم بیرۆکەیەش سەرەنجام پەلکێشی دوورگەی "هێلن"ی[٨] کرد. لەو ڕووەوە کە بەدەستهێنانی دەسەڵاتی ڕەها و، بوون بە فەرمانڕەوای ڕەها، شتێکە لە ناخی مرۆڤدا هەیە، ژیانی ئەو

---

٧ - Emigres ؛ پەنابەران تاقمێک لە دەوڵەمەندەکان یان لایەنگرانی پاشایەتیی بوون کە دوای بە دەسەڵات گەییشتنی ناپلیۆن بەرەو وڵاتە ئەورووپاییەکان کۆچیان کرد و زۆربەیان پاش ڕووخانی ناپلیۆن گەڕانەوە بۆ فەرەنسا. ژمارەیەکیشیان هەر لە سەردەمی ئیمپراتۆرییەتی ناپلیۆندا و بە ڕێپێدانی ناپلیۆن گەڕانەوە بۆ وڵات.

٨ - Saint Helena ؛ ناوی دوورگەیەکە کە بە بوونی ناپلیۆنەوە ناوبانگی دەرکرد و ناپلیۆن تا دوایین چرکەی ژیانی وەک دوورخراوێک تێیدا دەژیا.

کەسانەی کە تێیدا دەسەڵاتخوازیی باڵی بە سەر هەموو شتێکی تردا کێشاوە، بە توندیی دەکەوێتە بەر مەترسییەوە. چوونکە درەنگ یاخود زوو، ژیانی ئەم جۆرە کەسانە لە هەمبەر ئەو کێشە لە چارەسەرنەهاتووانەی کە حەزی دەسەڵاتخوازیی دەیانخولقێنێت، لە پەلوپۆ دەکەوێت. تێگەییشتن لەوە کە بەدەستهێنانی دەسەڵاتی ڕەها لە تواناداا نییە، تاکەکان شێت دەکات. دەسەڵاتدارە پلەوپایەخوازەکان بە سەرکوتکردنی ئەوانەی ڕاستییەکان (=حەقیقەتەکان) دەخەنە ڕوو، ناتوانن حەقیقەتی بەدینەهاتنی "دەسەڵاتی ڕەها" ئاوەژوو بکەن، بەڵام سەرەڕای هەموو ئەمانەش کێشە سیاسیی و ڕۆحییەکانی دەسەڵاتداران تێکەڵە بە سەرکوت و تۆقاندن.

لە هەر بوارێکدا لە ئەنجامی پرسە هەڵقولاوەکانی کێشە ڕۆحییەکانەوە سەرکوتکردن ئەنجام بدرێت، بەختەوەریی ڕاستەقینە هیچ واتایەکی نابێت. هەر کاتێک دەسەڵات لە چوارچێوەی دیاریکراوی خۆیدا کۆنترۆڵ بکرێت، لەوانەیە بەختەوەریی لێ بکەوێتەوە بەڵام ئەگەر ببێتە تاقە ئامانجی ژیان، کەمترین کاریگەریی ئەوە دەبێت کە لە ناوەوە مرۆڤ بەرەوڕووی کارەسات دەکاتەوە.

هۆکارە ڕۆحییەکانی بەدبەختیی زۆر و فرەچەشنن بەڵام هەموویان لە خاڵێکدا هاوبەشن. بە گشتیی مرۆڤی بەدبەخت کەسێکە لە سەردەمی گەنجێتییدا لە هەندێک لە شتە دڵخوازەکانی بێبەش ماوەتەوە و ئێستاش هەمان ئەو شتانەی کە لێیان بێبەش بووە لە هەموو شتەکانی دیکە بە لایەوە گرینگترە و، بۆیە ژیانێکی تاکڕەهەندیی دەباتە سەر. واتە پێداگرییەکی سەرسەختانە لە سەر بەدەستهێنان و بووژاندنەوەی بێبەشییە لە کیسچووەکان.

بەڵام جۆرێکی تریش هەیە کە ئەمڕۆکە زۆر باو و گشتگیرە: مرۆڤێک کە بە تەواوەتیی هەست بە سەرکوێریی دەکات، بە دوای هیچ ڕەزامەندیی و دڵخۆشییەکدا ناگەڕێت، بەڵکوو تەنها و تەنها خوازیاری فەرامۆشکردن و دوورکەوتنەوە لەو شتانەیە کە بوونەتە هۆی سەرکوێریی ئەو. وە بەم جۆرە دەبێتە »قوربانیی چێژ». بە واتایەکی دیکە دەیەوێت بە چالاکیی و جموجۆڵی کەمتر، ژیان لە خۆی ئاسانتر بکات. بۆ نموونە زێدەڕۆییکردن لە مەشرووب خواردنەوەدا جۆرە خۆکوژییەکی لە سەرخۆیە. چێژێک کە لە سەرخۆشییەوە دەست دەکەوێت، تەنها لایەنی نەرێنیی هەیە و لەبیرکردنی چرکەیەک لە بەدبەختییەکانە.

خودشەیدایان و دەسەڵاتپەرستان لەو باوەڕەدان کە بەختەوەریی قابیلی بەدیی هاتنە و لەوانەیە ئەوان ڕێگای پێگەییشتنیان بە هەڵە لێک دابێتەوە و بۆ گەییشتن بە ئامانجی خۆیان، کەڵک لە شێوازگەلی نادروست وەربگرن.

بەڵام کەسێک کە ڕێگای مەستیی (سەرخۆشیی) هەڵدەبژێرێت کەسێکە هەموو ئومێد و هیوای خۆی لە دەست داوە و پێی وایە فەرامۆشیی تاقە ڕێگای بەختەوەرییە. یەکەم هەنگاو بۆ چارەسەرکردنی ئەم کەسانە، ئەوەیە کە بەهای ڕاستەقینەی بەختەوەرییان پێ بناسێنین. تاکە بەدبەختەکان کەسانێکی مۆتەکە لێدراون کە حەقیقەتی بەدبەختیی وەکوو خەونێک خۆشحاڵیان دەکات و ڕەنگە بتوانین غروورەکەشیان بە ڕێوییەک بشوبهێنین کە کلکی خۆی لە دەست داوە. لە حاڵەتێکی ئاوادا ڕێگەچارەی ڕێوی ئەوەیە کە فێری بکەن چۆن دەتوانێت ببێتە خاوەنی کلکێکی تازە. من پێم وایە ژمارەی ئەو کەسانەی کە بەختەوەر دەبن و پاشان ڕوو لە بەدبەختیی دەکەنەوە، زۆر کەمە. بەڵام حاشا لەوە ناکەم کەسانی ئاوها بونیان هەیە بەڵام چوونکە ژمارەیان ئێجگار کەمە، جێی بایەخپێدان نییە. بۆیە من لەو باوەڕەدام خوێنەری ئەم کتێبە، بەختەوەریی بە لاوە گرینگترە لە بەدبەختیی. لەگەڵ ئەوەشدا نازانم ئایا دەتوانم هیچ یارمەتییەکی بدەم یان نا؟ بەڵام هەر چۆنێک بێت من هەوڵ و تەقەلای خۆم دەدەم و دیارە بێ سوودیش نابێت.

٢

## بەدبەختیی بایرۆنیی؟

لەم سەردەمەی ئێمەشدا وەکوو هەموو سەردەمەکانی مێژوو، کەسانێکی ژیر و بە ئاگا هەن کە بە هۆی ئەزموونەکانیانەوە بەو دەرەنجامە گەییشتوون دنیا هیچ بەقایەکی نییە و هیچ شتێک تا سەر و هەتایی نییە و دنیایەکی لەم جۆرەش ئەوە ناهێنێت دڵی پێ خۆش بکەیت و خۆتی بۆ ماندوو بکەیت. کەسانێک کە بەم جۆرە بیر دەکەنەوە، بە ڕاستیی بەدبەختن بەڵام شانازیی بەو بەدبەختییەشەوە دەکەن، چوونکە پێیان وایە بەدبەختیی، دیاردەیەکی حەتمییە و هەڵقوڵاوی سروشت و جەوهەری دەسەڵاتی متافیزیکە و پێشیان وایە ئەو ڕەفتارەیان زۆر گونجاوە و بە جۆرە واقعبینییەکی ڕۆشنبیرانەشی لە قەڵەم دەدەن. غرووریان لە ئاست بەدبەختییدا کەسانی نائاگا دەخاتە ناو گومانەوە و تەنانەت تا ڕادەی ڕاستییەکی تۆکمە لە مێشکیاندا جێگیری دەکات.

بە باوەڕی ئەوان، کەسانێک کە چێژ لە بەدبەختیی دەبینن، بەدبەخت نین. بە هەڵسەنگاندنێکی هەڵوێستەکانی وەها بیرکردنەوەیەک دەتوانین ئەم دەرەنجامە هەڵکرێنین کە ئەم جۆرە کەسانە ڕێژەیەکی کەمی هەستی خۆبەزلزانین و خۆسەپاندنیان تێدایە کە تەنانەت بەشی دابینکردنی چێژە ئاسایی و باوەکانیش ناکات.

من وەکوو خۆم پێم وا نییە «بەدبەختیی»، تایبەتمەندییەکی باش و قابیلی لێ قووڵبوونەوەی تێدا هەبێت. مرۆڤی ئاقڵ کەسێکە لە چوارچێوەی پێگە و جێگەی خۆیدا «بەختەوەر» بێت و ئەگەر بارودۆخەکەشی بە دڵ نەبێت و لەگەڵ ژیانیدا نەیەتەوە، گرینگیی بە لایەنەکانی دیکەی ژیانی بدات و، ئەمەش هەمان ئەو خاڵەیە کە بە تەمام لەم بەشەدا

بیسەلمێنم. هەوڵ دەدەم خوێنەر قەناعەت پێ بکەم سەرەڕای هەموو هۆکارە دەسنیشانکراوەکان، ئەقڵ لەو باوەڕەدایە کە هیچ بەربەستێک لە بەر دەم بەختەوەرییدا بوونی نییە. کەسانێک کە بەوپەڕی ڕاستگۆییەوە سەرچاوەی خەمەکانیان دەگەڕێننەوە بۆ جۆری ڕوانین و بیرکردنەوەیان سەبارەت بە جیهان، بە بێ ئەوەی کە بە خۆیان بزانن کارێکی بێهوودە و بێمانا ئەنجام دەدەن.

ئەوان لە بەر چەندین هۆ بەدبەختن و ئەم بەدبەختییەش ناچاریان دەکات هەموو فکر و هزریان لە سەر لایەنە نالەبارەکانی ژینگەکەیان چڕ بکەنەوە.

بابەتێک کە لێرەدا دەمەوێ باسی لێوە بکەم پێش من بەڕێز ژۆزێف وۆد کراچ[9] لە کتێبی "**خەسڵەتە نوێیەکان**"[10]دا بۆ ئەمریکاییەکانی ئەم سەردەمەی ڕوون کردۆتەوە. هەر ئەم بابەتە لە لایەن "بایرۆن"یشەوە[11] بۆ باوباپیرامان ڕوون کراوەتەوە و نووسەری **کتێبی کۆمەڵگا**[12] بۆ هەموو سەردەمەکانی مێژوو ڕوونی کردۆتەوە. بەڕێز کراچ دەڵێ:

«بوونی ئێمە هۆکارێکی ونبووە و ئێمەش لە سروشتدا هیچ شوێنێکمان نییە، بەڵام سەرەڕای ئەمانەش نابێ بە هۆی مرۆڤبوونمانەوە نیگەران و خەمبار بین. وەک مرۆڤ بمریت باشترە لەوەی کە وەک ئاژەڵ بژیت».

بایرۆن دەڵێت:

«شادییەکانی جیهان هێندەی خەمەکانی نین.

کاتە خۆش و شادەکانی سەردەمی گەنجێتیی، زۆر زوو جێی خۆیان دەدەن بە خەم و پیریی و توانەوە«.

---

٩ - Joseph Wood Krutch (1970 - 1893) نووسەر و ڕەخنەگری ئەمریکایی.

10 - The Modern Temper

١١- Byron (1824 - 1888) . لۆرد جۆرج گۆردن نۆئێل بایرۆن، شاعیری ڕۆمانتیکی بەریتانیی لە بنەماڵەیەکی دەوڵەمەند لە شاری لەندەندا لە دایک بووە و لە تەمەنی ١٩ساڵییەوە دەستی بە هۆنینەوەی شێعر کرد. بایرۆن یەکەم بەرهەمی خۆی بە ناوی "**چایڵد هارۆڵد**" لە ساڵی ١٨١٢ دا بڵاو کردەوە کە سەرکەوتنێکی زۆری بە دەست هێنا. بە هۆی ئەندێشەگەلی شۆڕشگێڕانەوە لە جیهانی سیاسەت و ئەدەبدا کەوتە بەر ڕق و کینەی هاونیشتمانییەکانی. سەرەنجام لە تەمەنی ٣٦ ساڵیدا گیانی خۆی لەو پێناوەدا لە دەست دا. بایرۆن یەکێک لە گەورەترین شاعیرە ڕۆمانتیکەکانی جیهانە. بەرچاوترین چیرۆکە شێعرەکانی بریتین لە "**دۆن ژوان**"، "**بەندکراوی شیلان**"، "**کاتی پشوو**" و "**چایڵد هارۆڵد**".

١٢ - Ecclesiastes ؛ کتێبی کۆمەڵگا یەکێکە لە کتێبە ئایینییەکانی ئاینی جوو.

نووسەری **کتێبی کۆمەڵگا** دەڵێت:

«هەر لە بەر ئەوەی کە مردووەکانی پێشووم لە زیندووەکانی ئەمڕۆ زیاتر خۆش دەوێت، لە دایک نەبووەکانیشم زیاتر لە هەر دووکیان خۆش دەوێت چوونکە لە هەر دوو گرووپەکە بەختەوەرترن.

کەمترین بەختەوەریی ئەوان بێتاوانبوونیانە چوونکە لە ژێر ئەم ئاسمانە شینەدا نەژیاون تاکوو تووشی تاوانباریی ببن.

ئەمانە بیروڕا ڕەشبینانەکانی سێ بوونەوەری ئاگایە کە پاش شیکردنەوە و لێکدانەوە و بەهرەمەندبوون لە چێژەکانی ژیان، بەم ئەنجامە تاڵ و ناخۆشە گەییشتوون.

بەڕێز کراچ لە کۆڕ و کۆبوونەوە ڕۆشنبیرییەکانی نیۆیۆرکدا ناو و ناوبانگێکی زۆری هەبوو. بایرۆن، نۆکەندی "هێڵسپۆنت"ی[١٣] بە مەلەکردن بڕی و چەندین بەرهەمی گرینگی لە پاش بە جێ ماوە. نووسەری **کتێبی کۆمەڵگا**، تەنانەت چەندین چێژی تریشی تاقیی کردەوە؛ لەوانە شەراب، مۆسیقا و هەموو جۆرە چێژێکی دیکەشی تاقیی کردەوە، چەندین مەلەوانگەی دروست کرد و چەندین نۆکەر و خزمەتکار و خانەشاگردی هەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا کە کەسێکی ئاوەزمەند بوو بەڵام هەموو شتێکی بە بێهوودە و بێسوود دەزانی، تەنانەت خودی ئاوەزیش.

دڵم لە سەرزەمینی ئەقڵ و شێتییدا بەرەڵڵا کردووە تاکوو لە نهێنیی جیهانی زانین و نەزانین تێ بگەم.

هەر دوو شوێنەکەم وەک بیابانێکی ڕووتەڵ و کوشندە هاتە بەر چاو و ئەوەشم بۆ دەرکەوت کە ئەقڵ و مەعریفە و ئاوەز، بە هۆی ڕەنج و ئازارەوە ڕەنگ و بۆنی خۆی لە دەست دەدات و زیادبوونی زانین و مەعریفەش خەم و خەفەت زیاتر دەکات.

«من کە ئەقڵ تەنگی پێ هەڵچنیوم، دەستەو داوێنی دڵ دەبم تاکوو ڕزگارم بێت و ئیسراحەتێک وەرگرم.

بە دڵم وت:

---

١٣ - Hellespont ؛ یان نۆکەندی داردانل لە نێوان تورکیای بەشی ئاسیا و تورکیای بەشی ئەورووپادا هەڵکەوتووە. پانایییەکەی نزیکەی ١/٣ متر دەبێت.

وازم لێ بێنە
تاکوو نوقمی دەریای چێژ و خۆشییەکان ببم...
بەڵام ئەقڵ و ئاوەز وازی لێ ناهێنێت.
بیرم کردەوە:
بۆچی ڕوو لە نەزانیی نەکەم
چوونکە ئەقڵ لەم بیابانەدا هیچ بە هیچ ناکات».

*

«لە وەها شەڕگەیەکدا ئەندێشە بەردەوام پاڵی پێوە نام کە
ئەوەت بە سەردا دێت کە بە سەر مەجنووندا هاتووە و
منیش بەرگەی وەها ستەمێک ناگرم
ئەی دەبێ چی بکەم؟
بۆچی هەر لە کاتی ڕۆژهەڵاتەوە تاکوو ڕۆژئاوابوون
لە سەر خولگەی ئەم بەردەوامییە دڵڕەقەدا
هیچ شتێک بەدیی ناکەم کە چاوەکانم بەرەو تازەگەریی و
دڵم بەرەو چێژ بکاتەوە؟
دڵیشم وتی: [دەست ناکەوێت] بۆی مەگەڕێ، من زۆر بە دوایدا گەڕاوم!».

ڕەنگە جێی خۆشحاڵیی بێت کە ئەمڕۆ ئەم جۆرە بەرهەمانە تەنها لە لایەن وێژەوان و تۆێژیار و لێکۆڵەرانەوە دەخوێنرێنەوە و کۆمەڵانی خەڵک کەمتر سەروکاریان لەگەڵیاندا هەیە، چوونکە ئەگەر ڕێژەی خوێنەران زیاد بکات، بە دڵنیاییەوە بیروڕاکانی ناو کتێبگەلێکی وەک **کتێبی کۆمەڵگا** کاریگەرییەکی زیاتریان دەبێت.

ئەگەر بۆچوونی نووسەری ئەم کتێبە قبووڵ بکەین، بە دڵنیاییەوە بەم دەرەنجامە دەگەین کە خولقاندنی بەرهەمگەلی تازە، کارێکی بێ سوودە. لە لایەکی تریشەوە ئەگەر ئەوە بسەلمێنرێت کە بیروڕا دەربڕاوەکانی ناو **کتێبی کۆمەڵگا** تایبەت بە گرووپێکی خاوەن ئەندێشە و خاوەن فکری سەربەخۆ نییە، چیدی پێویستی نەدەکرد خۆمان بە خستنەڕووی بیروڕاگەلی هاوشێوەی ئەوانەوە ماندوو بکەین، چوونکە ڕەتکردنەوەی بەهاکان زۆر ئاسانترە لە سەلماندنیان.

حاڵەتە ناجێگیرەکان پێویستیان بە سەلماندن و بەڵگە بۆهێنانەوە نییە چوونکە ئەم حاڵەتانە لە دوای ئەو ڕووداوە دڵخۆشکەر و خەمهێنەرانەوە دێنە ئاراوە کە کاریگەریی لە سەر جەستەمان دادەنێن. دیارە دەتوانین ئەم حاڵەتانە بگۆڕین بەڵام ناتوانین بە بەڵگە و دەسبەڵگە ڕوونکردنەوەیان بۆ بکەین. من چەندین جار بەرەوڕووی حاڵەتگەلێک بوومەتەوە کە ڕەنگە بتوانین ناوی خەفەت یان شادیی «هەڕەمەکیی»یان لێ بنێین. ئەم جۆرە حاڵەتانە نە بە گوێپێنەدان چارەسەر دەکرێن و نە بە ڕووکردنە ئەندێشە فەلسەفییەکان. بە واتایەکی ڕوونتر، لە کاتی سەرهەڵدانی حاڵەتە هەڕەمەکییەکاندا فەلسەفە و ئەقڵ و ئەرگۆمێنت نەیانتوانیوە یارمەتیم بدەن. لەو حاڵەتانەدا تەنها و تەنها خۆسەرقاڵکردن بە بابەتێکی گرینگتر لەو خەم یان شادییە هەڕەمەکییە، توانیویەتی کاریگەریی هەبێت و ئەو دۆخەم بۆ کۆنترۆڵ بکات.

بۆ نموونە: ئەو کاتە بێننەوە بیری خۆتان کە منداڵەکەتان نەخۆش کەوتووە؛ لەو کاتەدا هەست بە بەدبەختیی دەکەن. فکرتان پەرشوبڵاوە و بۆتان چڕ نابێتەوە. سەرجەم فکر و بیرتان لای نەخۆشیی منداڵەکەتانە و بیر لە دۆزینەوەی ڕێگەچارەیەک دەکەنەوە. لەو کاتانەدا بە هیچ شێوەیەک بیر لە تاڵیی و خۆشییەکانی ژیان ناکەنەوە.

کەسی دەوڵەمەند چوونکە هەموو پێداویستیی و ئاسوودەییەکانی ژیانی بە ئاسانیی بۆ فەراهەم دەبێت، پێی وایە هەموو شتێک هەرزانە و بە ئاسانیی دەست دەکەوێت. بەڵام ئەگەر کەسێکی خاوەن ئەندێشەیەکی ئاوها، لە پڕێکدا هەموو سەروەت و سامانی لە دەست بدات، چیدی وەک ئەو کەسەی سەرەوە بیر ناکاتەوە و ڕەنگە بەدیهاتنی داخوازەکانی، کارێکی هێندە سادە و ئاسان نەبێت. ئەو لەم حاڵەتەدا بە پشتبەستن بە هەوڵ و ماندووبوونەوە هەوڵی دەستەبەرکردنی داخوازە ڕەواکانی دەدات.

هەوڵ و تەقەلا، هەستێکی هاوبەشی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵە و، تا ڕادەیەکی زۆریش سنوورەکانی ئەم تایبەتمەندییە لە ناو هەر دوو گرووپەکەدا لە یەک دەچن. کەسێک کە بە ئاسانیی بە داخوازییەکانی دەگات، پێی وایە گەییشتن بە ئارەزوو و هیوایەتەکانی، بەشێک لە چوارچێوەی بەختەوەریی نییە. وەها کەسێک ئەگەر خاوەن ئەندێشەیەکی فەلسەفیی بێت، پێی وایە ژیان بێجگە لە ڕەنج و ئازار هیچی دیکە نییە. چوونکە لای ئەم جۆرە کەسانە، «هیوایەتی بەختەوەریی» کە لە بنەڕەتدا بەدەستهێنانی هەندێک لە داخوازەکانییەتی، مانای

خۆی لە دەست داوە. ئەم کەسانە هەر چییەکیان ویستووە بە ئاسانیی بە دەستیان هێناوە و نازانن بۆ بەختەوەربوون دەبێ داوای چی بکەن.

ئەم ڕوونکردنەوە کورتە بەسە بۆ ناسینێکی سەرەتایی «حاڵەتە ڕۆحییەکان»، بەڵام لە "**کتێبی کۆمەڵگا**"دا بێجگە لە هۆکارە هەستییەکان (ئیحساسییەکان)[١٤] باسی هۆکارگەلی ئەقڵییش دەکرێت:

«ڕووبار ناتوانێت زەریا وەڕس بکات.
ڕووبار ناتوانێت زەریا پڕ بکاتەوە.
لە جیهانی کۆندا هەموو شتێک کۆنە.
لە سەر ئەم چەرخە کۆن و پیرەدا
زۆر کەس ژیاون و مردوون.
لەدایکبوون و ژیان و مردنێک کە ئەمڕۆ بیرەوەرییەکانیشیان لە بیر چوونەتەوە.
بیرەوەریی ژیانەکان لە بیر چۆتەوە و بەردەوامیش لە بیر دەچێتەوە
بەڵام هێڵی هەوڵ و تێکۆشان بۆ هەتایە دەمێنێتەوە
و درێژە دەکێشێت
تەقەلا دەمێنێتەوە، نە سەرەتای هەیە و نە کۆتایی
من ڕقم لە تەقەلایە چوونکە هەرمانە
چوونکە لە منی فەرامۆشکراوەوە بۆ نەوەکانی داهاتوو بە میرات دەمێنێتەوە».

ئەگەر هزرێکی ئاشنا بە فەلسەفە لەم سەردەمەی ئێمەدا بیهەوێت ئەندێشەکانی نووسەری **کتێبی کۆمەڵگا** بە گوێرەی سەردەم لێک بداتەوە و شرۆڤەیان بکات، ڕەنگە نووسینێکی ئاوهای لێ دەرچێت:

مرۆڤ بەردەوام لە ڕەنج و ئازاردایە
ئەتۆم، مۆلکول و بە گشتیی مادە
بەردەوام لە جووڵانەوەدان

---

١٤ - لەم جورە ڕستانەدا وشەی **ئیحساس** یان **هەست** بەرامبەر بە وشەی ئینگلیزیی Sentiment هاتووە و جیاوازە لەگەڵ وشەی **هەست** بەرامبەر **خودئاگا**. و . ک

بەردەوام دەسووڕێنەوە و بە مەرگ پێ دەکەنن
بەڵام لەم هەرمان بوونەشیاندا
هیچ شتێک هەتایی نییە.
ئەگەرچی لەدایکبووەکان وێنایەکی نەگۆڕاوی مردووەکانن
بەڵام مەرگ واتە بە میرات جێهێشتن و واز لێهێنان.
هەموو دەسکەوتەکانی تەقەلاکانی دەرکەوتن لە وەرزێکی دنیای کۆن و بێ مەرگدا.
مردن واتە میراتێک کە ناوی «تەقەلا»یەکە بۆ ئەوانەی لە دایک دەبن.
ڕووبارەکان دەڕژێنە زەریاکانەوە
زەریا بێزارە لە ڕووبار.
مرۆڤەکان لە ناو زنجیرێک بە درێژایی ناکۆتا بە هەموو بەشەکانیانەوە دروست دەبن و
لە سەر ئەم هێڵە نارێکە پێ دەنێنە جێ پێی ئەوانی تر و دەڕۆن و
لە بەر چاواندا ون دەبن
لە سەر هێڵەکان و بە سواری مەرگەوە، هیچ تۆزێکیان لێ هەڵناسێتەوە.
بەڵام مەرگ، جێگیر و سەقامگرتوو و نەگۆڕە
هەمووانیش ئەمە دەزانن
کە ئەگەر ڕووبارەکان ئەقڵیان هەبوایە
لە جێی خۆیاندا نەدەجوولان
ئەگەر «سلێمان»[١٥] ئەقڵی هەبوایە
هیچ دارێکی نەدەچاند کە منداڵە بمرەکانی
لێی بخۆن و بشمرن؛

---

١٥ - Solomon ؛ لە پێغەمبەرەکانی نەتەوەی جوو کە کتێبێک بە ناوی «غەزەڵەکانی سلێمان»ی دەخەن پاڵ و دەڵێن هی ئەوە و جێی مشتومڕە و تا ئێستا ڕوون نەبۆتەوە. لەوانەیە لە بنەڕەتدا کۆمەڵێک سروودی بابلی بێت کە بە ناوی ئەشتار و تەمووز هۆنراونەتەوە و لەوانەشە تاقمێک لە غەزەلنووسە عیبرانییەکان بە ئیلهام وەرگرتن لە ڕۆحی یۆنانیی بە هاتنی ئەسکەندەر بۆ سەرزەمینی یەهوود هۆنیبێتیانەوە. هەروەها کتێبێکی تریشی بە ناوی «پەندەکانی سلێمان» هەیە کە پاش خۆی کۆ کراوەتەوە. بەسەرهاتی حەزرەتی سلێمان و سەبا لەناو قورئانیشدا هاتووە.

مەرگ، جێگیر و پتەو و نەگۆڕە و
منداڵانی "سلێمان"یش دەمرن».

***

ئێستا دەچینە سەر لێکدانەوە و ڕوونکردنەوەکەی **کتێبی کۆمەڵگا** و، سەرنجێکی جیاوازییەکان دەدەین.

**لە جیهانی کۆندا هەموو شتێک کۆنە.**

ئەم ڕستەیە گوزارشت لە دێرینبوونی جیهان و نەگۆڕیی دەکات و ئەگەر قبووڵی بکەین، دەبێ چاومان لە هەمبەر ئەو گۆڕانکارییانەی کە لە هەموو بوارەکاندا ڕوو دەدەن بنووقێنین. بەڵام ئەوەی ڕاستیی بێت باڵەخانەکان، فڕۆکەکان، پیشەشازیی ئاسمانیی، پێوەندییە ڕادیۆییەکان، سیاسەت و سیاسەتوانەکان و... بوونیان هەیە و ناتوانین نادیدەیان بگرین.

ئەگەر سلێمان لە کاتی گەڕانەوەی لە سەرزەمینی "سەبا"دا دەنگی شاژنی "سەبا"ی لە ڕادیۆوە گوێ لێ بووبایە و بیزانیایە کە بۆ دەستوپێوەندەکانی فەرمانگەلی ڕێکوپێک دەر دەکات، لەوانەیە نەیتوانیبایە لە مەلەوانگە بلوورییەکان و سێبەری دار و درەختەکان چێژ وەربگرێت و ئاسوودە بێت. ڕەنگە دەنگی شاژنی "سەبا"ش لە کاتی دوورکەوتنەوەی سلێمان لە ناوەندی فەرمانڕەواییەکەیەوە سووکنایی پێ ببەخشایە.

دیارە ئەگەر سلێمان ئەرشیڤی ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی ئەمڕۆی دنیای لە بەردەستدا بوایە و سکرتێر و نامەنووس و ئابوونەی بژاردەی ڕۆژنامەکانی هەبوایە و، وەخت و بێوەخت لە هەواڵ و زانیارییەکانی دنیا ئاگادار بوایەتەوە، چاندنی دار بۆ کەڵکوەرگرتنی نەوەکانی داهاتوو، بە کارێکی بچووک و کەمبایەخ دەهاتە پێش چاو و کەس نەیدەتوانی لە بەردەمیدا، باسی نەگۆڕیی و کۆنبوونی دنیا بکات.

ئەو شتانەی کە ئەمڕۆ مرۆڤ بە سەر جیهانیدا سەپاندووە، ئەگەر بە سەر هزری نووسەری "**کتێبی کۆمەڵگا**"شدا بیسەپێنێت، ڕەنگە ڕەشبینییەکەی بە هەموو بەهێزیی و پانوبەرینییەکەیەوە دەسڕایەوە و لە ناو دەچوو. بەڵام ئەویش دەبێ بۆ دیاردە نوێیەکان ڕاڤەکاریی تازەی پێ بێت.

شتێکی سەرنجڕاکێش لێرەدا ئەوەیە کە بەڕێز کراچ گلەیی لەوە دەکات کە »لەم جیهانەدا زۆر شتی تازە هەن...».

بە ناسینێکی قووڵتر و ئاگاداربوون لە دیاردە بەردەوام بگۆڕەکانی جیهان، نابێ ئێش و ئازارە زووتێپەڕەکان ببنە هۆی دڵ ئێشان. زۆر شت لەم جیهانەدا هەیە کە نەک تەنها ناتوانین کەڵکیان لێ وەربگرین بەڵکوو تەنانەت ناشتوانین بیانناسین، بەڵام نابێ ئەم کەڵک وەرنەگرتن و نەناسینە، بێهیوامان بکات.

جارێکی تر دووپاتی دەکەمەوە:

«هەموو ڕووبارەکان دەچنەوە سەر زەریاکان

زەریا لە ڕووبار بێتاقەت نابێت

ڕووبار زەریا پڕ ناکاتەوە.

ڕووبارەکان دەگەڕێنەوە بۆ هەمان ئەو شوێنەی کە لێوەی هاتوون».

ئەگەر بە شێوەیەکی ڕەشبینانە باسەکە لێک بدەینەوە ئاوای لێ دێت کە »جووڵانەوە و بەرەو پێشەوەچوون شتێکی باش نییە...«.

باشە، خەڵک لە ڕۆژانی هاوین و ڕۆژە گەرمەکاندا بەرەو شوێنە خۆش و دڵڕفێنەکان سەفەر دەکەن، بەڵام کە پشووکەیان تەواو بوو دەگەڕێنەوە بۆ هەمان شوێنە هەمیشەییەکەی خۆیان.

ئەگەر گەڕانەوە شتێکی خراپ بێت، کەواتە گەرمیان و کوێستان کردنیش کارێکی بێهوودەیە.

ئەگەر ئاوەکان هەست (ئیحساس)یان هەبوایە ڕەنگە سەبارەت بە گەڕان و سووڕانەوە بەردەوامەکانیان بە هەمان شێوازە ناسک و جوانەوە دەدوان، کە شێلی[16] لە چیرۆکی "**هەور**"دا باسی کردووە.

---

١٦ - Shelly پرێسی پیچ شێلی (١٨٢٢ - ١٧٩٢) شاعیری سەدەی نۆزدەهەمی بەریتانیا. لە تەمەنی ١٧ساڵیدا بە تاوانی بڵاوکردنەوەی کتێبێک سەبارەت بە ڕەتکردنەوەی ئاین، لە زانکۆی ئاکسفۆردەوە دەرکرا و بنەماڵەکەشی بە هەمان شێوە لە ماڵەوە دەریان کرد. ناچار چوو بۆ سویسرا. شێلی لە ژیانە کورتەکەیدا خۆشەویستیی، ناو و ناوبانگ، سەروەریی، دوورکەوتنەوە، غەریبایەتیی و ناکامیی تاقیی کردەوە و لە لووتکەی زانایی و بلیمەتیدا بوو کە لە خەلیجی "سپیزیا"دا

پرسی بەجێهێشتنی ماڵ و دارایی وەک میرات بۆ نەوەکانی داهاتوو و شێوەکانی دیکە، دەتوانرێت لە دوو گۆشەنیگاوە بخرێتە بەر باس و لێکۆڵینەوەوەوە.

ئەم بیرۆکەیە کە مرۆڤ هەمیشە چاوی لە داهاتوو بێت و لەو باوەڕەدا بێت کە ئەمڕۆ بە بێ سبەینێ — کە هەمان داهاتوویە — هیچ واتایەکی نییە، هەمیشە ڕوانگەیەکی جوان و گونجاو نییە.

وەها ڕوانینێک بەو واتایەیە کە بەش (جوزء) هیچ بەهایەکی نییە. چوونکە ژیان کۆمەڵێکی پێک هاتووە لە دوێنێ و ئەمڕۆ و سبەینێ. ئەگەر ژیان وەک گشتێک لە بەر چاو بگرین، چۆن بەبێ بەهای ئەمڕۆ، سەرجەمی ژیان دەتوانێت بەها و بایەخی هەبێت؟ لەو واتایەی کە ئێمە باسی دەکەین، بەهای گشت بەبێ بەهای بەشەکان، هیچ نییە [واتە **گشت** بە بەشەکانییەوە خاوەنی واتا و بەهایە].

ژیان بە تەنها چیرۆکێکی پڕ لە ڕووداو و بەسەرهات نییە کە ژنان و پیاوە قارەمانەکانی ئازار بچێژن تەنها لە بەر ئەوەی کە کۆتاییەکی خۆش و دڵبزوێن بۆ ئەم چیرۆکە بهۆننەوە.

«من زیندووم؛ چوونکە زیندووم، دەژیم
کەڵک لە ژیانم وەردەگرم
منداڵ و نەوەکانیشم هەر وەکوو خۆم دەبن
منداڵانی ئەوانیش وەکوو ئەوان دەژین
باپیرانم ژیان و، منیش دەژیم
نەوەکانیشم زنجیرەیەکی بێکۆتایی ژیان دەژین
کوێی ئەم قافڵەیە لە ڕێڕەوی خەمەوە تێ دەپەڕێت؟
ئەگەر ژیان هەتایی و هەرمان بوایە...
ئەگەر شوێنێکی مەبەست چاوەڕێی نەکردینایە...

نوقم بوو. شێلی لە کاتی مەرگیدا تەمەنی ٣٠ساڵ بوو. بەناوبانگترین بەرهەمەکانی بریتین لە: کۆئین مەپ(١٨١٣، ڕۆزالیند و هێلن، سنێت ئیرۆین. شێلی لەناو هەموو شاعیرانی بەریتانیای هاوچەرخیدا تاقە شاعیرێک بوو باوەڕی بە شۆڕشی فەرانسە مابووەوە. ئەو لەو باوەڕەدا بوو کە جیهان بەم زوانە لە چنگ دەسەڵاتی دیکتاتۆرە فریودەرەکان ڕزگاری دەبێت.

ئەگەر...».

ژیان هەموو چێژ و خۆشییەکانی لە دەست دەدا. لە سەر هێڵێکی بێ دەسپێک و بێکۆتایی، بێ بەرز و نزمیی، وەکوو لێخوڕین لە جادەیەکی تەخت و هەمواردا خەو و هیلاکیی دەخزێنێتە گیانی شۆفێرەوە.

قۆناغە ناوبڕەکانی نێوان مەرگ و ژیانە کە دەتوانێت وورووژانی ئەڤین و خۆشەویستیی و گرێدراویی (=گیرۆدەیی) — بە هەموو ئەو شتانەی کە ناویان ژیانە — بێنێتە ئاراوە.

«ئاگری ژیان ڕوخسارم دەگەشێنێتەوە

تین و گەرمیی ژیان، دەستەکانم گەرم دەکاتەوە و

شەختەی بێ هەستیی و بێ ئەشقیی دەتوێنێتەوە

و...

ئاگر دەمرێت و

ژیان دەمرێت و

خۆشەویستییش... ئاخ...

دەبێ بڕۆم

ئەسپە چێوینەکەم ئامادەیە...».

ئەم جۆرە ڕوانینە لە ژیان ڕێک هێندەی ڕق و نەفرەت لە مەرگ لۆژیکییە و، بۆیە دەتوانین بە ڕاشکاوانە بڵێین:

«ئەگەر تووڕەیی و ناوچاوگرژیی بنەمایەکی ئەقڵانیی هەبێت، بە دڵنیاییەوە شادیی و خەمیش بە هەمان شێوەیە...

ئەگەر شادیی و خەم لەگەڵ ئەقڵدا یەک دەگرنەوە، بۆچی شادیی و هیوا لەگەڵ ئەقڵدا یەک نەگرنەوە؟

کەواتە شادیی و هیوا ڕێک هێندەی نائومێدیی و بێهیوایی، پەسەند و ڕەوایە...«.

**کتێبی کۆمەڵگا** خەمنامەیە و "**خەسڵەتەکانی سەردەمی مۆدێرن**"ی بەڕێز کراچ خەفەتهێنەرە.

بەڕێز کراچ بە دەم ئازاری هەڵوەشانەوەی بنەماکانی حەقیقەتەکانی چاخەکانی ناوەڕاستەوە دەناڵێنێت و بۆ ئەم سەردەمەی ئێمەش گریانی دێت و دەڵێ:

«... بەڵام سەردەمە نگریس و نالەبارەکەی ئێمە...

بۆتە هێلانەی ڕۆحە هەڵاتووەکانی دنیای مردووەکان

ئەو ڕۆحانەی کە وەکوو پەتایەک لە سەر سینگی ئەم سەردەمەدا پەپکەیان بەستووە

سەردەمێک کە بێ هەست و ناتەوان و بێهێز، مەرگی مردووەکان بە چاوی خۆی دەبینێت

سەردەمی ئێمە هێشتا لە سەر پێی خۆی ڕانەوەستاوە و ناتوانێت هەنگاوی هێقم و پتەو هەڵبگرێت.

هەنگاوەکانی هێندە سست و لەرزۆکن کە لە هەموو هەنگاو هەڵگرتنێکدا مەترسیی ئەوە لە ئارادایە بەر بێتەوە بۆ قووڵاییەکانی مەرگ و نەمان.

لە منداڵێکی پێڕەوکە دەچێت کە ناتوانێت

بەبێ پشتبەستن بە دیواری بنەما و یاسا و ڕێساکان پێ بنێتە جادەی ڕاست و دروستەوە...».

خاڵێکی شاراوە لەم قسانەی بەڕێز "کراچ"دا هەیە کە هەموو ئەو ڕۆشنبیرانە دەگرێتەوە کە ڕێچکە کۆنە ئەدیبانەکەیان بەر نادەن و هەرگیز سەر بەرز ناکەنەوە تاکوو گۆڕانکارییەکانی سەردەمی نوێ ببینن. چوونکە ئەوان هیچ تێگەییشتنێکیان لە سەر شتە «تازەکان» نییە. ئەوان فێری ئەوە بوونە کە تەنها و تەنها پشت بە زانیارییەکانی ئەو سەردەمەیانەوە ببەستن. باوەڕ و بیر و بۆچوونەکانیان لە سەر بنەماگەلی باوەڕپێکراو و لۆژیکیی بنیات نەنراوە و پێشیان وایە ناتوانن پشت بە هەست و ئیحساس و وروژانەکانەوە ببەستن و لەوانەشە هەر نەیانبینن. وا باشترە بڵێین: ناتوانن واز لەو حەز و ئارەزووانەیان بێنن کە دنیای زانین و زانست ناتوانێت بیانپارێزێت و بیانهێڵێتەوە.

بەڕێز کراچ وەکوو زۆربەی ئەدیب و زانایان لەو ڕووەوە کە زۆرێک لە مژدەکانی بواری زانست نەهاتوونەتە دی، ناتوانێت ئازارەکانی خۆی بشارێتەوە. ئەڵبەتە با ئەوەش بڵێین کە بەڕێز کراچ هەرگیز ناڵێت ئەو مژدە و بەڵێنانە پراکتیزە نەکراون. تەنها دەتوانیت ئەوە لە

قسەکانی هەڵکرێنیت کە لەو باوەڕەدایە دەیان ساڵ پێش ئێستا داروین[١٧] و هاکسلی[١٨] هەندێک چاوەڕوانییان لە زانست هەبووە کە نەهاتوونەتە دی (وا باشترە بڵێین پراکتیزە نەکراون).

بە باوەڕی من بۆچوونەکانی بەڕێز کراچ و کەسانی وەک ئەویش کە لە سەرەوە ئاماژەمان پێ دا، هەندێک بۆچوونی تەواو هەڵە و بێ بنەمان و، ئەو نووسەر و زانا ئایینییانەش ڕێبەر و جێبەجێکارین کە حەز ناکەن کارەکانیان کەمبایەخ دەربکەوێت.

بێگومان لەم سەردەمەی ئێمەدا و یان دروستتر بڵێم، لەم ساڵانەی دواییدا ژمارەی کەسە ڕەشبینەکان زۆر لە جاران زیاتر بۆتەوە. زیادبوونی ڕێژەی ڕەشبینیی، ڕێک پێچەوانەی داهات و دەرامەتی تاکەکانە؛ واتە تا ڕادەی داهاتی تاکەکان کەمتر ببێتەوە، ڕەشبینییان زیاتر دەبێت. تا ڕێژەی داهاتی گشتیی کەمتر ببێتەوە، ژمارەی تاکە ڕەشبینەکانیش ڕوو لە زیادبوون دەنێت.

ئەوەشمان لە بیر نەچێت بەڕێز کراچ کەسێکی ئەمریکاییە و داهاتی گشتیی ئەمریکاییەکان بە هۆی ڕوودانی جەنگی جیهانییەوە زۆر زیادی کردووە، بەڵام پێچەوانەی ئەم

١٧ - Darwin؛ (١٨٥٩ - ١٨٨٧)؛ چارڵز ڕۆبێرت داروین بایۆلۆژیستی بەریتانیی کە پاش خوێندنە سەرەتاییەکانی، لەگەڵ شاندێکی سروشتناسییدا سەفەری کرد بۆ دوورگەکانی لای ڕۆژئاوای ئۆقیانووسی ئارام. لەو سەفەرەدا هەموو کاتی خۆی بۆ تاقیکردنەوە و ئەزموون و توێژینەوەی ڕووەک و گیانەوەران تەرخان کرد و سەرەنجام کتێبێکی بە ناوی "**ڕەچەڵەکی جۆرەکان**" (Origin of species)ی نووسی. لەم کتێبەدا ئەوە دەسەلمێنێت کە سەرجەم بوونەوەرانی دنیا لە یەک بنەما و ڕەچەڵەکەوە سەرچاوە دەگرن و لە یەکترییەوە درووست بوونە و بەپێی یاساکانی ململانێی مانەوە (بەقاء) و هەڵبژاردنی سروشتیی و مانەوەی جۆرە باشترەکان، ڕێگەکانی مانەوەیان هەڵبژاردووە و مرۆڤیش کامڵترینیانە و لە سەرووی هەموویانەوەیە. لایەنگرانی داروین بە داروینیست دەناسرێن و باوەڕەکانیشی بە داروینیسم ناوی دەر کردووە.

١٨ - Huxley، ئاڵدۆس هاکسلی (١٨٩٤ - ؟)؛ لە "گۆڵدانگ"ی نزیک لەندەن لە دایک بووە. باپیرەی واتە تۆماس هێنری، سروشتناسی بەناوبانگ و هاوچەرخ و لایەنگری داروین بوو. هاکسلی لە خوێندنگەی دەوڵەتیدا دەیخوێند و پاشان چوە زانکۆی ئاکسفۆرد. لە کۆتاییەکانی جەنگی جیهانیدا لە گۆڤاری "**ئاتینیۆم**"دا کە گۆڤارێکی بەناوبانگی سیاسیی و ئەدەبیی بەریتانیا بوو، چەند وتارێکی ڕەخنەکارانەی نووسی و ساڵی **١٩٢٥** کۆمەڵە شێعرەکەی بڵاو کردەوە.

هاکسلی لە زۆربەی چیرۆکەکانیدا دژبەرایەتیی نێوان هەست و عاتیفە و کەسایەتیی مرۆڤ لە ڕوانگەی بنەما زانستییەکان بە تایبەت زانستی فیزیک و شیمی دەخاتە بەر شیکاری و لێکۆڵینەوە و، وەک دەروونناسێکی بە توانا، ڕەهەندەکانی سستیی و زەبوونی و داماویی مرۆڤ دەردەخات.

حاڵەتە لە ناو لایەنگرە ئەورووپاییەکانیدا دەبینرێت. چینی ڕۆشنبیری ئەورووپا هەر لەم کاتانەدا ئازارێکی زۆریان چەشتووە. ئەوان متمانەی خۆیان لە دەست داوە و ئەو سەقام و جێگیرییەی جارانیان نەماوە.

ناجێگیرییەکی ئەوتۆ لە ناو چینی ڕۆشنبیری [ئەورووپا] دا چەکەرەی کردووە کە حاڵەتێکی هزریی لا دروست کردووە.

هەندێک بارودۆخی وەک جەنگ لە هەر سەردەمێکدا بێتە ئاراوە، چەندین پاڵنەر(مۆتیڤ)ی جۆراوجۆری کۆمەڵایەتیی لەگەڵ خۆیدا دێنێت کە هەر ئەم پاڵنەرانە زۆر بەهێزتر و کاریگەرترن لە هێز و دەسەڵاتی جیهانبینیی و چۆنیەتیی تێڕوانینی مرۆڤ لە سەر جیهان.

کەمتر سەردەمێک هەیە کە هێندەی سەدەی سێزدەهەم هەستی بێهیوایی و نائومێدیی تێدا هەبووبێت. هەر چەند لەو سەردەمەدا کۆمەڵانی خەڵک بە ڕادەیەکی زۆر پابەندی باوەڕە ئایینییەکانیان بوون و دەستەبژێرەکانی کۆمەڵگا بایەخێکی ئەوتۆیان بە ئایین نەدەدا، بەڵام هەر ئەم باوەڕە ئایینییانەی خەڵکی ڕەشۆکییە کە بەڕێز کراچ ئاخی بۆ هەڵ دەکێشێت.

سەبارەت بە بایەخدانی لە ڕادەبەدەری خەڵکی ڕەشۆکیی بە ئایین، بەڕێز ڕاجر بیکەن[١٩] دەڵێت:

«حکوومەتی تاوان لەم سەردەمەدا هێزێکی زیاتری هەیە. حکوومەتی تاوان لە سەر ئایین — تاوانێک کە تێکەڵ بە ئەقڵ نابێت. ئەگەر لە بارودۆخی جیهان ورد ببینەوە و واقعبینانەتر ڕەهەندە جۆراوجۆرەکان تاوتوێ بکەین، دەزانین کە نەزانیی و گەندەڵیی زیاتر لە ناو ئەو چینانەدا تەشەنەی کردووە کە بە ناوی «چینە باڵاکان» دەیانناسین.

هەرچی و پەرچیگەریی و شەهوەتپەرستیی هێندە پەرەی سەندووە کە تەنانەت باڵی بە سەر باوەڕە ئایینییەکانیشدا کێشاوە و تەنانەت تا سنووری بێڕێزیکردن بەو باوەڕانە چۆتە پێشەوە. دروشمی ئاسوودەییخوازیی، بە تەواوەتیی باڵی بە سەر هەڵسوکەوتی ئەم چینەدا کێشاوە. لە

١٩ - Roger Bacon، ١٢١٤ — ١٢٩٢ی ز؛ بیرمەندی چاخەکانی ناوەڕاستی بەریتانیا کە باوەڕ و ئەندێشەکانی وەکوو ئەندێشەی بیرمەندانی سەدەکانی شانزە و حەڤدە بوو و چوونکە باوەڕەکانی بە پێچەوانەی ئایینەکەی بوون، چەندین ساڵ خرایە گرتووخانەوە.

کاتێکدا بارودۆخی «چینی باڵا» بەم جۆرەیە، دەبێ چ چاوەڕوانییەکانمان لە چینەکانی دیکە هەبێت و بە گشتیی بارودۆخی چینەکانی تری کۆمەڵگا چۆن دەبێت؟

لە کۆمەڵگایەکدا کە هەڵسوکەوتی خاوەن کڵێسەکان گوزارشت لە چاوچنۆکیی و پارەپەرستیی و کۆکردنەوەی ماڵ و دارایی دەکات، چۆن دەبێ بە دوای هەندێک پرسی وەک پاکژکردنەوەی ناخ و دەرووندا بگەڕێین؟ کاتێک خاوەن کڵێسەکان ئاوان، چۆن دەتوانین چەند کەسێکی دیاریکراویان لێ بکەین بە بەڵگە و پشتیان پێ ببەستین؟ ئەگەر بە وردیی سەرنج بدەین، ئەم تاقمە کە من هیچ کەسێکیان لێ هەڵناوێرم [و مەبەستم لە هەموویانە]، لە چاڵی بێکۆتایی گەندەڵییدا نوقم بوونە و هەر لە پلە سەرەکانیانەوە تا ئەوانەی خوارەوە، پلە و پێگەی خۆیان لە دەست داوە. ڕاهیبەکانی کەنێسە و پەرستگەکانیش بە پێچەوانەی ئەو حەیا و حورمەتەی جارانیان کە پێگەیەکی باش و لەباریان بۆ ڕەخساندبوو، تووشی گەندەڵیی و داڕزین بوونە. کۆبوونەوەی ئەم ڕۆحانییە لووتبەرز و خۆبەزلزانانە تەنانەت لە هەندێ شوێنی وەک ئاکسفۆرد و "پاریس"یشدا بە هۆی بە گژداچوونەوەی یەکترییدا نەک تەنها خۆیان بەدناو دەکەن بەڵکوو خەڵکانی تریش گەندەڵ و ڕیسوا دەکەن. مەبەست لە خەڵک ئەو خەڵکە ڕەشۆکییەن کە گوێ لە قسە و فەرمانی قەشە و ڕاهیبە و خاوەن کڵێسەکان دەگرن. کەس بایەخ بەم پرسە نادات کە هەڵسوکەوتی ئەوان هیچ بنەمایەکی ئایینیی نییە و، تەنها هەندێک ڕەفتاری چاوچنۆکانە و زێدەخوازانەن بۆ دامرکاندنەوەی حەزە دەروونییەکانیان.

بەڵام سەبارەت بە زانایان و هزرمەندانی ڕابردوو کە نکوولییان لە دەسەڵاتی ناکۆتا (لایەزال) دەکرد، دەڵێت:

«ئەوان بە هۆی بایەخنەدان بە دنیا و هەموو لایەنە هەڵخەڵەتێنەرەکانییەوە، کەسانێکی شایستەتر و ڕێکوپێکترن. ئەوان بە چاوپۆشیکردن لە حەز و چێژەکانیان و هەروەها خۆشیی و شان و شکۆ و ڕێز و حورمەت و شانازییەکانیان، لە پلەیەکی ئێجگار سەرووتر و باڵاتر لە ئێمە ژیاون.

«هەموان دەتوانن لە ڕێگای خوێندنەوەی بەرهەمەکانی فەیلەسووفان و زانایانی وەک ئەرەستوو[٢٠]، سێنێکا[٢١]، توولی[٢٢]، ئیبن سینا[٢٣]، فارابی[٢٤]، ئەفلاتوون[٢٥]، سوقرات[٢٦] و... لەوە تێ

٢٠ - Aristotele؛ ٣٢٢ – ٣٨٤ی پ.ز؛ لە شاری "ئەستانمیرا"دا لە دایک بووە. لە تەمەنی هەڤدە ساڵییەوە لەبەر دەستی ئەفلاتووندا دەستی بە خوێندن کرد و لای ئەو مامۆستایە فێربوونی زانستی دەست پێ کرد. ساڵی ٣٤٧ لە کۆشکی "فیلیپ"دا فێرکردن و ڕاهێنانی ئەسکەندەری مەقدۆنیی گرتە ئەستۆ. بەڵام پاش ماوەیەک ناکۆکیی کەوتە نێوانیانەوە و مامۆستا دەستی کرد بە داگیرکردنی جیهانی مەعنەویی و قوتابیش دەستی کرد بە داگیرکردنی جیهانی مادیی. بەناوبانگترین بەرهەمی ئەرەستوو شەش نامیلکەی لۆژیکی یە کە بە ناوی **ئەرغەنوون** ناوی دەرکردووە. "**متافیزیک**" و "**مێژووی گیانەوەران**"یش لە بەرهەمەکانی ئەون. ئەرەستوو بە »مامۆستای یەکەم« [یان یەکەمین مامۆستا] ناوبانگی دەرکردووە.

٢١ - Seneca؛ ٤ی پ . ز - ٦٥ی زایینیی؛ لە "قەرتەبە"ی "ئیسپانیا"دا لە دایک بووە. ڕاهێنەری نێرۆن دیکتاتۆری خوێنمژ و دڕندەی ڕۆم بوو و بە هۆی زێدە زانابوونییەوە کەوتە بەر گومانی ئیمپراتۆر و بە فەرمانی نێرۆن و بە دەستی خۆی دەمارەکانی خۆی بڕی و گیانی لە دەست دا. سێنێکا لە فەلسەفەدا لەگەڵ ڕەواقییەکاندا کۆکە و چەند نامیلکەی لە بواری خیتابە و ئامۆژگاریی و ئاکاردا هەیە.

٢٢ - Tully؛ ١٥٦ – ٤٣ی پ ز؛ توولی نازناوی "سیسرۆ"ی وتەبێژ و سیاسەتمەداری بەناوبانگی "ڕۆمی"یە. مارکۆس تۆلیۆس سیسرۆ، لە نزیک "ئاربی نیۆم"دا لە دایک بوو. ئەم فیلسووفە یەکێکە لە ڕەواقییەکانی ڕۆم. کۆنپارێز و وەهمپەرستە و لە ڕووی سیاسییەوە دژی دیمۆکراسی و، لایەنگری حکوومەتی پاشایەتیی و ئەریستۆکراسیی و حکوومەتی چینی دەوڵەمەند بوو.

٢٣ - Avicenna؛ ٣٧٠ – ٤٢٨ی کۆچی مانگیی؛ ئەبوو عەلی شێخ ڕەئیس موشرفەلمولک حوسەین، کوڕی ئیبن عەبدوڵلا کوڕی حەسەن کوڕی عەلی کوڕی سینا، لە خەرمسین یەکێک لە گوندەکانی بوخارا لە دایک بووە. لە بوخارادا خوێندنی دەست پێ کرد. لە دە ساڵیدا قورئانی لەبەر کرد و لە سێزدە ساڵیدا نەخۆشیی نووحی کوڕی مەنسوور پاشای حکوومەتی سامانیی چارەسەر کرد و کەڵکی زۆری لە کتێبە بەنرخەکانی وەرگرت. لە چواردە ساڵیدا کتێبی **لۆغەتی عەرەبیی** نووسی. ئیبن سینا شارەزایی لە هەموو زانستەکاندا هەبوو بە تایبەت پزیشکیی و لۆژیک و فەلسەفە. لە خوراسانەوە بەرەو ئیسفەهان و پاشانیش بەرەو هەمەدان ڕۆشت و لەوێدا بوو بە وەزیری شەمسودەوله. زیاتر لە ١٢٠ کتێبی هەیە و ناودارترینیان بریتین لە شەفا، قانوون، الاشارات و التنبیهات. ئیبن سینا لە شاری "«هەمەدان"دا کۆچی دوایی کرد.

٢٤ - Alfarabius؛ ٣٣٩ی کۆچی مانگی - ؟؛ ئەبوو نەسر موحەمەد کوڕی موحەمەد ، فیلسووف و بیرکاریزان و ئەستێرەناس گەورەی ئێرانیی لە "بەسیج"ی سەر بە فاراب لە دایک بووە. فارابی لە کاتی مەرگیدا تەمەنی هەشتا ساڵ بوو و دەتوانین وای بۆ بچین نزیکەی ساڵی ٢٦٠ی کۆچی مانگیی لە دایک بووبێت. هەر لە هەرەتی لاوێتیدا زێدەکەی خۆی بە جێ هێشت و چوو بۆ بەغداد کە لەو سەردەمەدا پایتەختی زانستیی و ڵاتە ئیسلامییەکان بوو و لەوێدا فێری زانین و مەعریفە بوو. لە بواری بیرکردنەوە و ئیستدلال و دەربڕینی بیروڕاگەلی تازەی فەلسەفیدا تاقانەی سەردەمی خۆی بووە.

بگەن کە چۆن ئەم کەسانە نهێنیی ئەقڵ و ئاوەزیان دەرک کردووە و کێشەکانی زانستیان هێناوەتە ناو قەڵەمڕەوی تێگەییشتنەوە«.

ڕاجێر بیکەن بە پێی وتەکانی هەموو بیرمەندە هاوچەرخەکانی خۆی، هیچ دڵی بەو سەردەمە خۆش نەبووە کە تیایدا ژیاوە. ناڕەزامەندیشی هیچ هۆیەکی مەعنەویی و ئایینیی لە پشتەوە نەبووە. ناڕەزایەتییەکەی تەنها و تەنها بۆ جەنگ و ئەو هەژارییەی هەڵقوڵاوی جەنگ دەگەڕێتەوە کە کۆمەڵگا بە ئاراستەی بێئاکاریی و توندوتیژیی دەبات.

یەکێک لە بەشە خەمهێنەر و خەمناکەکانی کتێبەکەی بەڕێز کراچ ئەو بەشەیە کە پێوەندیی بە ئەڤین و خۆشەویستییەوە هەیە. پێدەچێت خۆشەویستیی لە واتا بەرز و باڵاکەیدا لە لایەن خەڵکی سەردەمی "ڤیکتۆریا"وە جێی ڕێز و بایەخپێدان بووە. بەڵام بەڕێز کراچ هەوڵ دەدات بە خستنەڕووی بەڵگە و دەسبەڵگەی سست و بێبنەمای سەردەمی نوێ، وای نیشان بدات کە سەردەمی شان و شکۆ و پیرۆزێتیی ئەڤین و خۆشەویستیی بەسەر چووە و دەبێ وەک شتێکی بە کۆتاهاتووی لە قەڵەم بدەین.

---

نزیکەی سەد بەرهەمی هەیە کە گرینگەکانیان بریتین لە: **رساله فی بادی ئەرا، ئەهل ئەلمەدینە ئەلفازلە، مەقالە فی مەعانی ئەلئەقل، عەیون ئەلمەسائل فسوس ئەلحەکەم، ئەحسا ئەلعلووم، رساله فی ئسبات ئەلموفارەقات.**

٢٥ - Plato، ٤٢٨ یان ٤٢٧ – ٣٤٧ی پێش زایین؛ فیلسووفی گەورەی یۆنان «ئەفلاتوون» یان باوکی ڕەسەنایەتی وێناکردن (تەسەور) لە ئەسینادا لە دایک بووە و لە تەمەنی بیستساڵیدا چووە لای سوقرات و بۆ جێبەجێکردنی ئامانجەکانی، ئەکادیمییەکی لە باخی "ئاکادێمووس"دا دامەزراند. ئەو باوەڕی بە ڕەسەنایەتیی شتە ئەقڵییەکان و شتە مەعنەوییەکان هەبوو و بایەخی بە شتە بەرهەستەکان (=مەحسووسات) نەدەدا. چەندین بەرهەمی لە پاش خۆی بە جێ هێشتووە. بەناوبانگترین کتێبی "**کۆمار**"ە، کە پوختەی فەلسەفەکەی خۆی تێدا باس کردووە. لە تەمەنی هەشتا ساڵیدا کۆچی دوایی کرد بەڵام ئەکادیمیاکەی نۆ سەدە دواتریش لە جێی خۆیدا مایەوە.

٢٦ - Socrate، سوقرات ٤٦٩ – ٣٩٩ی پێش زایین؛ لە ئەسینادا لە دایک بووە. باوکی بەردتاش و دایکی قابیلە (مامان) بوو. سوقرات لەبەر ئەوەی کە پرسیاری زۆری دەکرد بە **فیلسووفی پرسیارکەر** ناوبانگی دەرکردووە و بە شێوازێکی تایبەتیی کە بە شێوازی **«گاڵتەپێکردنی سوقراتیی»** ناودێر کراوە، هەڵەکانی دیترانی دەردەخست. بە بڕوای سوقرات نەزانیی سەرچاوەی هەموو بەدبەختییەکانە و فەلسەفەکەشی لەسەر بنەمای دوو بنەمادا ڕاوەستاوە ١): زانین بە بیرهێنانەوە یە (تەزەکور) و هیچی تر؛ ٢): نەزانیی سەرچاوەی گەندەڵیی و تاوانکاری یە. سوقرات پاش دادگایی کردنێکی ڕووکەشانە بە خواردنەوەی ژەهرێکی کوشندە ماڵاوایی لە ژیان کرد. سوقرات هیچ نووسینێکی لە پاش خۆی بە جێ نەهێشتووە و دوای خۆی قوتابییەکانی وتە و ئەندێشەکانیان کۆ کردەوە و نووسینیانەوە.

یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی سەردەمی ڤیکتۆریا ئەو شک و گومانکارییە بوو کە باڵی بە سەر خەڵکدا کێشابوو و خۆشەویستییش هەوڵی دەدا ڕۆڵی ئەو خوایە ببینێت کە لە بیر کرابوو. پیرۆزێتیی و دەسەڵاتی خۆشەویستیی، کارێکی دەکرد کە بە ڕاستیی یەکێک لە هەرە پێویستییەکانی کۆمەڵگا بوو.

ڕەنگە بە ڕاشکاوانە بتوانین بڵێین دڵڕەقترین و بێبەزەییترین تاکەکانی ئەو سەردەمە، ئەگەر بۆ ماوەیەکی یەکجار کەمیش بووبێت حەزیان لە ڕۆحییەیەکی عیرفانیی کردووە. خۆشەویستیی ئەوانی بەرەوڕووی هۆکارێک دەکردەوە کە هەستی ڕێز و حورمەتی تێدا دەورووژاندن و ئەمەش ڕێک هەمان خۆشەویستیی بوو. هەستێک لە بوونیاندا دەورووژا کە خۆشەویستیی تاقە هۆکاری سەرهەڵدانی بوو. ئەوان شتێکیان لە قووڵایی ناخیاندا هەست پێ دەکرد کە ڕاستیی و دروستییەکەی، بێسێودوو لە دڵیاندا هەڵ دەکۆڵرا و دیارە شایستەیی ئەو جێگیربوونەشی هەبوو. بە باوەڕی ئەوان، خۆشەویستیی وەکوو خوا، خوازیاری لەخۆبوردوویی و چاوپۆشیکردن لە داواکارییە بێبایەخ و بێهوودەکان بوو و تەنها و تەنهاش خوا دەیتوانی ئەم جۆرە داواکارییە جێبەجێ بکات. لە لایەکی تریشەوە خوای بەهێز و بەتوانایە کە پاداشتی ئەو ئیماندارانە دەکات کە تێ بگەن لەوەی هەموو دیاردەکانی ژیان واتا و مانای خۆیان هەیە، هەر چەند ئەم واتایەش هێشتا نەناسراوە یان شیکردنەوە و ڕوونکردنەوەی لە سەر نەکراوە.

ڕەنگە لە جێی خۆیدا بێت ئەگەر بڵێین ئەم دنیایە تا ڕادەیەک خوای فەرامۆش کردووە و تووشی بێدینیی بووە، بەڵام هێشتا بە ژیانی بەتاڵ لە ئەڤین و خۆشەویستیی خووی نەگرتووە. ئەگەر ڕۆژێک دابێت کە ئەڤین و خۆشەویستیش فەرامۆش بکرێت، ئەو کاتەیە کە لە واتای بێباوەڕیی و بێدینیی تێ دەگەین.

ئەو بابەتەی کە لای من زۆر سەرسووڕهێنەرە، جیاوازیی ئەندێشەی لاوەکانە لەگەڵ سەردەمی "ڤیکتۆریا"دا. واتە سەرەڕای ئەم هەموو گۆڕانکارییەش هێشتا جیاوازیگەلێکی زۆر لە ناو بیر و ئەندێشەکانی خەڵکدا بەدیی دەکرێت.

من دوو خاتوونی بەساڵاچووم دێتەوە بیر کە هەر دووکیان لە هەندێک ڕووەوە نموونەی ڕاستەقینەی سەردەمی خۆیان بوون. لە سەردەمی گەنجێتیدا هەر دووکیانم باش دەناسی. یەکێکیان زۆر لایەنگری ئاسانکاریی لە عیبادەتکردندا بوو و ئەوی تریان گاڵتەی بە

دابونەریتە ئایینییەکان دەکرد. یەکەمیان بەداخ بوو لەوەی کە بۆچی ئەو هەموو شێعرە بە باڵای ئەڤین و خۆشەویستییدا دەوترێن، [خۆشەویستییەک] کە بە لای ئەوەوە هیچ بایەخێکی نەبوو و، ئەوی تریشیان دەیوت:

«کەس بۆی نییە ڕەخنەی ئەوەم لێ بگرێت کە بۆچی هەمیشە پێم وا بووە سەرپێچیکردن لە فرمانی حەفتەم[27]، هێندەی سەرپێچیکردن لە فرمانی شەشەم[28] ناشیرین و قێزەوەن نییە«.

ڕوانگەکانی ئەم دوو خاتوونە هیچ لێکچوونێکیان لەگەڵ ئەو شتەدا نییە کە بەڕێز کراچ سەبارەت بە جۆری بیرکردنەوەی تایبەتی سەردەمی ڤیکتۆریا[29] دەیخاتە ڕوو. پێدەچێت بەڕێز کراچ بۆچوون و ئەندێشەکانی لە نووسەرانێکەوە وەرگرتبێت کە دژی شوێن و سەردەمی خۆیان بوونە و ڕەنگە بە گشتیی سەردەمەکەیان نەناسیبێت.

پێم وایە ڕۆبرت برانینگ[30] باشترین نموونە بێت، هەر چەند سوورم لە سەر ئەوەی کە ئەو خۆشەویستییەی ئەو وێنای دەکات، مرۆڤ وەڕس و بێتاقەت دەکات.

«سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە تەنانەت بە بچووکترین بەندەکانیشی
ڕۆحێکی دوودەمەی وەک شمشێری پێ بەخشیوە و
ڕۆحێک بۆ قوربانیکردن لە شەڕگەی خۆشەویستیی پاک و بێگەرددا».

واتە بە گشتیی ململانێ و کۆڵنەدان، تاقە ڕێگای پراکتیکیی ئەوانە. بە ڕاست بۆچی؟ بە باوەڕی برانینگ دنیا چەوسێنەرە (واتە زاڵمە)، بەڵام من پێم وایە دنیا بەها و بایەخی ئێمەی دەرک نەکردووە و ئیدیعاکەمان لێ قبووڵ ناکات. دنیا جووت و هاوتای ئێمە نییە کە هەمیشە لە ئاست ڕەفتار و هەڵسوکەوتەکانماندا نەرمونیان بێت و نەرمیی بنوێنێت. ڕەنگە لە کۆمەڵگادا دوو هاوسەری وەک برانینگ و خێزانەکەی هەبن کە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ

---

٢٧ - فرمانی حەفتەم: ڕێپێنەدان بە زیناکردن، یەکێکە لە دە فرمانی تەورات.

٢٨ - فرمانی شەشەم: ڕێپێنەدان بە دزیکردن، یەکێکە لە دە فرمانی تەورات.

٢٩ - شاژن ڤیکتۆریا لە ١٨٥٠وە تا ١٩٥١ دەسەڵاتداریی بەریتانیای بە دەستەوە بوو.

٣٠ - Robert Broening؛ ١٨١٢ – ١٨٨٩ی. ز؛ شاعیری بەریتانیایی کە شێعرگەلێکی دڵبزوێنی هەیە. بەرهەمەکانی بریتین لە: **پۆلین** (١٨٣٣، **بارا سلۆس**(١٨٣٥)، **پیاوان و ژنان** (١٨٥٥)، **کەسێتییەکانی دراما** (١٨٦٤) و چەند بەرهەمی دیکە.

یەکدیدا زۆر باش بێت. لە ڕاستییدا ئەوە زۆر باشە هەمیشە کەسێک لە تەنیشتمانەوە هەبێت کە پەسنی ڕەفتارە ڕەوا و ناڕەواکانمان بدات، بەڵام ئەمە شتێکی نەپۆڕە، یان لانیکەم شتێکی گشتیی نییە.

بێگومان کاتێک فیتزجراڵد[31] بەوپەڕی ئازایەتییەوە خۆی لە پیاهەڵدان و ستایشکردنی ئۆراڵی[32] دەدزێتەوە، دەکەوێتە بەر ڕەخنە و لۆمەی "برانینگ"ەوە. من پێم وا نییە سڕینەوەی یەکجارەکیی ڕەخنەگرتن لە نێوان دوو کەسدا باش و بەسوود بێت، چوونکە وەها سڕینەوەیەک لە ترسی قامچییەکانی ڕەخنەوە سەرچاوە دەگرێت و لە ڕاستییدا بە سڕینەوەی تەواوەتیی ڕەخنەگرتن، پەناگەیەک بۆ خۆمان دەدۆزینەوە بۆ هەڵاتن لە ساردوسڕیی و قێزەونیی ڕەخنەی بێلایەن.

دڵخۆشیی زۆربەی بەساڵاچووە خانەنشینە ڕەبەن و بێ هاودەمەکانیش شتێکی لەو جۆرەیە. بەشێک لە تەمەنی من لە سەردەمی "ڤیکتۆریا"دا تێ پەڕیوە و بە تەواوەتییش ناکەومە ڕیزی ئەو تاکە پێشکەوتنخوازانەی کە بەڕێز کراچ وەسف و وێنایان دەکات. بەڵام بە هیچ شێوەیەک باوەڕی خۆم بەرامبەر بە ئەڤین و خۆشەویستیی لە دەست نەداوە.

با ئەم ڕوونکردنەوەیەش بکەم ئەو جۆرە خۆشەویستییەی کە من مەبەستمە و باوەڕم پێی هەیە هەمان ئەو خۆشەویستییە نییە کە خەڵکی سەردەمی ڤیکتۆریا بە بەژن و باڵایدا هەڵیان دەدا. خۆشەویستیی من، خۆشەویستییەکی سەرکەش و بەخەبەرە. لە هەمان کاتدا کە هۆکاری بەختەوەریی و سەرکەوتنە، مسۆگەری بێتاوانیی و فەرامۆشیی ناکات و خۆی وەک شتێکی پاک و بێگەرد و پیرۆز هەڵ ناکێشێت. جیاوازیی ئەم خۆشەویستییە لەگەڵ ئەو خۆشەویستییەی کە لە سەردەمی "ڤیکتۆریا"دا پەسەند و ڕەوا بووە، لە دەرکردنی حوکمی ڕێپێنەدانی پێوەندیی سێکسییەوە سەرچاوە دەگرێت. خەڵکی سەردەمی ڤیکتۆریا باوەڕی تەواویان بەوە هەبوو کە پێوەندیی سێکسیی، هەمیشە تاوان و گەندەڵیی لێ دەکەوێتەوە و هەر

---

٣١ - Fitzgerald؛ فرانسیس سکات فیتزجراڵد؛ ١٩٨٦ – ١٩٤٠ی ز؛ لە شاری "سێنت پاڵ"ی ئەیالەتی مینیسووتا لە دایک بووە. دوای تەواوکردنی زانکۆ بە نیوەناچڵیی، پەیوەست بوو بە سوپای "ئەمریکا"وە. هەندێک لە بەرهەمەکانی بریتین لە: **لە گۆتسبی مەزنەوە، شەو دڵبزوێنە، ئەمبەری بەهەشت، جوان و نگریس.**

32 - Auroraleigh

بە مەبەستی داکۆکیکردن لەم باوەڕەیان بوو کە ناو و تاتۆرە و ئەدگارگەلی ناشیرینیان دەخستە پاڵ خۆشەویستەکانیان. لەو سەردەمەدا حەزی سێکسیی (پێوەندیی سێکسیی) زۆر لەم سەردەمەی ئێمە زیاتر بووە و هەر ئەوەش وای لێ کردبوون هێندەی بۆیان بکرێت خۆیانی لێ دوور بخەنەوە و تەحەمولی ئەنجام نەدانیشی بکەن.

ئێستا ئێمە لە ڕووی پرسە سێکسیی و پێوەندییە سێکسییەکانەوە، سەردەمێکی ئاڵۆز و شڵەژاو تێ دەپەڕێنین؛ سەردەمێک کە زۆرێک لە بنەما ئاکارییەکان و پێودانگ و ڕێسا تاقیکراوەکانی بە درێژایی مێژوو خراونەتە لاوە، بەبێ کە ڕێساگەلی باشتر و گونجاوتر و تازەتریان لە جێ دابنرێت. دیارە سڕینەوەی یاسا کۆنەکان بەبێ ئەوەی کە یاساگەلێکی تازەیان لە جێدا دابنرێت، بۆشایی بێ یاسایی و ئەویش هەمان شێوە بشێویی و ئاڵۆزیی لێ دەکەوێتەوە. لە لایەکی دیکەشەوە چوونکە نەستی ئێمە هێشتا حەزەکانی خۆی لە هەمبەر ڕێساکانی ڕابردوو لە دەست نەداوە و لە هەندێک ڕووەوە هێشتا گیرۆدەی ڕێساکانی ڕابردووە، لە کاتی بەرەوڕووبوونەوە لەگەڵ پرسە تازەکاندا، بەرانبەر جۆری مرۆڤ هەست بە نائومێدیی و بێهیوایی و پەشیمانیی و دڵپیسیی دەکات.

تا باسەکەمان هێندە بەرین و بەرفراوان نەبووە کە نەتوانین بە دروستیی ڕوونکردنەوەی بۆ بکەین، با لێرەدا ئەوە بڵێم من پێم وا نییە ژمارەی ئەو کەسانەی کە گیرۆدەی پێوەندییە سێکسییە نایاساییەکانن، هێندە زۆر بێت کە وەک پرسێکی جیدیی چاوی لێ بکەین؛ یان لانیکەم بەختەوەرانە لە زۆرێک لە کۆمەڵگاکاندا هێشتا ڕێساگەلێکی لەبار و پەسەند بۆ پێوەندییە سێکسییەکان لە ئارادان.

کەسانی دەرگیر لەگەڵ ئەو پرسەی سەرەوەدا، تایبەتمەندیی تایبەت بە خۆیانیان هەیە و دیارترینیان ئەوەیە کەسانێکی پڕدەنگ و هەرا و سەرکێشن. بە باوەڕی من ئەم کەسانە جەنجاڵییترین کەسانی ئەم سەردەمەی ئێمەن. بە باوەڕی من ئەگەر ژمارەیەک لە لاوانی سەر بە چینی دەوڵەمەندی سەردەمی ڤیکتۆریا لەگەڵ ژمارەیەک لە لاوانی هاوشێوەیان لەم سەردەمەی ئەمڕۆدا بەراورد بکەین، بۆمان دەردەکەوێت کە بەختەوەریی هەڵقوڵاوی خۆشەویستیی و باوەڕمەندیی قووڵ بە بەها باڵاکانی، زۆر لەوەی شەست ساڵی پێش زیاترە.

بۆ دۆزینەوەی هۆکارەکانی ڕەشبینیی هەندێک لە تاکەکان، دەتوانین یەکسەر بڵێین سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ دەسەڵاتداریێتیی چەوسێنەرانە و ملهۆڕانەی ئەندێشە کۆنەکان لە نەست و ناخی ئەم کەسانەدا. ئەمانە بە شێوەیەکی نەخوازراو بە دەست ئازارگەلێکەوە دەناڵێنن کە خۆشیان نازانن چین؛ بە واتایەکی ڕوونتر دەتوانین بڵێین دۆخە نابارەکەیان هەڵقوڵاوی نەبوونی ڕێساگەلێکی پەسەند و شیاوی ئاکارییە، کە ناتوانن لە کاتی بەرەوڕووبوونەوەیدا ڕەفتاری خۆیان جێگیر و هاوسەنگ بکەن.

هێز و توانای ئەوان لە بزمارێکی پۆڵا دەچێت کە لە سەر زەوییەکی شل و هەرۆڵدا داکوتراوە و لە ئاکامدا و پاش چەند سانتیمەتر ڕۆچوون بە ناو زەویی هەرۆڵدا نەک تەنها ناتوانێت درێژە بە ڕۆچوونەکەی بدات بەڵکوو بەوپەڕی سەرسووڕمانەوە دەبینین کە لار دەبێتەوە. لە دۆخێکی ئاوادا ئەگەر نەتوانین شێمانەی ئەوە بکەین کە بزمارەکە بەرەوڕووی بەرد بۆتەوە، بێگومان تووشی سەرگەردانیی دەبین و ناتوانین هۆکارەکەی بدۆزینەوە و متمانەشمان بەو بزمارە پۆڵایە لە دەست دەدەین.

بە هەر حاڵ شیوەن و گریان بۆ وێرانەکانی کۆشکی ڕابردوو، ڕێگەچارە نییە. باشترین و ئاقڵانەترین ڕێگەچارە، قبووڵکردنی ئازایانەی پلان و ڕێوشوێنێکی نوێ و بڕیارێکی شێلگیرانەیە بۆ بەرەوڕووبوونەوەی ئەو وەهمپەرستییەی کە لە حەشارگە تاریکەکاندا خۆی لە بۆسە ناوە و ڕوخساری دەر ناخات. هەر ئەم ڕوخسار شاردنەوەیە، قووڵایی ترسەکە زیاتر دەکات و دەبێ چرا بە دەست بچینە ناو حەشارگەی ئەم زەبەلاحە وەهمیی و نادیارەوە. دەبێ بنەما ناڕاستەقینە یان لانیکەم بێسوودەکان، لە ژێر تیشکی ئاگایی و ئیرادەدا شی بکرێنەوە و هەڵاوێردرێن و فڕێ بدرێن.

پێناسەکردنێکی تەواوەتیی «بەها و بایەخ» لە مانایەکی بەرین و بەرفراواندا و بە تایبەت لە چوارچێوەی خۆشەویستیدا کارێکی هێندە ئاسان نییە. بە واتایەکی ڕوونتر، ئەستەمە بتوانین پێناسەیەکی ڕوون و ئاشکرا سەبارەت بە بەها و بایەخدان بە بابەتێکی هاوکێشی (هاوتەرازی) خۆشەویستیی بە دەستەوە بدەین. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوپەڕی هەوڵی خۆم دەخەمە گەڕ ئەم کێشەیە چارەسەر بکەم و قسەیەک بکەم کە خۆشم دەزانم وتنی هێندە ئاسان نییە:

یەکێک لە هۆکارەکانی «بەها و بایەخی» خۆشەویستیی، ئەوەیە کە خۆشەویستیی خۆی بە تەنهایی سەرچاوەی هەموو ئەو خۆشیی و چێژانەیە کە هەم ڕواڵەتێکی دەرەکیی هەیە و هەم ڕواڵەتێکی ناوەکیی.

«ئای خۆشەویستیی...!
بۆچی ئەو بوختانانەت بۆ هەڵ دەبەستن؟
بۆچی هەمو جۆرە تۆمەتێکت لێ دەدەن؟
بۆچی بەردەوام دەت چەوسێننەوە؟
بۆچی بە فێڵەوە دەڵێن:
شیرینیی خۆشەویستیی وەکوو ژەهری هەلاهل وایە!
زۆر گرانبەهایت، دەزانم
بەڵام سەرم لەوە سووڕ ماوە بۆچی گیرفان بەتاڵەکان
لە جیاتی ئەوەی کە قەدر و بەهات بناسن، خۆیان بە کەم دەزانن
کاڵترین میوەی تۆ
لە شیرینترین میوەکانیش شیرینترە
بەڵام کوا چێژێکی ساغ و تەندرست و بێ کینە؟!».

❊❊❊

شاعیرێک کە ئەم دێڕە جوانە پڕ لە گلە وگازندانەمان لێ خوێندەوە، نە بە دوای دۆزینەوەی نهێنیی جیهان و خیلقەتدا بووە و نە توانیوێتی لە ناو ئەندێشە بێکۆتاییەکانی خوادا پیاسە بکات و نە لە لایەنە نەپۆڕەکانی ئەندێشەی خوا تێ بگات. دڵنیاشم لەوە کە بە دوای دۆزینەوەی کلیلی «کائینات»یشدا نەبووە تا لانیکەم دڵی خۆی پێ خۆش بکات و، ئەو شێعرەشی بۆ ئەو مەبەستە نەهۆنیوەتەوە.

ئەو بەهاکانی خۆشەویستیی دەناسێت و دەزانێت لە چ پلەیەکدایە و گلەیی لەوە دەکات بۆچی نەزانەکان وازیان لە سەرچاوەی هەموو چێژەکان هێناوە و جەخت لە سەر بەشێکی دەکەنەوە کە بە هۆی ناتەوانییەوە فەرامۆشیهێنەرە.

ڕەنگە وا باشتر بوایە بەشە فەرامۆشیهێنەرەکەی خۆشەویستیی، بەم جۆرە ڕوون بکەینەوە کە نەبوونی خۆشەویستیی، بوار بۆ خەم و خەفەت دەڕەخسێنێت.

بە باوەڕی من نەک تەنها دەبێ ڕێز لە خۆشەویستیی بگرین بەڵکوو دەبێ بە سەرچاوەی هەموو چێژە باڵاکانی لە قەڵەم بدەین. مەگەر چێژەکان بە بەهایەکی هێندەی شێعر و مۆسیقا، لە خۆشەویستییەوە سەرچاوە ناگرن؟ خۆشەویستیی، واتایەکی دیکە بە هەڵاتنی ڕۆژ و خوڕەی هەڵدێر و ئاوابوونی خۆر لە کوێستانەکان و مانگەشەوی دەریا و... دەبەخشێت. بە بێ لافلێدان، خۆشەویستیی، جوانییەکان بە هێز و گەورەیی و مەزنایەتیی دەڕازێنێتەوە.

پیاوێک کە هەرگیز دەرکی بە ئاخافتنی ئەڤیندارانە لەگەڵ ژنێکدا نەکردووە و شان بە شانی ڕەفتار و وتە ئاشقانەکانی چێژی لە دیاردە دڵڕفێنەکان نەبردووە، هیچ ئاگای لەم کانییە ژیانبەخش و سیحراویی و سەرچاوەی هێز و تواناییە نییە.

بێجگە لەو شتانەی کە سەبارەت بە هێز و توانای خۆشەویستیی باسم کرد، دیسانەوە جەخت لە سەر ئەوە دەکەم توێژە سەخت و لە پۆڵایینەکانی خۆپەرستیی، تەنها و تەنها بە نەرمونیانیی خۆشەویستییماڵیی دەکرێن و سەهۆڵە هەمیشەییەکانی دەتوێنرێنەوە.

خۆشەویستیی جۆرە هاوکاریی و لێک تێگەییشتنێکە بۆ بەقا و مانەوە. هاوکاریی لەم قۆناغەدا بەو واتایەیە کە هەر دوو لایەن، هەست و جۆشیان بەرامبەر بە یەکدیی هەبێت و پێداویستییە عاتیفیی و سۆزاوییەکانی یەکتریی دەستەبەر بکەن. خۆشەویستیی تەواوکەر و کامڵکەرە.

لە سەردەمە جۆراوجۆرەکاندا، جیهان چەندین جۆر فەلسەفەی بە خۆیەوە بینیوە کە زۆربەیان خاوەنی بەهاگەلێکی زۆر بەرز و باڵا بوونە و هەندێکیشیان بەهایەکی ئەوتۆیان نەبووە. لە ناو بیروڕا و فەلسەفە پێشکەشکراوەکاندا، چەند تیۆرێکی فەلسەفیی لە سەر بنەمای گۆشەگیریی و خۆ پەراوێزکردن خراوەتە ڕوو، کە هەندێکیشیان ماونەتەوە.

ڕەواقییەکان[٣٣] و مەسیحییەکانی سەردەمانی ڕابردوو، لەو باوەڕەدا بوون کە مرۆڤ دەتوانێت تەنها بە پشتبەستن بە خۆی و بە ئیرادەی خۆیەوە، بەبێ یارمەتیی دیتران (یارمەتیی

٣٣ - Stoicism؛ ڕەواقییەکان لەو باوەڕەدا بوون کە زانین (مەعریفە) تەنها بە کەڵکی دەسنیشانکردنی ڕاسپاردەکانی ژیان و دەستووورە ئاکارییەکان دێت و نەیان دەویست کەڵکی زانستییانەی لێ وەربگرن. بناغەدانەری قوتابخانەی ڕەواقیی،

مرۆیی)، گەورەترین و زیاترین بەختەوەرییە مرۆییەکان دەستەبەر بکات. تەنانەت هێندە زێدەڕۆییشیان لەو باوەڕەیاندا دەکرد کە دەیانوت مرۆڤ بەبێ یارمەتیی کەسانی تر و تەنها بە پشتبەستن بە هێز و ئیرادەی خۆیەوە دەتوانێت بە بەختەوەرییەک بگات کە شایستەی مرۆڤە.

ژمارەیەک لە گەڵاڵەکەرانی هەر ئەم تیۆرە فەلسەفییانە، «هێز»یان بە لووتکەی «بوون» دەزانی و ژمارەیەکیش بەدەستهێنانی چێژە تاکەکەسییەکانیان بە دڵخوازترین شت لە قەڵەم دەدا. بەڵام بە گشتیی سەرجەم بیروڕا فەلسەفییەکانی پشتئەستوور بە چەمکی گۆشەگیریی و خۆتەریککردن، گوزارشت لە توانایی و لێهاتوویی مرۆڤی ئەبستراکت دەکات. ئەم فەلسەفانە دەڵێن هەموو کەسێک دەتوانێت بە تەنیا و بۆ خۆی بەختەوەر بێت و لەم بارەوە پێویستی بە کۆمەڵگا مرۆییەکانی تر نییە.

بە باوەڕی من ئەم بیروڕا و بۆچوونانە نەک تەنها بێبایەخ، بەڵکوو پووچەڵیشن چوونکە جیا لە دژایەتیی لەگەڵ بنەما ئاکارییەکاندا، دژی پاڵنەر و داخوازە پەسەندەکانی مرۆڤیشن.

بە باوەڕی من مرۆڤ بەبێ هاوکاریی و هەرەوەزیی، هیچ واتایەکی نییە و ئەگەر توانای خۆ گونجاندن لەگەڵ هاوڕەگەزەکانی خۆیی نەبێت، ئەوا بوونەوەرێکی نوقسان و ناتەواوە. بە هۆی خۆشەویستیی بەرامبەر کۆمەڵەوەیە کە پاڵنەرە جەوهەرییەکان لە دایک دەبن. خۆشەویسیی، یەکەمین و ئاساییترین شێوازی هەستە، کە بەکۆمەڵایەتیبوون و هەرەوەزیی و یەکبوونی لێ دەکەوێتەوە. کەسانێک کە کەم تا زۆر خۆشەویستییان تاقیی کردۆتەوە ناتوانن دان بە ڕەسەنایەتیی فەلسەفەیەکدا بنێن کە جەخت لە سەر گۆشەگیریی دەکات. هەرگیز هیچ مرۆڤێک کە ڕوخساری خۆشەویستیی بینیبێت، ناتوانێت ئەوە قبووڵ بکات کە پێی بڵێن چاوەکانت بە ڕووی جوانیی و بەهاکاندا دابخە تا لە تاریکایی نەبینیندا بەختەوەر و کامران بیت. مرۆڤ جیایە لەو دیاردانەی کە خۆشەویستییان بەرانبەر دەنوێنێت.

بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتری بابەتەکە دەبێ باسی سۆز و عاتیفەی دایک و باوکانیش بکەین، هەر چەند دەزانین ئەم سۆز و هەستانە قۆناغێکی باڵای خۆشەویستین. هەست و سۆزی دایک و باوک لە ڕاستییدا شێوازێکی تەواوکراوەی خۆشەویستییە کە لە پێوەندیی

"زنوون" ی خەڵکی قیبرس بوو (٣٣٦ – ٢٦٤ی پ. ز)؛ لە بەر ئەوە پێیان وتوونە ڕەواقیی کە وانەکانی پەروەردە و ڕاهێنانیان لە یەکێک لە ڕەواقەکانی شاری ئەسینادا بەڕێوە دەچوو.

لەگەڵ منداڵدا پێک دێت. ئەڵبەتە با ئەوەش بڵێم خۆشەویستیی لە شێواز و فۆرمە جوان و دڵخوازەکەیدا شتێکی دەگمەنە و بە کەمیی بەر چاو دەکەوێت، چوونکە کەسانێک کە لەم نیعمەتە بەهرەمەندن پێیان وایە هەمووان لە ئاستی ئەواندان و پێودانگی داوەریکردنیشیان ئەو ئاستە خۆشەویستییەیە کە خۆیان هەیانە.

ناتوانم نکوڵیی لە باوەڕی خۆم بکەم کە خۆشەویستیی هۆکاری خولقاندنی ئاسەوارگەلێکە کە ئەگەر خۆشەویستیی نەبوایە پێک نەدەهاتن یان لانیکەم خۆشەویستیی کاریگەریی لە سەر جەوهەر و کرۆکیاندا هەیە.

بە ڕاشکاوانە دەڵێم ئەگەر خۆشەویستیی نەبوایە، زۆرێک لە ئاسەوارەکان قابیلی تێگەییشتن نەبوون و نەک تەنها دەرک بە بەها و بایەخیان نەدەکرا بەڵکوو دەرکیان بە پلە و پێگەشیان نەدەکرا. ئەگەر چی لایەنگرانی ئەو جۆرە فەلسەفانەی کە لە ئاست تێگەییشتنی خۆشەویستییەکی ئاوادا ناتەوانن، ڕەنگە لایەنگرانی تیۆری **گرینگیی خۆشەویستیی،** بە فەلسەفەی ڕەشبینیی[٣٤] تۆمەتبار[٣٥] دەکەن و ئەوەش لە کاتێکدایە کە ئەوان دەبێ ناتەوانیی خۆیان تۆمەتبار بکەن و لێپێچینەوەی لەگەڵدا بکەن، چوونکە تێگەییشتنیان ئەگەر نەڵێم ڕقاویی (ڕقئاسا)یە، لانیکەم بە دڵنیاییەوە هەڵەیە.

«خۆشەویستیی پاک و بێگەرد
خۆشەویستیی پوختە و لە ئێڵەک دراو
حەقیقەتی خۆشەویستیی
ئاورگەیەکە هەمیشە ڕووناکە
و هەرگیز ناکوژێتەوە
بڵێسەیەکی سەرکەش و نەمرە
هەمیشە لە ناو دڵدا دەسووتێت و دڵ ناسووتێنێت

٣٤ - Skeptic؛ لایەنگری فەلسەفەی ڕەشبینیی، لایەنگریی قوتابخانەی گومانکاران.
٣٥ - Skepticism، فەلسەفەی گومانکاریی؛ فەلسەفەیەک کە پێی وایە بەدەستهێنانی زانین و مەعریفەی ڕاستەقینە هەرگیز لە تواناداا نییە و زانستەکانی مرۆڤیش نایەنە دی و ناتوانین لە ڕووی فەلسەفییەوە هیچ حەقیقەتێک لە سەر حەق بزانین.

هەرگیز لە گوڕ و تین ناکەوێت
ئەوینی پاکژکراو، هەرگیز ناچێتە میوانیی مەرگەوە
ئاگری ئەڤینی بەردەوام
بەردەوام ئاگرە
سەرد نابێتەوە و ناگۆڕدرێت».

***

لێرەدا منیش هەمان ئەو شتە دەڵێمەوە کە بەڕێز کراچ دەیڵێت؛ بەو جیاوازییەوە کە ئەو بە خەم و خەفەتەوە و بە شێوازی خەمنامە لەگەڵ پرسەکەدا هەڵسوکەوت دەکات. من لەو ڕووەوە لەگەڵتدا هاوڕام کە کتێبی "**ڕۆحەکان**"ی ئیبسن[٣٦] هاوشانی **لیرشا**[٣٧] نییە.

هیچ هێزێکی دەربڕین و هیچ تەکنیکێکی وتەبێژیی نەیدەتوانیی پێگە و جێگەی ئیبسن و شکسپیر[٣٨] بخاتە یەک ڕیزەوە و بە واتایەکی ڕوونتر، هیچ فێڵێک نەیدەتوانیی شکسپیرێکی دووهەم لە ئیبسن چێ بکات، چوونکە بەرهەمەکانی شکسپیر تەژین لە چەمکگەلی مرۆیی و ئەم چەمکانەش کە دەرخەری ورووژان (هەیەجان)ە مرۆییەکانن، بە هزری ئیبسن و هاوچەرخەکانی نامۆ بوون.

بە درێژایی چەندین سەدە بە هۆی ئەو هەموو ڕووداوانەی کە بە سەر مرۆڤدا هاتووە، خوا و مرۆڤ و سرووشت تا ڕادەیەکی زۆر گۆڕانیان بە سەردا هاتووە. ئەویش نەک لە بەر ئەوەی کە بایەخ و کارکردی باوەڕەکانی پابەند بە فەلسەفەی ڕیالیستیی هونەری نوێ، لە ناو

---

٣٦ - Ebsen؛ هێنریک ئیبسن ١٩٠٦ – ١٨٢٨ی ز؛ درامانووسی گەورەی نەرویژیی و داهێنەری جیهانی تیاتر کە باوکی نەرویژیی و دایکی ئەڵمانیی بوو. بەرهەمە بەناوبانگەکانی بریتین لە: **کۆمیدیای خۆشەویستیی**، **داخ**، **بنەماکانی کۆمەڵگا**، **خانووی بووکەشووشە**، **ڕۆحەکان و مراویی (سۆنە) وەحشیی**.

٣٧ - واتە "لیر"ی پاشا. و.ک.

٣٨ - Shakespeare؛ ویلیام شکسپیر (١٦١٦ - ١٥٦٤)؛ گەورەترین شاعیر و درامانووسی بەریتانیا و یەکێک لە بلیمەتە ئەدەبییەکانی جیهان کە بێجگە لە نووسینی شانۆنامە، ئەکتەر و دەرهێنەری شانۆش بووە. دەتوانین شانۆگەرییەکانی شکسپیر بە سەر تراژێدیی و کۆمێدیی و مێژوویدا دابەش بکەین. بەرهەمە بەناوبانگەکانی بریتین لە: **خەونی نیوەشەوی هاوین**، **ڕۆمیۆ و ژولییێت**، **ئۆتێللۆ**، **مەکبێس**، **ژوولی سیزار**، **بازرگانی ڤێنیزی**، **ئانتوان و کلیۆپاترا**، **گەردەلوول**، **هاملێت**، **لیرشا** و...

ئاسەوار و بەرهەمی هونەرمەندەکاندا کاڵ بووبێتەوە بەڵکوو لە بەر ئەوە بوو کە پەستیی و زەبوونییەکانی ژیانی مرۆڤ، شێوازێکی بەرز و باڵاتری بە خۆوە گرت و خۆی خزاندە جێی گریمانە ڕیالیستییەکانەوە. کامڵبوونی ئەم تیۆرە ڕیالیستییانە، دنیای هونەری گرتەوە و لەوێدا پێگە و جێگەیەکی بۆ خۆی داگیر کرد.

گومان لەوەدا نییە تراژێدیا کلاسیکییەکان، کە دەرخەری خەم و خەفەت و ڕەنجی شازادەکانن، لەگەڵ سەردەمدا نایەنەوە و ئەمڕۆ ئەگەر بمانەوێت خەم و خەفەتی تاکێکی ناو کۆمەڵگا بە هەمان شێوە و شێوازی ڕابردوو وێنا بکەین، نابێ چاوەڕێی ئەوە بکەین کە هەمان کاریگەریی جارانی هەبێت. هۆکاری ئەم ناکاریگەرییەش ناگەڕێتەوە بۆ جۆری ڕوانینی ئێمە بۆ ژیان و کەموکوڕییەکانی، بەڵکوو پێچەوانەکەی تەواو ڕاستە؛ کەواتە ئێمە چیتر ناتوانین هەر لە خۆڕا کەسێک بخەینە ڕیزی پیاوە گەورەکانەوە، تەنها و تەنها لە بەر ئەوەی کە خاوەنی هەست و سۆز و عاتیفەی خەمهێنەر و دڵتەزێنە. بە واتایەکی دیکە هەموو خەڵکی جیهان دەبێ ئەوپەڕی خەم و خەفەتیان بە سەردا تێ بپەڕێت تا ژمارەیەکی کەمیان بتوانن پلە و پێگەیەکی بەرز و باڵا بە دەست بێنن.

شکسپیر دەڵێ:

«کاتێک هەژارێک دەمرێت

تەنانەت ئەستێرەیەکیش بە ئاسمانەوە نابینرێت

بەڵام بۆ مەرگی دەوڵەمەندان، ئاسمانیش بە هەورەتریشقەوە پرسەیان بۆ دەگرێت».

ئەگەرچی لە سەردەمی شکسپیردا ئەم جۆرە هەستانە بە تەواوەتیی پەسەند و قبووڵکراو نەبوونە، بەڵام لانیکەم دەرخەری باوەڕێکی باوی ناو کۆمەڵگا بووە. بە ڕاشکاوانە ئەمەش بڵێم "شکسپیر"یش خۆی ئەو جۆرە بیرکردنەوەی بە دڵ بووە. چوونکە لە بەرهەمەکانیدا دەبینین کە مەرگی "سینا"ی شاعیر، پێکەنیناوییە، بەڵام مەرگی **سیزار**[٣٩] و **برۆتۆس** و **کاسیۆس**[٤٠] خەمهێنەر و دڵتەزێنە.

---

٣٩ - Juluis Caesar؛ ژوول سیزار، سەرداری بەناوبانگی ڕۆمیی کە خزمەتی زۆری وڵاتەکەی خۆی کرد و سەرەنجام لە ئەنجومەنی سەنای ڕۆمدا بە دەستی سیناتۆرەکان کوژرا. ساڵی ٥٤ی پێش زایین هێرشی کردە سەر بەریتانیا و ساڵی ٤٧ی پێش زایین چووە ناو «ئەسکەندەرییە» و «بەتلیمووسی دوانزەهەم»ی لەناو برد.

ئەمڕۆکە چیتر مەرگی دیتران — هەر کەسێک بێت - لە بەر چاوی ئێمەدا ئەو کاریگەرییە سیحراوییەی ڕابردووی نییە. چوونکە ئێمە ئێستا نەک بە ڕواڵەت بەڵکوو لە ناخەوە و لە قوڵایی دڵەوە بووینەتە لایەنگری کۆمەڵانی خەڵک و دیارە شتێکی ڕاستیشە. زۆربەی تراژێدییەکان بە دەوری ڕێبەرانی کۆمەڵگادا دەسووڕێنەوە و تاکە ئاساییەکان شوێنێکی ئەوتۆیان تیایاندا نییە. لەم بارەوە دەتوانین ئاماژە بە کتێبی **کۆمەڵانی خەڵک و تاکەکان** نووسینی ئێرنێست تۆیلەر[٤١] بکەین. ئەڵبەتە نامەوێ بانگەشەی ئەوە بکەم کە ئەم کتێبە هاوشانی بەرهەمە بەرجستەکانی سەردەمانی پێشووە بەڵام پێم وایە لە ڕووی بابەتەوە دەتوانین لەگەڵیاندا بەراوردی بکەین و بە کتێبێکی بەنرخ و قابیلی لێوردبوونەوەی بزانین کە پێوەندیی بە دەرک و تێگەییشتنەکانی ئەم سەردەمەوە هەیە. لەم کتێبەدا بەرەوڕووی قارەمانێکی پەسەند و پیاوچاکین و، بە وتەی ئەرەستوو:

ڕۆحی خوێنەر بە ترساندن و تۆقاندن پاکژ دەکاتەوە.

چەند نموونەی تریش لەم جۆرە تراژێدیایە هەن کە هەر چەند بە ژمارە زۆر کەمن، بەڵام بۆ سەلماندنی بیروڕاکانی ئێمە بەسن.

هەر چۆنێک بێت دەبێ ڕێوشوێن و شێوازە کۆنەکان بخەینە لاوە، بەبێ ئەوەی کە ئەو هەلە بۆ نوێخوازەکان بڕەخسێت هەمان ئەو تراژێدییانە بە دەستەواژەگەلی ئەمڕۆژیی دەرخواردمان بدەن. نووسەر بۆ نووسینی تراژێدیایەک خەم و خەفەتێکی شیاوی تراژێدییەکە هەست پێ بکات و بۆ دەرک پێکردن و هەست پێکردنی تراژێدیای سەردەمی خۆی، دەبێ نەک تەنها لە ڕووی فکرییەوە بەڵکوو بە هەموو گیانییەوە بارودۆخی ئەو شوێنەی کە تیایدا دەژیت بناسێت و لێی بە ئاگا بێت.

بەڕێز کراچ لە سەرتاپای کتێبەکەیدا باس لە بێهیوایی و نائومێدیی دەکات و قسە بوێرانەکانی سەبارەت بە جیهان و بێدەرەتانیی مرۆڤ، بە تەواوەتیی خوێنەر دەخاتە ژێر کاریگەریی خۆیەوە، بەڵام سەبارەت بە نووسینەکانی کراچ دەبێ بڵێین ئەم هەستکردن بە بێدەرەتانییە، لەم حەقیقەتەوە سەرچاوە دەگرێت کە زۆربەی ئەدیبان هێشتا فێری ئەوە نەبوونە چۆن لە بەرانبەر پاڵنەرە نوێیەکاندا، لە ورووژان (هەیەجان)ە کۆنەکان تێ بگەن.

٤٠ - Cassius و Brutus؛ دوو کەس لەو سیناتۆرانەی کە لە پلانی کوشتنی ژوول سیزاردا دەستیان هەبوو.
٤١ - Ernest Toller؛ ١٩٣٩ – ١٨٩٣؛ درامانووسی ئەڵمانیی.

پاڵنەر و شتە ورووژێنەرەکان هێشتا نەمردوون و بوونیان هەیە، بەڵام زۆربەی نویسکار و ئەدیبان بە هۆی پچڕانی پێوەندییان لەگەڵ ژیانی ڕاستەقینەدا ئەم پاڵنەرانە ناناسن و ئەگەر بەرەوڕوویان ببنەوە وەکوو نەناسراوێک مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەن و خۆیانیان لێ گێل دەکەن. ئەوە لە کاتێکدایە کە ئەگەر بڕیار بێت هەستە ڕاستەقینەکانی تاکەکان چ لە ڕێگەی تراژێدیی، یان شێوازەکانی تری داهێنانی ئاسەوارە بەنرخەکانەوە چاکسازییان تێدا بکرێت، دەبێ خولقێنەری بەرهەمەکە بە هەموو گیانییەوە و بە گۆشت و خوێنی خۆی هەستیان پێ بکات و بیانناسێت و لەگەڵیاندا بژیت. کاتێک کە بەختەوەریی و بەدبەختیی لە هەستەوە سەرچاوە دەگرن، کەواتە ناسینی شتێکی پێویستە.

لێرەدا دەبێ بەو گەنجە بەهرەمەندانەی کە وا هەست دەکەن لەم دنیایەدا کارێکی هێندە بەهادار و بەنرخیان پێ شک نابرێت ئەنجامی بدەن بڵێم:

«واز لە نووسین بێنن. هەموو هەوڵی خۆتان بخەنە گەڕ بۆ دوورکەوتنەوە لەو پاڵنەرەی کە بۆ نووسین پاڵتان پێوە دەنێت. پێ بنێنە ئەم جیهانە پان و بەرین و بێ سەر و بنەوە. خۆتان لە هیچ ئەزموونێک مەدزنەوە و ئەنجامی بدەن. هیچ گرینگ نییە جەردەی دەریا بن یاخود پاشای بۆرنیۆ[٤٢]، یان کرێکارێکی زەحمەتکێشی ناو ڕژێمێکی کۆمۆنیستیی، کە دەبێ بە کاری سەختی جەستەیی، وزە و هێزی خۆتان مەسرەف بکەن.

دیارە ئەم میتۆدە وەک فرمانێکی گشتیی دەر ناکەم، بەڵکوو زیاتر مەبەستم لەو کەسانەیە کە چڵەکە[٤٣] نەخۆشئاساکەی بەڕێز کراچ، هەموو بوونیانی داگیر کردووە.

پێم وایە ئەگەر چەند ساڵێک بەم شێوەیە تێ بپەڕێت، پیاوی ڕۆشنبیری دوێنێ لەوە تێ دەگات کە سەرەڕای هەموو هەوڵ و ماندووبوونەکانی، ناتوانێت ڕێ لە هەستی نووسین بگرێت و پێنووسەکەی هەر دەکەوێتە سەر پەڕەکان. کاتێک ئەو ڕۆژە هات، نووسراوەکەش وەکوو خولقێنەری بەرهەمەکە، شتێکی بێهوودە و بێ کەڵک نابێت.

---

٤٢ - Borneo؛ دوورگەیەکە لە دوورگەکانی ئۆقیانووسییە (ئۆسترالیا) کە خێڵی کایان تێیدا دەژین کە خێڵێکی سەرەتایین و ژیانێکی سەرەتایی و پڕ لە سیحر و جادوو دەژین. بەشی باکووری ئەم دوورگەیە داگیرکراوی بەریتانیایە و، بەشی باشووری سەر بە وڵاتی ئەندۆنزیایە.

٤٣ - ئەم وشەیەم لە جیاتی وشەی «هوشدار»ی فارسیی داناوە، بە واتای بەئاگاهێنانەوە و داچڵەکاندن. و. ک.

٣

## ڕكەبەرایەتیی

ئەگەر لە ئەمریکاییەک و بازرگانێکی بەریتانیایی پرسیار بکەن چ هۆکارێک زیاتر ڕێگە لە بەختەوەریی و چێژوەرگرتن لە ژیان دەگرێت، بێگومان دەڵێ: «ململانێ بۆ ژیان!».

بەردەنگی ئێوە بەوپەڕی خاکەڕایی و ڕاستگۆییەوە ئەم وەڵامەتان پێ دەداتەوە و باوەڕیشی پێ هەیە. بەڵام هەر ئەم وەڵامە ڕاستگۆیانە دەبێ لە ڕووی پێوەرە فکرییەکانی بێژەرەکەوە تاوتوێ بکرێت و شرۆڤەی لە سەر بکرێت.

بێگومان ژیانی هەموو کەسێک بە تایبەت ئەوانەی کە لە ڕووی باری ئابووریی و داراییەوە دۆخێکی لەباریان نییە، پڕە لە هەوڵ و ماندووبوون. بۆ نموونە باسی ژیانی فاک[٤٤] پاڵەوانی چیرۆکی "جۆزێف کنراد"تان[٤٥] بۆ دەکەم. فاک لە سەر پاپۆڕێکی ناو دەریا بە سەرگەردانیی ماوەتەوە و تەنها دووکەس [لە ناو پاپۆڕەکەدا] چەکی گەرمیان پێیە کە یەکێکیان ئەوە. بۆ مانەوە و درێژەدان بە ژیان، هیچ چارەیەکیان نییە بێجگە لەوەی کە گۆشتی سەرنشینەکانی تری ناو پاپۆڕەکە بخۆن. کاتێک ئەم دوو کەسە چەکدارە، ئەو خواردنەی کە پێشتر لە سەر دابەشکردن و خواردنی ڕێک کەوتبوون، تەواو دەبێت، خەبات و ململانێی ڕاستەقینە بۆ ژیان و مانەوە لە نێوانیاندا دەست پێ دەکات. دەرەنجامی کارەکە ئەوە

44 - Fock

٤٥ - Conrad؛ ١٩٢٤ – ١٨٥٧؛ نووسەری بەریتانیایی زمان، کە لە "ئۆکراین"دا و لە بنەماڵەیەکی بە ڕەچەڵەک "پۆڵۆنیایی"دا لە دایک بوو. هەندێک لە بەرهەمەکانی بریتین لە: **لە قووڵاییەکانی تاریکیدا**، **گەنجێتی**، **فاک**، **لۆرد جیم**.

دەبێت کە فاک سەر دەکەوێت و دەبێتە کەسێکی ڕووەکخۆر (گیاخۆر). لێرەدا باس لە ململانێیەک لە ئارادایە بۆ کەمترین پلەی ژیان واتە زیندوو مانەوە، بەڵام کاتێک ئەو بازرگانەی کە ئێوە پرسیاری لێ دەکەن و ئەویش وەڵام دەداتەوە »ململانێ بۆ ژیان»، قسەکەی لە ڕاستییدا دەرخەری واتایەکی دیکەیە.

ئەمە کە پێمان وابێت قسەکانی یەکێک لەو دوو کەسە هەڵەیە، یان بێبایەخە، شتێکی دروست نییە. چوونکە ئەوان بایەخیان بە شتێک داوە کە ڕەنگە لای ئێمە بەهایەکی ئەوتۆی نەبێت بەڵام بە گشتیی لای ئەوان بەهایەکی زۆری هەیە و لە بەر خاتری ئەو شتەش بووە ئەو ڕێگەیان هەڵبژاردووە.

ئەگەر لە بازرگان پرسیار بکەن «چەند کەس لە خزم و ئاشناکانی دەناسێت کە لە برسان مردوون؟» یان «سەرەنجامی خزم و کەسوکارەکانی لە پاش هەڵشکان (مایەپووچبوون) چۆن بووە؟ وەڵامێکی دیاریکراو یان لانیکەم کاریگەری لا نییە بیداتەوە، چوونکە ئاشکرایە کە ئاسوودەیی و خۆشگوزەرانیی بازرگانێکی هەڵشکاو، زۆر زیاترە لە هی ئەو کەسانەی کە هەرگیز ئاسوودە نەبوونە و تامی ئاسوودەییان نەچەشتووە و هیچیان نەبووە لە دەستی بدەن و هەڵ بشکێن.

«ململانێ بۆ ژیان» لای هەر کەسەو واتای تایبەتیی خۆی هەیە. بە گشتیی ململانێ بۆ ژیان، هەوڵدانە بۆ سەرکەوتن و، ئەو بازرگانەش کە ئێوە پرسیاری لێ دەکەن، خەمی ئەوەی نییە کە خواردنی ژەمی قاوەڵتوونی ڕۆژی دواتر چۆن دابین بکات، ڕەنگە مەبەستی ئەوە بێت کە نەتوانێت زیاتر لە ڕکابەر و کەسانی هاوشانی خۆی، سەرکەوتن بە دەست بێنێت.

ڕەنگە بۆ ئێوە شتێکی سەرسووڕهێنەر بێت ئەگەر باسی ئەوەتان بۆ بکەم کە تەنها ژمارەیەکی ئێجگار کەمی تاکەکان پێیان وایە هەرگیز ناتوانن لەو بارودۆخەی تێی کەوتوون ڕزگاریان بێت و هیچ ڕێگەیەکی دەربازبوونیان نییە. ئەوان نازانن کە هیچ ئامێرێکی تایبەتیی بوونی نییە کە سەرقاڵی گرفتارکردنی تاکەکان بێت. ئەمانە کەوتوونەتە سەر تایەیەکی بازنەیی گەورەوە کە بەردەوام دەسووڕێتەوە بەڵام چوونکە بەرزیی و نزمیی نییە، هەموو شوێنێکی بە لاوە یەکچەشن و یەکدەستە. ئەوە کە ئایا چۆن ئەوان توانیویانە لە سەر ئەو تایەدا هەڵ بکەن و بمێننەوە، لە بەر خاتری ئەوەیە کە تایەکە لە سەر خولگەیەکی ساف و

هەمواری ئاسۆییدا دەجووڵێتەوە و بە هیچ شێوەیەک ناشتوانێت لەوە بەرزتریان بکاتەوە. ئەڵبەتە مەبەستی من لەو کەسانەی کە لە سەر ئاستێکی ئاسۆییدا دەسووڕێنەوە، ئەوانەیە کە لە ڕووی بارودۆخی ژیان و باری داراییەوە لە ئاستێکی بەرزتردا لەنگەریان گرتووە. کەسانێکی ئاوا ئەگەر واقعبین بن دەتوانن بەو شتانەی کە هەیانە ژیانێکی ئارام و ئاسوودە تێ پەڕێنن بەڵام مانەوە لە پلەیەکی جێگیردا نەک بە لایانەوە باش نییە، بەڵکوو بە شەرمیشی دەزانن. ئەوان خۆیان لەم ڕاستییە دەدزنەوە — وەکوو هەڵاتن لە بەردەم دوژمنێک؛ لە کاتێکدا ئەگەر پرسیاریان لێ بکەن بەو کارەیان چ کەڵکێکیان بۆ کۆمەڵگا هەبووە و چ بەردێکیان ناوەتە سەر بەردێک، یان چ کێشەیەکیان چارەسەرکردووە، هیچ وەڵامێکی دروست و دیاریکراویان پێ نییە و، ئەوپەڕی، بۆ خۆدزینەوە لەو تەنگژەی کە ئێوە بۆتان دروست کردوون، دەست دەکەن بە دروشم دان و خستنەڕووی بەڵگەی نابەجێ و نەگونجاو.

لێرەدا بارودۆخی ڕۆژێکی ژیانی وەها کەسێک دەخەینە پێش چاو. ئێمە وای دادەنێین ئەم پیاوە خانوویەکی گەورە و هاوسەرێکی جوان و دەلال و چەند منداڵی خوێنشیرینی هەیە. سەرلەبیانییە و ئەندامانی تری بنەماڵە لە خەودان کە ئەم پیاوە لە خەو هەڵ دەستێت. بە پەلە و هەڵەشە خواردنی بەیانیی دەخوات و جلەکانی لە بەر دەکات و بە پەلە بەرەو فەرمانگە یان نووسینگەی کارەکەی دەکەوێتە ڕێ. لەوێدا هەوڵ دەدات هەڵسەوکەوت و ئەدگارە ئاکارییەکانی بەڕێوەبەرێکی بە ئەزموون و شارەزا بخاتە پێش چاوان. هەوڵ دەدات بە لێزانیی و کارزانیی و لێهاتووییەوە کارەکان ڕێک بخات؛ لێبڕاوانە و بە متمانە و باوەڕبەخۆبوونەوە قسە دەکات. هەوڵ دەدات لە کاتی قسەکردندا وریا بێت و ئاگای لە جووڵە و ئاماژەکانی خۆی بێت. ئەمە شێوازێکە بۆ کاریگەریی دانان لە سەر کەسانی دەوروبەری کەڵکی لێ وەردەگرێت. نامە ئامادە کراوەکان واژۆ دەکات و ئەو نامانەش کە دەبێ بنووسرێن حازر دەکات. چەندین پێوەندیی تەلەفۆنیی لەگەڵ کەسانی جۆراوجۆردا دەکات و نرخەکانی ناو بازار تاوتوێ دەکات. ئەم کارانە تا کاتی نانی نیوەڕۆ سەرقاڵی دەکەن. نانی نیوەڕۆش لەگەڵ چەند کەسێک لە ڕکابەرەکانی یان لەگەڵ کەسانێکدا دەخوات کە مامەڵەی لەگەڵ کردوون یان قەرارە مامەڵەیان لەگەدا بکات. دوانیوەڕۆشی بە هەندێک کاری هەر لەو چەشنە تێ دەپەڕێت و دواجاریش هیلاک و ماندوو دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە. هەر ئەوەندەش دەرفەتی

هەیە کە جلەکانی بگۆڕێت و خۆی بۆ خواردنی نانی ئێوارە ئامادە بکات. ئەو و کەسانی وەک ئەویش ناچارن وای نیشان بدەن لە هاوڕێیەتیی ژنەکانیان کە نان و خواردنیان بۆ ئامادە کردوون، چێژ دەبینن و حەزی پێ دەکەن. ژنەکان شەکەت نین و پەلەشیان نییە بۆ زوو تەواوکردنی شێو و دیارە ناتوانرێت دەسنیشان بکرێت خواردنی شێوێک چەند دەخایەنێت تاکوو پیاوی شەکەت و ماندوو، خۆی لەو دۆخە ڕزگار بکات و خۆی فڕێ بداتە ناو نوێنی خەوەوە. ئەگەر ڕاکشان لە ناو نوێندا دوایین کاری ئەم پیاوە بێت، بۆ چەند کاتژمێرێک لەو شەکەتییەی رۆژ و سەرەتای شەو ڕزگاری دەکات. بەڵام هەر چۆنێک بێت شەو و خەو دوایی دێت و ڕۆژێکی نوێ دەست پێ دەکاتەوە.

ژیانی کەسێکی ئاوا، زۆر لە حاڵەتی ڕۆحیی وەرزشکارێکی ڕاکردنی خێرایی دەچێت. چوونکە کەسی ڕاکەر دەبێ هێز و وزەی خۆی لەگەڵ قۆناغ و مەودا جۆراوجۆرەکاندا ڕێک بخات و بە شێوەیەکی بەرنامە بۆ داڕێژراو خۆی بگەیێنێتە هێڵی کۆتایی. ئەوە لە کاتێکدایە کەسی ڕاکەر کاتێک جەستەی گەرم بوو، بە هەموو هێزیەوە هەوڵ دەدات خێراتر بڕوات و پەیتا پەیتا وزەی زیاتر دەخاتە گەڕ و وای لێ دێت لە کۆتایی هێڵەکەدا کۆنترۆڵی خۆی لە دەست دەدات و تەنانەت ناتوانێت لە کاتی خۆیدا بوەستێتەوە. ئامانجی ئەو ئەوەیە کە تا سنووری مەرگ و تەنانەت تا خودی مەرگ ڕا بکات. خێرا و خێرا و خێراتر! تا کوێ؟ تا کاتێک کە هەناسە بڕ دەکات. لە کۆتاییدا وزە تەواو بووە و دۆخەکە زۆر ناخۆشە. پیاوی پێشبڕکێکەی ئێمەش کە ژیانی ڕۆژێکیمان خستە پێش چاو، سەبارەت بە منداڵەکانی چی دەزانێت؟ بە درێژایی حەفتە لە نووسینگەکەیدا کاری کردووە و ئەگەر کەسێکی تەندروست بێت، لەوانەیە ڕۆژی پشووی خۆی بە یاریی "گۆڵف"ەوە سەرقاڵ کردبێت. چی لە بارەی هاوسەرەکەیەوە دەزانێت؟ کاتێک بەیانییان ماڵەوە بە جێ دێڵێت، هاوسەرەکەی لە خەودایە و ئێوارانیش خۆی و ژنەکەی سەرقاڵی هەندێک کاروباری ڕووکەش و ڕۆتینن کە پێیان وایە کۆمەڵگا بۆی ئامادە کردوون. ئەم ڕۆتینانە ڕێگە لەوە دەگرن کە بتوانن دووبەدوو و بە تەنها چەند ساتێک قسە بکەن و قسەکانی دڵیان بۆ یەکتری هەڵڕێژن. ڕەنگە هاوڕێکانی هەر کامیان بۆ ئەوی تریان بایەخێکی هێندەیان نەبێت و بە ناچار دەبێ یەکتریی تەحەمول بکەن. ئەگەریش لەگەڵ چەند کەسێکدا هاوڕێیەتییەکی ئاسایی و مامناوەندییان هەیە،

پێوەندییەکەیان لەو ئاستەدا نییە کە حەز بە تۆکمەکردن و پتەوترکردنی بکەن. ئەم پیاوە شارەزایی لە سەر وەرزی بەهار هەر ئەوەندەیە کە چ کاریگەرییەک لە سەر بارودۆخی بازار دادەنێت. ڕەنگە سەفەری بۆ وڵاتانی تریش کردبێت، بەڵام بە دڵنیاییەوە ئەو سەفەرانەی هێندە بە دڵ نەبووە و چێژی لێ نەبینیون. خۆ سەرقاڵکردن بە کتێب بە کارێکی بێهوودە و لانیکەم بێ سوود دەزانێت. مۆسیقا نەک تەنها کەیفخۆشی ناکات بەڵکوو لە کاتی شەکەتییدا تەنانەت ئازاریشی پێ دەگەینێت.

بە تێپەڕینی زەمەن، ساڵ لە دوای ساڵ تەنیاتر و تەنیاتر دەبێت. سەرنجی دەچێتە سەر پرسێک و هەر لەوێدا دەمێنێتەوە. ژیان و کارەکەی بێڕۆح و یەکچشن دەبێت و بە تەنها بیر لە کارەکەی دەکاتەوە و هیچی تری بە لاوە گرینگ نییە و ژیان بەبێ کارەکەی هیچ واتایەکی نابێت. من کەسانێکی ئەمریکایی لەو جۆرەم بینیوە. یەکێکیانم لە بیرە کە تەمەنێکی مامناوەندیی هەبوو و لەگەڵ ژن و منداڵەکانیدا دەژیا. ئەندامانی بنەماڵە، ئەم پیاوە »بەدبەخت»ەیان هان دابوو مۆڵەت وەربگرێت و هەلێک بۆ کچەکانی بڕەخسێنێت کە دنیای دێرین ببینن. هاوسەر و کچەکانی، چواردەوریان گرتبوو و وەک بڵێی لە ناو زیندەخەودا بێت، سەرنجیان بەرەو شتانێک ڕادەکێشا کە بە لایانەوە سەرنجڕاکێش بوون.

بەڵام باوک هیلاک، ماندوو، بێتاقەت، بیر لەوە دەکاتەوە کە ئێستا لە فەرمانگەدا چی دەگوزەرێت و لە دنیای "بەیسن باڵ"دا چی ڕوو دەدات. سەیر لەوەدایە ژنەکەی لە بەر ئەو ڕۆحییە ژنانەیەی کە هەیبوو، دواجار بەو دەرەنجامە گەییشت کە هەموو پیاوان بێ زەوق و سەلیقەن، بەڵام هەرگیز بیری لەوە نەکردەوە کە مێردەکەی بۆتە قوربانیی تەماح و چاوچنۆکیی خۆی و هەروەها ئەوان. دیارە ئەم بیرۆکەیە هەرگیز بە مێشکی ژنەکەیدا ختوورەی نەدەکرد چوونکە بە لایەوە گرینگ نەبوو، وەک چۆن سووتاندنی ژنێکی هێندوو لە تەنیشت تەرمی مێردەکەیەوە، بۆ ژنێکی ئەورووپایی هیچ واتایەکی نییە و ناشتوانێت وێنای بکات. ڕەنگە لە هەر دە کەس، نۆ کەس بە حەز و ڕەغبەتەوە مل بەوە دەدات لەگەڵ مێردەکەیدا بیسووتێنن. واتە کاتێک ئایینەکەیان ئەو کارە بە ڕەوا دەزانێت، بێوەژنەکانیش بە شانازییەوە مل بەو جۆرە قوربانیبوونە دەدەن.

ڕێچکە و ڕێباز و ئایین و پاڵنەری شانازیکردنی پیاوێکی بازرگان، کۆکردنەوەی هەرچی زیاتری سەروەت و سامانە و کەواتە وەکوو ئەو بێوەژنە هیندووە، ڕەنج و ئازاری وەها شانازیکردنێک بە دڵ و گیان تەحەمول دەکات. بە باوەڕی من ئەگەر ئەم بازرگانە ئەمریکاییە بیهەوێت تامی بەختەوەریی بکات دەبێ پێش هەموو شتێک ئایین و ڕێچکە و ڕێبازی خۆی بگۆڕێت. ئەو تا کاتێک باوەڕی تەواوی بە ڕێبازی سەرکەوتن لە کار و کاسپیی و پیشەیەکی باڵادا هەیە، سەرەڕای هەموو سەرکەوتنەکانی، دیسان مرۆڤێکی بەدبەخت و تەنانەت قابیلی بەزەیی پێداهاتنەوەیە. چوونکە ژیانی تەژیی لە ورکە و دڵەڕاوکێ و، سەرقاڵبوونی مێشک بە پارە و دارایییەوە، ژیانێکی دوور لە نیشانەکانی بەختەوەرییە.

بابەتێکی ئاسایی وەکوو سەرمایەگوزاریی لە بەر چاو بگرن! زۆربەی هەرە زۆری ئەمریکاییەکان سەرمایەگوزارییەکی لە سەدا هەشت (٨%) قازانجیان - کە لەوانەیە زیانیشی تێدا هەبێت - پێ باشترە وەک لە سەرمایەگوزارییەکی لە سەدا چوار (٤%) بە قازانجی مسۆگەر. ئەوان لەم سەرمایەگوزارییانەدا چەندین جار بەرەوڕووی زیان دەبنەوە کە خۆی لە خۆیدا تووشی دڵەڕاوکێ و شڵەژاوییان دەکات. لە لایەکی دیکەشەوە ئەگەر تەنانەت تووشی زیان نەبن، دیسانەوە بەردەوام دڕدۆنگ و پەشۆکاون و لەوە دەترسن کە زیانیان بەر بکەوێت. دیارە ئەم هەلومەرجە تووشی خەم و خەفەت و دڵەڕاوکێیان دەکات. لە کاتێکدا ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ئەوان شتێکیان بۆ سەرمایەگوزاریی هەیە. من بەش بە حاڵی خۆم بێجگە لە ئاسایش و ئاسوودەیی هیچ شتێکم لە سەروەت و سامان ناوێت. بەڵام دیارە کەسێکی سەرمایەگوزار ئارەزووی شتی لەوە زیاتر دەکات — واتە شتێک زیاتر لە داخوازە مرۆییەکانی مرۆڤێکی ئەمرۆژیی. بەدەستهێنانی پارەی زیاتر لە چاو هاوڕێ و برادەرەکانی خۆی، سەربڵندیی و شان و شکۆیەکی زیاتر و بەرچاوتری بۆ بە دیاریی دێنێت. لەگەڵ ئەوەشدا چوونکە لە ئەمریکادا پێوەر و پێودانگە کۆمەڵایەتییەکان بەردەوام دەگۆڕدرێن و هەلومەرجەکانیش بێسنوورن، هەستی مادەگەرایی لە ناو ئەو مرۆڤانەدا کە خاوەنی ئەو هەستەن، لە چاو ئەو شوێنانەی کە نەزمێکی چەسپاوی کۆمەڵایەتییان تێدا جێگیر بووە، تووڕەتر و هەڵچوونانەترە. ئەڵبەتە دەبێ ئەوەش بڵێین کە ئەگەرچی سەروەت و سامان بە تەنها

بەس نییە بۆ ئەوەی کەسێک گەورە و شکۆمەند نیشان بدات، بەڵام گەورەیی و شکۆمەندیی بە گیرفانی بەتاڵ دەست نادات.

لە تێڕوانینی مادەگەرایانەدا بەدەستهێنانی پارە و سامان، ئاشکراترین نیشانەی هزری ڕووناک و لێهاتووی تاکە. پیاوێک کە پارەی زیاتر بە دەست دێنێت، کەسێکی مەزن و ئاوەزمەندە و کەسێک کە گیرفانی بەتاڵە، بە قەدەر پێویست خاوەنی ئەقڵ و ئاوەز نییە. دیارە کەس حەز ناکات خەڵکی تر بە گەمژە و نەزانی بزانن و پیاوە بازرگانەکەی [سەربوردەکەی] ئێمەش، کاتێک بەرەوڕووی بێسەروبەریی و ئاڵۆزکاویی بازار دەبێتەوە، هەست بە هەمان ورکە و دڵەڕاوکێ دەکات کە گەنجێکی خوێندکار لە کاتی تاقیکردنەوەکاندا تووش دەبێت.

هەر چەند ئەم بابەتە بۆ من بە ئاسانیی قابیلی هەستپێکردن نییە و هێندەش بە شتێکی لۆژیکیی نایەتە پێش چاو، بەڵام دەبێ دانی پێدا بنێم کە ترس لە دەرەنجامەکانی هەڵشکان، زۆربەی کات بازرگانەکان بەرەوڕووی ترس و دڵەڕاوکێ دەکات. ئارنۆڵد بێنت کلیهانجر[٤٦] دەوڵەمەندی بەناوبانگ کە سەروەت و سامانێکی ئێجگار زۆر و زەوەندی هەیە، هەمیشە لەوە دەترسا هێندە هەژار بێت کە لە شوێنی کارەکەیدا بمرێت. لەم بارەشەوە گومانم لەوەدا نییە تێپەڕاندنی قۆناغی منداڵیی بە هەژاریی، دەبێتە هۆی ئەوە کە تاکەکان پاش گەورەبوون و لە قۆناغەکانی دواتری ژیاندا و گەییشتن بە ئاسایشی زیاتریش، هەمیشە لەوە دەترسێن کە نەکات منداڵەکانیان وەک ئەوانیان لێ بێت. ئەوان پێیان وایە هەندێک جار سامانی زۆریش ناتوانێت سەنگەرێکی باش و پارێزەر بێت بۆ بەرەنگاربوونەوەی بەدبەختیی. ڕەنگە ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە بۆ وەچەی یەکەم شتێکی گونجاو بێت بەڵام بۆ نەوەکانی دواتر کە هەرگیز هەستیان بە هەژاریی و دەسکورتیی نەکردووە، هیچ واتایەکی نییە و هەر لە بەر ئەوەشە کە لێرەدا هێندە لە سەر ئەم باسە ناڕۆین، چوونکە ئەگەر چەند نموونەیەکی ئاوارتەش هەبێت، دەتوانین نادیدەیان بگرین.

سەرچاوەی ئەم نەهامەتییە دەگەڕێتەوە بۆ جەختکردنی لە ڕادەبەدەر لە سەر بەدەستهێنانی سەرکەوتن لە ڕکابەرییەکاندا وەک گرینگترین سەرچاوەی بەختەوەریی. هەر چەند نکووڵیی

---

46 - Arnold Bennet,s Clayhanger

لەوەش ناکەم هەستکردن بە سەرکەوتن دەبێتە هۆی ئەوە کە تاک چێژی زیاتر لە ژیان ببینێت. بۆ نموونە شێوەکارێک کە سەردەمی گەنجێتیی خۆی بە نەناسراویی بە سەر بردووە، ئەگەر لە ڕێگەی هونەرەکەیەوە ناو و ناوبانگ دەر بکات، هەست بە بەختەوەرییەکی زیاتر دەکات. دیسانەوە نکوولّیی لەوەش ناکەم کە پارە تا ڕادەیەکی دیاریکراو دەوری هەیە لە بەختەوەریی تاکەکاندا بەڵام ئەگەر لە سنوورێکی دیاریکراوی تێ پەڕاند، بە دڵنیاییەوە ئەو کاراییی و کاریگەرییەشی لە دەست دەدات. بەڵام هەر سوورم لە سەر ئەم بیروڕایەی خۆم کە سەرکەوتن بە تەنها، بەشێکە لە بەختەوەریی و، ئەگەر مرۆڤ هەموو شتێکی لە پێناویدا بەخت بکات نرخێکی زۆر زۆری بۆ داوە.

سەرچاوەی ئەم نەهامەتیی و بەدبەختییە، فەلسەفەیەکی نالەبار و کارتێکەریی ژیانە کە لە ناو کاسپکار و بازرگانەکاندا برەوی زۆری هەیە و هێشتاکەش بە هەموو توانایەوە هێزی خۆی پاراستووە و وەک خۆی ماوەتەوە. ڕاستە هێشتا لە ئەورووپادا تا ڕادەیەک ڕێز لە دەوڵەمەند و ئەریستۆکراتەکان دەگیردرێت بەڵام لە زۆربەی وڵاتاندا زیاتر ڕێز لە چینی خوێندەوار و پسپۆڕ دەگیردرێت کە ئەم پرسە خۆی، ڕوانگەی سەرکەوتن و بەختەوەریی دەگۆڕێت. لە ڕاستییدا جگە لە چەند وڵاتێکی بچووک نەبێت کە بە گشتیی گرینگیی بە چینە سەربازییەکان دەدەن و هۆی ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ تایبەتمەندیی حکوومەتەکانیان، بەڵام لە بەشێکی زۆری جیهاندا سێکوچکەی زانستەکان[٤٧] و ئابووریی و پزیشکیی و زانستە مرۆییەکان، بەهاگەلێکی ڕاستەقینەیان داگیر کردووە کە سەرقاڵبوون پێیانەوە بە شێوازێکی زانستییانە، هیچ مەترسییەکی لێ ناکەوێتەوە. لە وەها دۆخێکدا گومان لەوەدا نییە کە هۆکاری ڕکەبەرایەتیی دەوری هەیە لە سەرکەوتندا و، ئەم ڕکەبەرایەتییە هیچ پێوەندییەکی بە کار و پیشەوە نییە. لێرەدا ئەو شتەی کە بە ڕاستیی دەبێ ستایش بکرێت، خودی سەرکەوتن نییە بەڵکوو ئەو دەرەنجامە باش و ئەرێنییانەن کە لێی دەکەونەوە. ڕەنگە بیرمەندێک لە ڕووی باری داراییەوە پلە و پایەیەکی بەرزی هەبێت و لەوانەشە یەکێک لە هەژارترین کەسانی کۆمەڵگا بێت، بەڵام لە هەر دوو حاڵەتەکەدا لە ڕێز و حورمەتی کەم

٤٧ - The Learned Profession؛ [یان زانستە سیانییەکان؛] واتە **تیۆلۆژیی** و **ماف** و **پزیشکیی** کە هەر لە کۆنەوە بەهای تایبەتیی خۆیان هەبووە.

نابێتەوە. نرخی ڕاستەقینەی ئەم بیرمەندە، لەو پێودانگانەدا کورت ناکرێتەوە کە نرخ و بەهای دیاریکراویان هەیە. بۆ نموونە کەس سەری لە هەژاریی و دەسکورتیی بیرمەندێکی گەورە یان دەریاوانێکی گەورە یان ئەفسەرێکی پلەبەرز ناسووڕمێت و هەروەها بە خۆشی ڕەوا نابینێت وەک بوونەوەرێکی بچووک و کەمبایەخ لێی بڕوانێت. لە هەندێ ڕووەوە تەنانەت خودی هەژاریی، دەبێت بە یەکێک لە هۆکارەکانی سەربڵندیی و سەرکەوتن. خۆشبەختانە ئەمڕۆ ڕکەبەرایەتیی دارایی، لە ئەورووپادا لە نێوان کەسانێکدا لە ئارادایە کە لە ڕووی پێگەی زانستیی و مەعریفییەوە پێگە و جێگەیەکی ئەوتۆیان نییە.

سەبارەت بە پێگەی تایبەتی زانست لە ئەمریکادا دۆخەکە تەواو جیاوازە. تاقمێک کە دەوری کەمتریان لە ژیانی نەتەوەییدا هەیە، چوونکە کەس نایانناسێت، پێگەیەکی ئەوتۆیان نییە. بەڵام سەبارەت بە بیرمەندانی بواری سێکوچکەی زانستەکان، چوونکە بێجگە لە خودی خۆیان کەسی تر ئاگای لە ڕادەی زانست و مەعریفەیان نابێت، هەر بۆیە هەمان داهات (دەرامەت) دەبێتە تاقە پێوەری هەڵسەنگاندن کە ئەویش دواجار دەبێتە پێوەری هەڵسەنگاندنی ڕێز و پلە و پایە. بۆ نموونە کەس لە "ئەمریکا"دا گوێ بەوە نادات پلەی زانستیی و مەعریفیی فلانە پزیشک چەند و چۆنە، یان فلان پارێزەر لە بواری مافدا چەند زانیاریی و شارەزایی هەیە. بۆیە باشترین ڕێگەی ناسینی ئەو، قەرەباڵغیی نووسینگە و شوێنی کارەکەیەتی. سەبارەت بە مامۆستایانی زانکۆ دەبێ بڵێین کە ئەوان بەکرێگیراوانی کاسپکار و بازرگانەکانن و بۆیە بە پێچەوانەی ناوچەکانی تری جیهان لە ناو "ئەمریکا"دا پلە و پایەیەکی ئەوتۆیان نییە. لە "ئەمریکا"دا کەسی پسپۆڕ و شارەزا، شوێنکەوتەی ئیرادەی بازرگانەکانە و هاوشێوەی ئەورووپا، گرووپێکی تۆکمە و سەربەخۆ پێک ناهێنن. کەواتە لە ناو هەموو چینە دەوڵەمەندەکاندا هیچ هۆکارێک بوونی نییە کە هەوڵە جیدییەکانی لە پێناوی بەدەستهێنانی سەروەت و ساماندا کۆنترۆڵ بکات و کەمی بکاتەوە.

منداڵانی ئەمریکا هەر لە سەرەتاکانی ژیانیانەوە وا هەست دەکەن کە سەرکەوتن لە بواری بەدەستهێنانی پارەدا گرینگترین شتە و، حەزیش ناکەن خۆیان بە لقێکی زانستییەوە سەرقاڵ بکەن کە پارەی زۆری لێ پەیدا نابێت.

پێشتر وا باو بوو کە فێرکارییان - ئەگەر بە تەواوەتییش نەبێت - تا ڕادەیەکی زۆر وەک ڕاهێنانێک بۆ توانای دەرک پێکردنی چێژ و بەختەوەریی بە کار دێنا. مەبەستم لەو چێژ و خۆشییە بەرز و باڵایانەیە کە خەڵکی کۆلکە و نەخوێندەوار بەبێ فێرکاریی و ڕاهێنان ناتوانێت بە دەستیان بێنێت. لە سەدەی هەژدەهەمدا یەکێک لە فاکتەرەکانی پلە و پێگە و شکۆمەندیی، چێژوەرگرتنی جیاواز لە ئەدەبیات و شێوەکاریی و مۆسیقا بوو. ئەمڕۆ دەوڵەمەندی سەردەمی ئێمە هیچ ناخوێنێتەوە و ئەگەر پێ دەنێتە پیشانگای شێوەکارییەوە تەنها و تەنها بۆ خۆنواندنە و، لەوانەشە بۆ خۆ بە ژێر دەرخستن و هەروەها ڕەنگە بۆ دەرخستنی توانای کڕینی تابلۆیەکی گرانبەها بێت. لەم حاڵەتەشدا بۆ کڕینی تابلۆیەکی گرانبەها، پشت بەو شارەزایانەوە دەبەستێت کە تابلۆکان هەڵ دەبژێرن و چێژی ڕاستەقینەی لێ دەبینن. ئەو دەوڵەمەندەی باسی دەکەین، مەبەستی لە کڕینی ئەو تابلۆیە ئەوە نییە کە چێژی لێ وەربگرێت، بەڵکوو بە کڕینی ئەو تابلۆیە، دەوڵەمەندەکانی دیکە لە هەبوونی تابلۆکە بێبەش دەکات. لە بواری مۆسیقاشدا دۆخەکە هەر بەم جۆرەیە. ئەڵبەتە بێجگە لە چەند حاڵەتێکی ئاوارتە کە دەوڵەمەندی جوولەکە، بە زەوق و سەلیقەیەکی ڕاستگۆیانەوە ڕێز لە هونەری مۆسیقا دەگرێت، بەڵام دەوڵەمەندی بەرباسی ئێمە، هەر بە هەمان کرچوکاڵییەوە سەیری هونەری مۆسیقاش دەکات. دەرەنجامی ئەمەش ئەوە دەبێت کە نازانێت چۆن کاتەکانی پشووی پڕ بکاتەوە و تا دەوڵەمەندتر دەبێت، زیادکردنی سەروەت و سامان بۆی ئاسانتر دەبێت. سەرەنجام ڕۆژێک دادێت کە پەیتا پەیتا داراییەکانی ڕوو لە زیادبوون دەکات و ناشزانێت ئەو هەموو پارەیە چۆن خەرج بکات. جیا لەوەش دەردەسەرییەکانی ئەم کەسە، تازە دەست پێ دەکەن، چوونکە هەرگیز فێر نەبووە چۆن کەڵک لە پێگەی خۆی وەربگرێت، بۆیە بەردەوام بیر لە سەرکەوتن دەکاتەوە - سەرکەوتنێک کە هەر چەند بە دەستی هێناوە، بەڵام هێشتا لە ئاستی چاوەڕوانییەکانی ئەودا نییە و ئەم دۆخەش هەر درێژەی دەبێت. تا کاتێک مرۆڤ فێر نەبێت چۆن کەڵک لە سەرکەوتن و کامرانییەکانی وەربگرێت، تەنانەت ئەگەر بە دەستیشی بێنێت، دیسانەوە گرفتاری خەم و خەفەت و خەمۆکیی دەبێت.

ئەسپی سەرکەشی بیرکردنەوە لە ڕکەبەرایەتیی، بە ئاسانیی لە بوارێکدا تاو دەدرێت کە لە دەرەوەی بازنەی توانای ئاسایی تاکی ڕکابەریخوازە. بۆ نموونە خوێندنەوەی کتێب لە بەر چاو بگرن: بۆ خوێندنەوەی هەر کتێبێک دوو پاڵنەر دەور دەبینن، یەک؛ لە خوێندنەوەی چێژ دەبینن، دوو؛ بە خوێندنەوەی ئەو کتێبە، بە جۆرێک لە جۆرەکان خۆتان هەڵ دەکێشن.

لە ناو خانمە ئەمریکاییەکاندا خوێندنەوەی ژمارەیەکی دیاریکراوی کتێب لە هەموو مانگێکدا (واتە خۆهەڵکێشان بۆ خوێندنەوەی کتێب) بۆتە شتێکی باو. ژمارەیەکی زۆر کەمیان کتێبەکان دەخوێننەوە، هەندێکیان تەنها بەشی یەکەمی کتێبەکان دەخوێننەوە و هەندێکیشیان تەنها یاداشت و پەراوێزەکانی ناو کتێبەکان دەخوێننەوە. بەڵام هەموویان کتێبەکان لە سەر مێزەکانیان دادەنێن. ئەوان هەرگیز ئامادە نین شاکارێکی کۆن بخوێننەوە. هەرگیز **هەملێت** و **لیرشا**، لە ڕیزی ئەو کتێبانەدا نین کە لە کتێبخانە وەریان دەگرن. دانتێ[٤٨] هیچ ئاوڕێکی لێ نادرێتەوە و کەواتە ئەو کتێبانە دەخوێنرێنەوە کە زۆر تازە بن و، دیارە بە دەگمەن شاکاری ئەوتۆشیان تێدا بەدی دەکرێت. ئەم دۆخە بەرهەمی ڕکەبەرایەتییە و ڕەنگە هێندە ناشیرینیش نەبێت چوونکە زۆربەی ئەو خانمانەی باسیان لێوە دەکەین ئەگەر وازیان لێ بێنن، نەک تەنها شاکارە ئەدەبییەکان ناخوێننەوە، بەڵکوو کتێبگەلێک دەخوێننەوە زۆر خراپترن لەو کتێبانەی کە کەسانی شارەزا بۆیان هەڵ دەبژێرن.

ئەو پێداگرییەی کە ئەمڕۆکە لە سەر ڕکەبەرایەتیی دەکرێت، بێگومان پێوەندیی هەیە بە توانەوەی یەکجارەکیی پێوەرەکانی شارستانییەتەوە (وەکوو ئەو شتەی کە لە "ڕۆم"ی پاش سەردەمی "ئاگۆستین"دا[٤٩] ڕووی دا) و ئەمەش ئەوە دەر دەخات کە ژنان و پیاوانی سەردەمی ئێمە بۆ دەرککردنی چێژ و خۆشییە ڕۆحییەکان تەمەڵتر و بێ بەهرەتر بوونە. بۆ نموونە هونەری دیالۆگی ئاسایی، کە لە هۆڵەکانی فەرەنسای سەدەی هەژدەهەمدا گەییشتبووە لووتکە، تا چل ساڵ لەمەو بەریش هێشتا نەریتێکی باو بوو. هونەری دیالۆگ، هونەرێکی بەرز بوو کە بەهرەی تاکەکانی بە ڕادەیەکی زۆر، پەروەردە دەکرد.

بەڵام لەم سەردەمەی ئێمەدا کێ بایەخ بەم پرسە دەدات یان ئیسراحەت و پشوویەکی وەهای دەست دەکەوێت؟ هێندەی من ئاگادار بم ئەم هونەرە تا یەک دوو دەیە پێشتریش لە [وڵاتی]

٤٨ - Dante، ١٢٦٥ – ١٤٢١ی زایینیی؛ شاعیر و نووسەری گەورەی ئیتالیایی کە لە «فلۆرانس»دا لە دایک بووە. بێگومان کتێبی **کۆمێدیای خوایی** یەکێکە لە شاکارە هونەرییەکانی مرۆڤایەتیی کە لە سێ کتێبی **بەهەشت**، **بەرزەخ**، **دۆزەخ** پێک هاتووە.

49 - Augustan

"چین"دا خەڵک پێوەی سەرقاڵ بوون، بەڵام وا بزانم ئەمڕۆ جۆشوخرۆشی ناسیۆنالیستەکان بە تەواوەتیی لەو گوڕ و تینەی جارانیان خستبێت.

ناسینی کتێبە نایابە ئەدەبییەکان کە تا پەنجا و بە لانی زۆرەوە سەد ساڵی ڕابردوو، لە ناو چینی خوێندەواردا برەوی زۆری هەبوو، ئەمڕۆ تەنها هاتۆتەوە سەر چەند مامۆستایەکی دەگمەن کە دەیاننناسن. چێژوەرگرتنی ئاسان و بێ پڕوپاگەندە لەم بەرهەمانە، بە تەواوەتیی لە بیر کراوە.

لە بیرم ناچێت کە ژمارەیەک خوێندکاری ئەمریکایی، لە وەرزی بەهاردا بردمیان بۆ دارستانەکانی دەوروبەری زانکۆ کە پڕ بوو لە گوڵی خۆڕسک و وەحشیی. هیچکام لەو خوێندکارانە کە ڕێنما و ڕێنیشاندەری من بوون، ناوی گوڵەکانیان نەدەزانی. ڕەنگە زانینی ناوی ئەو گوڵانە هیچ قازانجێکی بۆیان نەبوویێت، چوونکە هیچ دەورێکی لە زیاترکردنی داهاتیاندا نەدەبوو.

بە هەر حاڵ کێشەی سەرەکیی لەوەدا نییە کە تاکەکان تەنها بۆ قازانج و بە چاوی مشتەرییەوە تەماشای هەموو شتێک دەکەن و دیارە من و تۆش ناتوانین هیچ کارێک بکەین، چوونکە کێشەی سەرەکیی لە فەلسەفەیەکەوە سەرچاوە دەگرێت کە پێدەچێت هەمووان قبووڵیان بێت - فەلسەفەیەک کە ژیان بە دیالۆگ و شەڕەقسە، یان ڕکابەرییەک لە قەڵەم دەدات کە ڕێز و حورمەت تیایدا بە نسیبی کەسی داگیرکار (=سەرکەوتوو) دەبێت و لە ڕاستییدا دەڵێ:ت «حەق بە داگیرکارە«.

تێڕوانینی وەها، دەبێتە هۆی بەهێزبوونی نارەوای ورە و ئیرادە و، لە هەمان کاتیشدا بە زیانی هەست و عاتیفە و توانای بیرکردنەوە و تێڕامان دەشکێتەوە. یان بە واتایەکی باشتر دەبێ بڵێین وەکوو ئەوە وایە گالیسکەیەکیان بە بەردەمی ئەسپێکەوە بەستبێتەوە. - ئاکارخوازەکانی "پۆریتەن"ی سەردەمی نوێ، هەمیشە جەختیان لە سەر هێزی ورە و ئیرادە کردووە - هەر چەند مەبەستیان لە ورە و ئیرادەی ناخەکیی (دەروونیی) تاکەکان بووە لە پێوەندیی لەگەڵ باوەڕی ئایینییاندا. ڕەنگە لە بەر ئەم پرسە بوویێت کە پاش چەند دەیە دەسەڵاتدارێتیی "پۆریتەن"ەکان، نەوەیەک سەری هەڵ داوە کە خاوەنی ئیرادەیەکی زۆر بەهێزە و لە ڕووی هەستەکانی تر و هەروەها بیرکردنەوە و تێگەییشتنەوە هەندێک کەموکوڕیی هەیە. بوونی نەوەیەکی ئاوها، نیشاندەری سستیی و لاوازیی فەلسەفەی ڕکابەرییە وەک بنەمایەک.

به هەر حاڵ ئەگەری ئەوەش لە ئارادایە بارودۆخی سەرسووڕهێنەری ئەم جۆرە دایناسۆرانە کە شوێنپێی باوباپیرانی مێژووی خۆیان گرتۆتەوە و هێز و دەسەڵات بە باشتر لە دەرک و ئاوەز و تێگەیشتن لە قەڵەم دەدەن، لە لایەن کەسانی ترەوە لاسایی بکرێتەوە و بگیردرێتە بەر. دیارە وەها شێوازێکی پەروەردە، لە سەد ساڵی داهاتووشدا گەشەی زیاتر و زیاتر بە خۆوە دەبینێت. کەسانێک کە دژی ئەم تێڕوانینەن، هیوادارن سەرەنجام ئەم دایناسۆرانە یەکتریی هەڵدڕن و یەکتریی بسڕنەوە و جیهان بە دەستیانەوە ڕزگاری بێت و چاودێرە بێلایەنەکانیش بە چاوی خۆیان حکوومەتی ئارامش و سووکنایی و ئاسوودەیی و پێکەوە هەڵکردن، ببینن. گیانەوەرە تازەکانی ئێمە بەم جۆرە یەکتریی لە ناو دەبەن کە چوونکە چاوەڕێی چێژێکی ئەوتۆ لە ژیانی هاوسەرێتیی (ژیانی هاوبەش) ناکەن، ئەوپەڕی حەزیان بۆ منداڵبوون، دوو منداڵە و [نایانەوێت لەوە زیاتر منداڵیان هەبێت]. ئەم پرسە خۆی ئەوە دەر دەخات کە ئەوان دەرکیان بە چێژ نەکردووە و ئەمەش خۆی، ئەو فەلسەفە نالەبار و تاڵە دەر دەخات کە باوباپیرانی "پۆریتەن"ەکان بە میرات هێشتوویانەتەوە و لەگەڵ ئەم جیهانەی ئەمڕۆی ئێمەدا نایەتەوە. کەسانێک کە جۆری بیرکردنەوە و ڕوانینیان بۆ ژیان، دەبێتە هۆی ئەوە بێبەشبوونیان لە تایبەتمەندییە باشەکانی ژیان و، حەزێکی ئەوتۆیان بۆ زاوزێکردن و منداڵبوون لە لا نەمێنێت، لە ڕووی بایۆلۆژییەوە ڕوو لە نابوودیی دەنێن و پێش ئەوەی هەلەکانیان لە کیس بچێت، دەبێ خۆیان بە دیاردەیەکی شادیبەخش و دڵخۆشکەرەوە سەرگەرم بکەن.

لە قەڵەمدانی ڕکابەرایەتیی بە سەرەکییترین تەوەری ژیان، هێندە ترسناک و تۆقێنەرە کە بێ سێودوو، ماسوولکەگەلی ئاسنینمان بە بیر دێنێتەوە، لە بەر ئەوەی کە ڕکابەرایەتیی پێویستی بە ئیرادەی ئاسنین هەیە، بۆیە پێویستیشمان بە ماسوولکەی ئاسنینیش هەیە و ئەو مەترسییەش لە ئارادایە کە بە لانی زۆرەوە تا یەک دوو وەچەی دیکە، ببێتە بنەڕەت و بنەمای ژیان. پاش ئەم قۆناغە، قۆناغی هیلاکیی هەڵقولاوی پاڵنەرە جۆراوجۆرەکانی هەستی هەڵاتن لە هەموو شتێک - تەنانەت بەدواداچوونی ئەو چێژانەش کە بە سەختیی دەستەبەر دەبن - دادێت. سەرەنجامیش بە هۆی بێهوودەییەوە دەبێتە هۆی لەناوچوونی هەوێنی بنەڕەتیی ژیان. لەم بارودۆخەدا پێویستە جۆرە چالاکییەکی نەگونجاو و نائاسایی لە ئارادا بێت - چالاکییەک کە بە ڕووکردنە مادە هۆشبەرەکان و توانەوە کۆتایی دێت. ڕێگەچارەی ئەم پرسە قبووڵکردنی هەمان چێژە دروست و ڕێکوپێکەکانی ژیانی ئاسوودە و دڵخوازە.

٤

## خەمۆکیی و ورووژان (هەیەجان)

بە باوەڕی من خەمۆکیی کە یەکێک لە هۆکارە کاریگەرەکانی سەر هەڵسوکەوتی مرۆڤەکانە و کاریگەریی لە سەر هەموو لایەنەکانی ژیان و هەڵسوکەوتی مرۆڤدا دادەنێت، تا ئێستا بە پێی پێویست لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی لە سەر نەکراوە. ئەڵبەتە مەبەستم ئەوە نییە کە قەت ئاوڕی لێ نەدراوەتەوە، بەڵکوو مەبەستم شیکردنەوەیەکی شیاو و شایستەی ڕەهەندەکانی خەمۆکییە.

من هێشتا لەو باوەڕەدام کە خەمۆکیی یەکێک لە بەهێزترین هۆکارە پاڵنەرەکانی مرۆڤ بووە بە درێژایی ژیانی مرۆڤایەتیی. ڕەنگە بتوانین بە ڕاشکاوانە ئەوە بڵێین کە خەمۆکیی لەم سەردەمەی ئێمەدا زیاتر لە هەموو سەردەمەکانی دیکە گرینگیی پەیدا کردووە و بە گوێرەی پێویستییەکانی ئێمەش دەبێ زیاترین ئاوڕی لێ بدرێتەوە. پێدەچێت ئەم حاڵەتە تایبەت بە مرۆڤ بێت؛ ئەڵبەتە ئاژەڵێکیش کە تووشی خەمۆکیی هاتبێت، بە بێتاقەتیکردن و خۆکوتان بە دار و بەردا پەرچەکرداریی خۆی نیشان دەدات و تەنانەت ئەو باوێشکانەش کە هێمایەکن بۆ شەکەتیی و بێتاقەتیی، دەمی هەتا بناگوێی پێ دادەدڕن؛ بەڵام من پێم وا نییە ئاژەڵان هەست بەو شێوازە ڕێگرتن یان زەوتکردنی ئازادیی بکەن کە ئێمە بە خەمۆکیی ناودێری دەکەین. بە واتایەکی دیکە دەبێ بە شتێکی هاوشێوەی خەمۆکیی ناودێری بکەین کە لێکچوونێکی ئەوتۆی لەگەڵ خەمۆکیی جۆری مرۆڤدا نییە. ئاژەڵان زۆربەی کات ئاگایان لە دوژمنەکانیانە، یان بە دوای خواردندا بەملاولادا دەسووڕێنەوە و هەندێ جاریش لە یەک کاتدا هەر دوو کارەکە پێکەوە ئەنجام دەدەن. ئەگەر کاتێکی پشوویان بۆ دەست بدات جووت

دەبن و هەوڵ دەدەن بەردەوام خۆیان گەرم ڕابگرن، بەڵام پێم وا نییە تەنانەت لە کاتی تەنگانە و نەهامەتییشدا خەمۆک و خەمبار ببن. ڕەنگە مەیموونە ئینسانۆکەکان (ئینسان شێوەکان) کە لەم ڕووەوە و لە هەندێ ڕووی تریشەوە زۆر لە مرۆڤ دەچن، تووشی خەمۆکی ببن، بەڵام چوونکە هەرگیز لەگەڵیاندا نەژیاوم، ئەزموونێکی ئەوتۆم لەم بارەوە نییە [و ناتوانم هیچ بڵێم]. یەکێک لە هۆکارە سەرەکییەکانی خەمۆکیی، بەراوردکردنی پێگە و جێگەی مرۆڤ لەگەڵ هەلومەرجی دڵخوازە. ئەم بەراوردکردنە بەبێ ئەوەی کە خۆمان بمانەوێت، خۆی بە سەرماندا دەسەپێنێت. هۆکارێکی دیکە کە دەبێتە هۆی خەمۆکیی، توانەوە و لەناوچوونی هێزی جەستەیی و فکرییە کە دەبێتە هۆی داماویی و دەستەوەستانیی.

ناتوانین بڵێین تاوانبارێک کە لە پای سێدارەدایە، هەست بە داماویی و ئێش و ئازار و خەمۆکیی ناکات - مەگەر ئەوەی کە خاوەنی بوێرییەکی سەروو مرۆیی بێت - هەروەها زۆر بە دەگمەن ئەوە ڕوو دەدات کە کەسێک لە کاتی پێشکەشکردنی یەکەمین لێدوانیدا بە بەرچاوی خەڵکەوە تووشی پەژارە نەبێت - مەگەر ئەوەی کە دووکی[٥٠] مەزن «دۆنشایر» بێت کە بە هۆی بوێریی و ئازایەتییەکەیەوە ئەندامانی ئەنجومەنی لۆردەکانی بەریتانیا ڕێزێکی ئێجگار زۆریان لێ دەگرت.

خەمۆکیی لە بنەڕەتدا لە حەز و ئارەزووە سەرکوتکراو و بەدینەهاتووەکانەوە سەرچاوە دەگرێت. هیچ پێویست ناکات [مرۆڤ] هەستێکی خۆشی بەرانبەر بەم حاڵەت و ڕووداوانە هەبێت. واتە ڕووداوگەلێک کە دەبنە هۆی ئەوە کەسی خەمۆک توانای لێک جیاکردنەوەی بارودۆخی ڕۆژەکان و پێکەوە بەراوردکردنیان لە دەست بدات و ببێتە هۆی دڵەڕاوکێ و نیگەرانیی و خەمباریی. بە کورتیی، دەتوانین بەم جۆرە پێناسەی بکەین: خەمۆکیی دژی خۆشحاڵیی نییە، بەڵکوو خاڵی بەرانبەری ورووژان (هەیەجان)ە.

حەزکردن بە وروژان بە تایبەتیی لە پیاواندا زۆر قووڵتر و زیاترە. پێم وایە لە سەردەمی بەربەرییەت (هۆڤێتی)دا حەزەکانی خوازیاری وروژان، زیاتر تێر دەبوون. چوونکە لەو سەردەمانەدا مرۆڤ بە گەڕان بۆ خواردن و نێچیر و خانوو و تێکەڵبوون بە لایەنە

٥٠ - Duke؛ دووک؛ گەورەترین نازناوی چینی دەوڵەمەند و ئەریستۆکراتەکانی بەریتانیا پاش نازناوی شازادەکان.

سەرکەشەکانی سرووشتەوە، زیاتر دەورووژا، لە کاتێکدا ئەمڕۆکە نەزم و تەکووزیی کۆمەڵگا مرۆییەکان و پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیی، ئەو جۆرە ورووژانانەی لە ناو بردووە.

لە ڕابردوودا شەڕکردن لە پێناوی [بەدەستهێنانی] ژناندا شتێکی ورووژێنەر بووە و پیاوی وەحشیی، بەبێ هیچ جۆرە هەستکردنێک بە تاوانی ئاینیی، دەیویست لەگەڵ ژنێکی مێردکردوودا بخەوێت و، ئەوەشی دەزانی کە ئەگەر مێردی ئەو ژنە بە خەبەر بێتەوە، شەڕ و پێکادان ڕوو دەدات و بە دڵنیاییەوە یەکێکیشیان دەکوژرێت، بەڵام هەر ئەم هۆکارە ورووژانێکی وای تێدا چێ دەکرد کە ڕێگر دەبوو لە بەردەم خەمۆکیی و خەمباربوونیدا، بەڵام لە سەردەمی دەستپێکردنی کشتوکاڵ بەم لاوە، ژیانی مرۆڤ ڕێکوپێکییەکی بە خۆوە بینی و خەم و خەفەتی تێ کەوت. لەم ناوەدا تەنها چینی ئەریستۆکرات و دەوڵەمەند ئاوارتە بوون و دۆخێکی جیاوازیان هەبوو؛ چوونکە وازیان لە ڕاوکردن نەهێنا و ڕەنگە هێشتاکەش ئەو نەریتەیان لە بیر نەکردبێت. سەبارەت بە شەکەتیی و وەڕسییەکانی ژیانی ماشێنیی، قسەی زۆر کراوە بەڵام من لەو باوەڕەدام ژیانی کشتوکاڵیی سەردەمە کۆنەکانیش هێندەی سەرهەڵدانی ماشێن و کاریگەرییە نەرێنییەکانی، دەوری لە خەمۆکیی مرۆڤدا هەبووە. ڕەنگە وا باشتر بێت بڵێم کشتوکاڵ بە شێوازی پێشینان، هێندەی کشتوکاڵ بە شێوازی ئەمڕۆ وەڕسکەر بووە. شیاوی ئاماژەپێدانە کە بە پێچەوانەی کەسانی دژی ماشێن و هەروەها کۆمەڵناسانیش، سەردەمی ماشێن بە ڕادەیەکی زۆر، ڕێژەی خەمۆکیی کەم کردۆتەوە. چوونکە کرێکاران لە کاتی کارکردندا تەنیا نین و کاتەکانیان بە قسەکردن و دەمەدەقێ لەگەڵ هاوڕێکانیان پڕ دەکەنەوە و شەوانیش دەتوانن خۆیان بە چەندین شتی جۆراوجۆرەوە سەرقاڵ بکەن کە لە ڕابردوودا وا نەبووە.

لە لایەکی دیکەوە ئەو فرەچەشنیی و گۆڕانکارییە زۆرانەی کە هاتوونەتە ناو ژیانی چینی مامناوەندیی کۆمەڵگای ئەمڕۆوە، لە بەر چاو بگرن. لە ڕابردوودا پاش خواردنی شێو، کاتێک دایک و کچەکان سفرەیان کۆ دەکردەوە، هەمووان لە دەوری یەک دادەنیشتن و - وەک دەڵێن - «بنەماڵەیەکی بەختەوەر»یان پێک دێنا. بەم شێوەیە کە باوک وەک سەرپەرستی بنەماڵە خەوی لێ دەکەوت و ژنەکەی کاری چنینی دەکرد و کچەکانیش

خۆزگەیان بە مردن دەخواست و لەوانەشە حەزیان بکردایە لە «تیم بووکتۆ»دا[٥١] بوونایە. ئەوان بۆیان نەبوو کتێب بخوێننەوە یان بچنە دەرەوە، چوونکە ئەوە بنەمایەکی گشتیی بوو کە کاتێک باوک قسەیان بۆ دەکات، دەبێ بە دڵ و گیان گوێی بۆ ڕادێرن. ئەگەر بەختیان هەبوایە و مێردێکیان بە نسیب بوایە و هاوسەرگیرییان بکردایە، هەموو ئەو هەڵسوکەوتە خەمهێنەر و خەمۆککەرانەی کە دەرحەق بە خۆیان کراوە، ئەوانیش دەیانگواستەوە بۆ منداڵەکانیان و ئەگەریش بەختیان نەبوایە بە ناچاریی دەبوونە ڕاهیبە و، هەندێ جاریش بۆ دامرکاندنەوەی حەزە سێکسییەکانیان ڕوویان لە لەشفرۆشیی دەکرد. ئەم چارەنووسە هەر هێندە تۆقێنەر بوو کە وەحشییەکان بە دیلەکانیان ڕەوا دەبینی.

وەها هەڵسوکەوتێک لەگەڵ کچاندا تا سەد ساڵی ڕابردوو، شتێکی باو بوو و ئێوەش دەتوانن ئەو دۆخە وێنا بکەن کە لە چ خەمۆکیی و خەفەتێکدا ژیاون. تا زیاتر بەرەو ڕابردوو بگەڕێینەوە ئەوەمان بۆ دەر دەکەوێت کە خەفەت و خەمۆکییەکی زیاتر بە سەر خەڵکدا زاڵ بووە. گوندێکی وەڕسکەر و خەمهێنەری چاخەکانی ناوەڕاست بهێننە پێش چاوتان! لەو سەردەمەدا خەڵک، نە دەیانتوانی بخوێنن و بنووسن و نە توانای دابینکردنی پێویستییەکانی ئەو کارەشیان هەبوو. تاقە شتی ڕووناککەرەوەی شەوان لەو سەردەمەدا مۆم یان چرامووشییەک بووە کە چەورییان تێدا سووتاندووە و دووکەڵیشی هەموو ژوورەکەی گرتۆتەوە؛ تازە باسی سەرمای کوشندەی ناو ئەم ماڵانە هەر ناکەم. گرینگ نییە کە ئەم ماڵانە لەو بارودۆخەدا سەرد بن یاخود گەرم. جادەکان بە ڕاستیی سەخت و ئەستەم بوون و گوندنشینەکان نەیاندەتوانی بە ئاسانیی سەردانی یەکتریی بکەن تەنانەت ئەوانەش زۆر لێک نزیک بوون. ڕەنگە هەر لە بەر ئەوەش بووبێت کە جادووگەریی (سیحربازیی) و بانگهێشتکردنی ڕۆح، یەکێک بووە لە سەرگەرمییە باوەکانی وەرزی زستان و وای لە خەڵک کردووە دڵتەنگیی و خەفەتی ئەو شەوە ساردانە لە بیر بکەن.

خەمۆکیی ئێمە زۆر زیاترە لەوەی پێشینانمان، بەڵام ترس لە پشتیانی خەمۆکیی، زۆر لەوە زیاترە و ئێمەش تا ڕادەیەک لەو باوەڕەداین کە خەمۆکیی، تایبەتمەندییەکی دانەبڕاو و

---

٥١ - Timbuktu؛ شارێکە لە ئافریقای باکووردا.

جەوهەریی مرۆڤ نییە و بە پشتبەستن بە ورووژانگەلی بەهێزەوە دەتوانین خۆمانی لێ دوور بخەینەوە. ئەمڕۆ زۆربەی کچان خۆیان ژیانی خۆیان بەڕێوە دەبەن تا ئەو بوارەیان بۆ بڕەخسێت کە لە سەدا سەد ملکەچی بیروڕا و بۆچوونە کۆن و وەڕسکەرەکانی پیاوە زاڵەکانی ناو ژیانیان نەبن. ئەوان دەتوانن بە بێ پشتیوانیی باوکە دوا کۆنەکانیان (لە ڕووی فکریەوە) ورووژانی پێویست بۆ خۆیان دابین بکەن و ڕێ لە خەمۆکیی و دڵتەنگییان بگرن و خۆیان لەو «بنەماڵە بەختەوەر»ە بدزنەوە کە داپیرەکانیان ناچاریان دەکردن تەحەمولی بکەن.

لە ئەمریکادا خەڵکی شارەکان بۆ ئامادەبوون لە شوێنەکانی کەیفخۆشیی و سەرگەرمیدا لەوانە سینەما، ئۆتۆمبێل یان ماتۆرسیکلێت و هەروەها ڕادیۆ و تەلەفزیۆنیشیان هەیە. ژنان و پیاوان بۆ بینینی یەکتریی، کێشە و گرفتی زۆر کەمتر لە ڕابردوویان هەیە. تەنانەت خزمەتکارەکانیش خوازیاری ئەوەن هەر هیچ نەبێت حەفتەیەک جارێک هێندە ورووژانیان دەست بکەوێت کە پاڵەوانی کتێبی «جان ئاوستین»[٥٢] لە هەموو چیرۆکەکەدا دەستی دەکەوت و بە بەرزبوونەوەی پێگەی کۆمەڵایەتییان، خوازیاری بەدەستهێنانی ورووژانی زیاتر دەبن. کەسانێک کە باری داراییان باشترە، هەمیشە لە شوێنێکەوە دەچن بۆ شوێنێکی دیکە. ڕوو لە هەموو جۆرە کەیفخۆشیەکی ڕەوا و ناڕەوا دەکەن. حەز دەکەن چێژی زیاتر لەو شار و شوێنانە ببینن کە لە شارەکانی خۆیاندا کەمتر دەستیان دەکەوێت. بەڵام کەسانێک کە دەبێ بژێویی ژیانیان دابین بکەن، هیچ چارەیان نییە و مل بە خەمۆکیی دەدەن و تەحەمولی دەکەن و لانیکەم لە کاتی کارکردندا بە پێچەوانەی ویستی خۆشیانەوە دان بە خۆدا بگرن. کەسانی دەوڵەمەند لە بەر ئەوەی کە پێویستیان بە کارکردن نییە و خەمی بێ پارەیی و بێکاریی ناخۆن، ئەوپەڕی داخوازییان ئەوەیە کە ژیانێکی دوور لە خەم و خەفەت و خەمۆکیی بە سەر بەرن.

ئەم باوەڕە کە تاکەکان خوازیاری سڕینەوەی خەم و خەفەت و خەمۆکیی بن، شتێکی پەسەند و ڕەوایە، بەڵام من بۆم نییە بۆ هەموو هەلومەرجێک بە دروستی بزانم و هەندێ جار

٥٢ - Jane Austen، ١٧٥٥ – ١٨١٧، نووسەری بەریتانیایی.

لە بەها و نرخی کەم بکەمەوە چوونکە لەوە دەترسم وەکوو ئایدیالەکانی دیکە، بەدیهاتنی زۆر لەوە ئەستەمتر بێت کە کەسانی خەیاڵاویی بیری لێ دەکەنەوە.

بە گشتیی، هێندەی هەمان ئەو شەوەی کە بە خۆشیی تێپەڕتان کردووە، ڕۆژی دواتری خەمۆک دەبن. واتە وەک چۆن لە پاش چێژ و خۆشییەکانی هەرەتی لاوێتیی، نێوانساڵیی و پاشان پیریی و پەککەوتەیی دێت، پاش هەموو چێژێکیش خەمۆکیی ڕووتان تێ دەکات.

تا لە بیرمان نەچووە با ئەوەش بڵێین کە نێوانساڵیی و پیریی و پەککەوتەیی، بەشێکی حاشا هەڵنەگری ژیانن. کەسێکی گەنج لە تەمەنی بیست ساڵیدا بیر لەوە دەکاتەوە کە ژیان لە تەمەنی سی ساڵاندا کۆتایی دێت، لە کاتێکدا من لە تەمەنی هەشتا ساڵیشدا هێشتا بیر لە شتێکی ئاوا ناکەمەوە. ڕەنگە بە فیرۆدانی تەمەن ڕێک هێندەی بە فیرۆدانی پارە و سامان کارێکی نائاقڵانە بێت. ڕەنگە تۆزێک خەمۆکییش بۆ ژیان پێویست بێت. هەڵاتن لە خەم و خەمۆکیی شتێکی سروشتییە. هەموو ڕەگەزەکان، لە هەموو سەردەمەکاندا و هەر کاتێک بۆیان دەست دابێت، ئەو جۆرە هەستەیان لا دروست بووە. کاتێک [مرۆڤە] وەحشییەکان بۆ یەکەم جار تامی خواردنەوە سەرخۆشکەر و خەمڕەوێنەکانیان لە دەستی سپی پێستەکانەوە خواردەوە، لە ڕاستییدا ڕێگەچارەیەکیان بۆ خەم و خەمۆکییە دێرینەکانیان دۆزییەوە. ئەگەر دەوڵەت دەستێوەردانی نەکردایە و هەندێ سنوور و یاسا و ڕێسای دانەنابایە، تا سنووری مردن مەست و سەرخۆش دەبوون. جەنگەکان، کوشتوبڕەکان و هەروەها ئەشکەنجەکان، تا ڕادەیەک لە هەستی هەڵاتن لە خەمۆکییەوە سەرچاوەیان گرتووە. هەندێک کەس تەنانەت شەڕ لەگەڵ دراوسێکانیان لە بێکاریی پێ خۆشترە. خەمباریی و خەمۆکیی لە ڕوانگەی لایەنگرانی زانستی ئاکاردا پرسێکی زۆر گرینگ و هەستیارە، چوونکە نیوەیەک لە تاوانەکانی مرۆڤ، لە ترسی خەمۆکییەوە سەرچاوە دەگرن.

نابێ هەموو جۆرەکانی خەمۆکیی بە زیانبار لە قەڵەم بدەین. خەمۆکیی دوو جۆرە: «سوودبەخش» و «بێسوود». خەمۆکیی سوودبەخش بەبێ دەستێوەردانی هۆکاری دەرەکیی لەوانە مادەی هۆشبەر دێتە ئاراوە و، جۆرە بێسوودەکەشی بە هۆی نەبوونی چالاکیگەلی گرینگەوە دێتە ئاراوە. من نامەوێ لێرەدا سەبارەت بە مادەی هۆشبەر قسە بکەم یان بڵێم کە هیچ کاریگەرییەکی باشی لە سەر ژیان نییە. چوونکە هەندێ جار تەنانەت پزیشکە

لێهاتووەکانیش وەک دەرمان بۆ نەخۆشکانی دەنوێنن. ئەڵبەتە نابێ بە بیانووی کاریگەرییە باشەکانی مادەی هۆشبەر، بە شێوەیەکی بەردەوام و زێدەڕۆیانە کەڵکی لێ وەربگیردرێت، چوونکە کەڵکوەرگرتنی زێدەڕۆیانە لەو مادەیە کۆنترۆڵی مرۆڤ لە ناو دەبات و سەرسەریی و کەمتەرخەمی دەکات. ئەو جۆرە خەمۆکییە کە لە کاتی نەبوونی مادەی هۆشبەردا ڕوو لە کەسانی تووشبوو (ئالوودەبوو) دەکات، بە باوەڕی من تێپەڕینی زەمەن نەبێت هیچ چارەیەکی تری نییە. بابەتێک کە سەبارەت بە کەڵکوەرگرتن لە مادەی هۆشبەر ڕاستیی لە خۆ دەگرێت، کەم تا زۆر سەبارەت بە وروژان (هەیەجان)ەکانی دیکەش ڕاستیی لە خۆ دەگرێت. ژیان لێوانلێوە لە وروژانی ژیانێکی تاقەتپڕووکێن، کە تیایدا بەردەوام هەست بە پێویستبوونی پاڵنەرێکی بەهێزتر دەکرێت - پاڵنەرێک بۆ وەڵامدانەوەی تینوویەتییەک کە پێدەچێت گرینگترین شت بێت بۆ بەدەستهێنانی چێژ. کەسێک کە بە ڕادەیەکی زۆر بە وروژانەکان ڕاهاتووە، لە کەسێک دەچێت کە حەزێکی ناتەندروست و زێدەڕۆیانەی بۆ خواردنی بەردەوامی بیبار لە لا دروست بووە. ئەو حەز دەکات تامی ئەو بیبارە تیژانە بکات کە تەنانەت کەس بەرگەی بۆنەکەیان ناگرێت. بەڵام سەرەنجام دەگاتە ئاستێک کە ئەو تێگەییشتنەی لە لا نامێنێت.

خەمۆکیی تایبەتمەندییەکی تێدا هەیە کە قابیلی جیا کردنەوە لە وروژانە خەستەکان نییە - وروژانی خەستیش نەک تەنها تەندروستیی دەخاتە مەترسییەوە، بەڵکوو حەزی مرۆڤ بەرامبەر بە هەموو شتێک لە ناو دەبات. حەزی چێژی قووڵی سێکسیی لە ناو دەبات و جۆری ڕوانینی مرۆڤ بەرامبەر بە جوانیی دەسڕێتەوە و چرای هەستیش دەکوژێنێتەوە. وروژانی خەست، هەستی جوانیی و جوانیناسیی دەکوژێت.

حەز ناکەم لەمە زیاتر دژایەتیی وروژان بکەم چوونکە پێم وایە ڕێژەیەکی دیاریکراوی وروژان [بۆ مرۆڤ] پێویستە بەڵام وەکوو هەموو شتێکی دیکە دەبێ ڕێژەکەی بپارێزرێت.

کەمیی وروژان، بەڵگەیەکە بۆ حەز و شەوقی ناتەندروست و، وروژانی لە ڕادە بەدەریش هیلاکیی و شەکەتیی زۆری بە دواوە دەبێت. بە تایبەت دەبێ ئەوە فێری گەنجەکان بکرێت کە لە بەرانبەر ڕێژەیەکی دیاریکراوی خەمۆکییدا خۆیان ڕابگرن و تەحەمولیان هەبێت تا بتوانن بە ژیانێکی بەختەوەرانە بگەن.

هەموو کتێبە گەورەکان بەشێکی وەڕسکەریان تێدا هەیە و ژیانی هەموو مرۆڤە گەورەکانیش سەردەمانێکی وەڕسکەر و ناخۆشیان تێدا هەبووە.

ئەوە بهێننە پێش چاوتان کە بۆ یەکەم جار کتێبی "**تەورات**"تان داوە بە دەزگایەکی بڵاوکردنەوە؛ ئەگەری ئەوە زۆرە کە کەسی بڵاوکەرەوە سەبارەت بە ڕەچەڵەکی مرۆڤ و ناوەکانی تری ناو کتێبەکە پێتان دەڵێت: ((بەڕێز گیان ئەم بەشەی کتێبەکەتان بە ڕاستیی بێرۆحە، تۆ چۆن دەتەوێت زنجیرەیەک ناو کە لێکدانەوەیەکی زۆر کورتت سەبارەت بە هەر کامیان نووسیوە، سەرنجی خوێنەر بەرەو خۆی ڕابکێشێت؟ ئەڵبەتە ئەوەم قبووڵە کە دەقەکەت زۆر جوان دەست پێ کردووە و شێوازێکی جوانتان بە کار هێناوە. منیش سەرەتا کاری تێ کردم، بەڵام بە گشتیی، درێژداڕیی زۆری تێدایە. وا باشترە بەشە شاز و بەهێزەکان هەڵبژێرن و پاش سڕینەوەی بەشە زیادییەکان، نوسخەی کۆتاییم بۆ بێنن تا بۆتانی چاپ و بڵاو بکەمەوە)).

ئەم بڵاوکەرەوەی باسی لێوە دەکەین، نەک تەنها سەبارەت بە **تەورات** بەڵکوو سەبارەت بە هەموو کتێبە ئاسمانییەکانی دیکەش هەمان بیروڕای هەیە و تەنانەت بیروڕاشی سەبارەت بە هەندێ دەقی کلاسیکی وەک **سەرمایە** و "**ڕۆحی یاساکان**"یش ئاوایە. ئەو پێی وایە درێژدادڕیی، دەبێتە هۆی هیلاکیی و وەڕسبوونی خوێنەر. ئەگەرچی ئەم جۆرە کتێبانە و بە تایبەت **قورئان** هەمیشە جێی سەرنج و بایەخ بوونە، بەڵام ئامادە نییە بیروڕای خۆی بگۆڕێت. ئەڵبەتە درێژدادڕیی بە تەنها کتێبە ئاسمانییەکان ناگرێتەوە و دیارە هەر کتێبێکیش کە پڕ بێت لە سەربوردە و بەسەرهاتی سەیر و سەمەرە و جۆراوجۆر، کتێبێکی باش نییە و ناتوانرێت بخرێتە ڕیزی کتێبە گەورە و ناوازەکانەوە. ڕۆمانە نوێیەکانیش هەندێ بەشی وەڕسکەریان تێدا هەیە. سەربوردەی مرۆڤە گەورەکانیش جاروبارە هەندێ بەشی ماندووکەریان هەیە. ڕەنگە سوقرات چێژی لە زۆر میوانیی و میوانداریی بردبێت؛ بەڵام لە یەکێک لەم میوانییانەدا «شەوکەران» کاریگەریی خۆی دانا. ئەو، زۆربەی کات لەگەڵ "گرانتیپ"دا ژیانێکی هێمن و ئارامی هەبوو و ئێواران دەچوو بۆ پیاسەکردن. لەوانەیە چاوی بە چەند هاوڕێیەکی دەکەوت

و بە بینینیان خۆشحاڵ دەبوو. کانت[٥٣] بە درێژایی ژیانی، زیاتر لە دە کیلۆمتر لە کۆنیکسبێرگ دوور نەکەوتەوە. داروین[٥٤] پاش سەفەرێکی دوور و درێژ بە چوار دەوری دنیادا، پاشماوەی تەمەنی لە ماڵدا تێ پەڕاند. "مارکس"یش پاش داگیرساندنی چەند شۆڕشێک بڕیاری دا پاشماوەی تەمەنی لە گەڕەکەکانی دەوروبەری "بەریتانیا"دا بباتە سەر. بە گشتیی دەتوانین بەو دەرەنجامە بگەین کە ژیانی هێمن و ئارام، یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی پیاوە مەزنەکان بووە. چێژ و خۆشییەکانی ئەوان لەو چێژ و خۆشییە باوانە نەبوونە کە خەڵکی ئاساییش حەزیان لێیانە. هیچ ئامانجێکی گەورە، بەبێ کاری بەردەوام و شێلگیرانە نایەتە دی. ئەم کارە بەردەوامە ئەگەر خۆشەویستیی لەگەڵدا نەبێت هێندە وەڕسکەر و تاقەتپڕووکێن دەبێت کە بوارێکی ئەوتۆ بۆ سەرگەرمییە جدییەکان ناهێڵێتەوە. ئەڵبەتە هەندێک سەرگەرمییش بۆ قەرەبووکردنەوەی وزە لە دەستچووەکانی درێژایی حەفتە زۆر پێویستن، کە لەوانە دەتوانین ئاماژە بە کەشەوانیی (شاخەوانیی) ڕۆژانی پشوو بکەین. ڕۆژانی پشوو، سەرکەوتن بۆ بەرزاییەکانی ئالْپ باشترین نموونەی قەرەبووکردنەوەی ئەم وزەیەیە.

مرۆڤ دەبێ هەر لە سەردەمی منداڵییەوە فێری تەحەمولکردنی ژیانێکی یەکچەشن و یەکدەست و ڕۆتینیی ببێت. دەبێ دایک و باوکانی ئەم سەردەمەی ئێمە لەم ڕووەوە بە توندیی لۆمە و سەرزەنشت بکرێن، چوونکە ڕێژەیەکی زۆری پێداویستییەکانی وەکوو [بینینی] شانۆگەریی و خواردنی باش و جلوبەرگی جوان و ڕازاوە بۆ منداڵەکانیان دابین دەکەن، بەڵام کەمتەرخەمن لەوەدا کە دەبێ چەند کاتژمێرێکیش بۆ منداڵەکانیان دابین بکەن کە [ژیانێکی] یەکدەست و ڕۆتینیی تاقیی بکەنەوە. دیارە کەسانێکیش هەن بەو شێوەیە نین و جیاوازن. بە گشتیی سەرگەرمییەکانی سەردەمی منداڵیی، دەبێ بە شێوەیەک بن کە منداڵ

٥٣ - Kant؛ ئیمانوئێل کانت (١٧٢٤ - ١٨٩٤)؛ فیلسووفی گەورەی ئەڵمانیی کە زیاتر لە هەشتا کتێب و نامیلکەی گەورە و بچووکی نووسیوە و باشترینەکانیان لە بواری ڕەخنەگرتن لە ئەقڵ و فەلسەفەن. بە باوەڕی ئەو، کات و شوێن، یەکێک لە شێوازەکانی هەستە و شتومەکەکان لەم شێوەیەدا وەکوو دەرکەوتنێک دەکەونە بەر دەستی هەستەکانی ئێمە و هەستەوەرەکانیشمان هەر لە خۆوە ناتوانن شتومەکەکان بناسن، بەڵام یاسای ئاکار پێویستی بە ئازادیی و مانەوەی ڕۆح و بوونی خوا هەیە. هەندێک لە بەرهەمەکانی بریتین لە: **ئەقڵی ڕەها**، **ڕەخنەی ئەقڵی کردەیی**، ڕەخنەی بنەمای **بنەما فەلسەفییەکانی فیزیک**.

54 - Darvin

وا لێ بکەن هەوڵ و تەقەلا بدات و لە کەشوهەوای ئاسایی و ڕۆژانە دووری بخاتەوە. ئەو سەرگەرمییە وروژێنەرانەی کە پاڵنەریان لەگەڵدا نەبێت، دەبێ لە ڕیزی یارییەکاندا بسڕدرێنەوە یان بایەخی کەمتریان پێ بدرێت. وروژان وەکوو مادەی هۆشبەر وایە کە تا زیاتر کەڵکی لێ وەربگیردرێت زیاتر حەزی لێ دەکرێت. سستیی و بێهێزیی جەستەیی لە کاتی وروژاندا، جیاوازیی هەیە لەگەڵ غەریزەدا. منداڵ کاتێک بە تەواوەتیی پەروەردە دەکرێت کە وەکوو نەمامێکی تازە، لە ناو خاکی سروشتیی و کەشوهەوایەکی سروشتییدا گەشە بکات. سەفەری بەردەوام و باوەڕگەلی خراپ و ناڕەوا و جۆراوجۆر لە بەرژوەندیی نەوەی گەنجدا نییە، چوونکە لەو ڕۆتینە سوودبەخشەی کە دەبێتە هۆی گەشەکردنیان بێبەشیان دەکات و، دەرفەتێکی ئەوتۆیان بۆ نامێنێتەوە کە [ژیانی] ڕۆتینیی تاقیی بکەنەوە.

با لێرەدا ئەوەش ڕوون بکەمەوە کە مەبەستم لەوە نییە کە یەکچەشنیی خۆی لە خۆیدا شتێکی باش و سوودبەخشە، بەڵکوو مەبەستم ئەوەیە کە بەبێ تاقیکردنەوەی، ناتوانین ئاکامگەلی بەکەڵکمان دەست کەوێت. بۆ نموونە لە ژیانی ژن و مێردایەتیدا، ڕۆتین، کاریگەریی و کەڵکی تایبەتیی خۆی هەیە.

لە ئاستێکی بەرزتردا شێعری "**پرلۆد**"ی وۆرد زۆرس لە بەر چاو بگرن! تێگەییشتن لە بیر و ئەندێشەکانی وۆرد زۆرس، تەنانەت بۆ گەنجێکی ژیر و وریای شارییش ئاسان نییە، بەڵام دەتوانێت تەحەمولیان بکات. گەنجێک کە خاوەنی ئامانجگەلی بنیاتنەر بێت، خۆبەخشانە دەتوانێت بەرگەی ڕێژەیەکی زۆری خەمۆکیی بگرێت، بە مەرجێک بزانێت ئەم تەحەمولکردنە پێویستە. بەڵام ئامانجە بنیاتنەرەکان هەر لە خۆوە لە هزری منداڵێکدا کە سەرتاپای ژیانی پڕ بووە لە ترس و شڵەژاویی و بشێویی، نایەنە ئاراوە. چوونکە ئەو بەردەوام بیری لە دەستکەوتنی چێژ و خۆشیی کردۆتەوە و وروژانگەلێکی تاقیی کردۆتەوە کە بتوانێت جێی ڕۆتینی بۆ پڕ بکاتەوە.

نەوەیەک کە بتوانێت باری خەمۆکیی تەحەمول بکات، کۆمەڵێک لە مرۆڤگەلی بچووک و بێهزە کە هەر لە خۆڕا لە ڕەوتی سروشتیی ژیان جیا بۆتەوە.

کەسانێک کە مەیلی ژیانیان تێدا لە ناو دەچێت، لەو گوڵانە دەچن کە لە لق بوونەتەوە و بۆ درێژەدان بە ژیان بە کەمترین دڵۆپە ئاوێکی ناو ئینجانە (گوڵدان) قەناعەت دەکەن.

من هیچ لە ئەفسانە نازانم و حەزیشم لە زمانی ڕەمز و نهێنیی نییە، بەڵام خۆزگە دەمتوانی بە دەربڕینێکی شاعیرانەتر ئەم ڕاستییەم بگێڕایەتەوە کە هەر چییەک هەین و هەر چییەک دەتوانین ببین، هەر بیر و باوەڕێکمان هەیە، دەبێ ئەوە قبووڵ بکەین کە ئێمە دانیشتووانی ئەم جیهانە خاکییەین و ژیانی ئێمەش بەشێکە لەم ژیانە خاکییە. ئێمەش وەکوو ئاژەڵ و ڕووەکەکان خواردنی خۆمان لەم زەوییە گەڕۆکەوە دابین دەکەین.

ژیانی سەر ئەم گۆی زەوییە، ئارام و یەکچەشنە؛ زۆر بە هێواشیی بەرەو پێشەوە دەڕوات. شەوان و ڕۆژان بەردەوام دووپاتە دەبنەوە. وەرزەکان بەردەوام دەگۆڕدرێن. بەڵام پاییز و زستانیش ڕێک هێندەی بەهار و هاوین بۆ ئەم گۆی زەوییە پێویستن. وەستان و مەنگیی، ڕێک هێندەی جووڵە و سووڕانەوە گرینگە. منداڵان زیاتر لە گەورەکان پێویستیان بەوە هەیە کە پێوەندییەکانیان لەگەڵ هەوراز و نشێوەکانی ئەم ژیانە خاکییەدا چاک بکەن و درێژەی پێ بدەن.

با بەسەرهاتێکی بچووکتان بۆ بگێڕمەوە: منداڵێکی دوو ساڵانم بینی کە لە "لەندەن"دا لە دایک بووبوو و ئەو دوو ساڵە هەر لە "لەندەن"دا ژیابوو. کاتێک بینیم، یەکەم جاری بوو کە لەگەڵ دایک و باوکیدا هاتبوو بۆ دەرەوەی شار [بۆ گەشت و سەیران]. زستان بوو و قوڕ و لیتە هەموو شوێنێکی گرتبووەوە. لە ڕوانگەی دایک و باوکەوە هیچ دیاردەیەکی جوان و سەرنجڕاکێش بەدیی نەدەکرا، بەڵام منداڵەکە هێندە ورووژابوو کە شادیی و خۆشییەکی لە ڕادەبەدەر بە ڕوخسارییەوە دیار بوو. لە سەر زەوییە قوڕاوییەکە چۆکی دادا و دەموچاوی خستە ناو ئەو گژوگیا و سەوزانەی کە لە ناو ئاو و بەفر و بارانەکەدا بەدیی دەکرا و بە جۆرە هاوار و قیژاندنێک، کەیف و خۆشیی خۆی دەردەبڕی.

ئەو کەیف و خۆشییەی کە ئەو منداڵە هەستی پێ دەکرد، سادە و ساکار و ڕاستەقینە و مەزن بوو. نیازە جەستەییەکان هێندە قووڵ و کاریگەرن کە ئەو تاکانەی لێیان بێبەشن، بە دەگمەن ساغ و تەندروست گەورە دەبن و گەشە دەکەن. ئەو چێژانەی کە پێوەندییان بە ژیانەوە نییە، لە کاتی تەواوبوونیاندا تاکەکان بە دڵێکی پڕ لە کەسەر و ناڕەزامەند و تەواو برسیی دەهێڵنەوە. بۆ نموونەی ئەو چێژانە دەتوانین ئاماژە بە قومار بکەین کە هیچ پێوەندییەکی بە خاک و ژیانەوە نییە. کەسێک کە مل بەم چێژانە دەدات، هیچیان لێ نازانێت. ئەم جۆرە چێژانە هیچ شتێک بە مرۆڤ نابەخشن کە بتوانین ناوی شادیی ڕاستەقینەی لێ بنێین. بە

پێچەوانەوە ئەو چێژانەی کە پێوەندییان بە خاک و ژیانەوە هەیە، هێندە سەرنجڕاکێشن کە چێژێکی ڕاستەقینە دەبەخشن و لە کۆتاییشدا بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ کاریگەریی چێژبەخشیان دەمێنێتەوە. ڕەنگە چێژەکانی جۆری دووهەم لە سەرەتای ڕوودانیاندا ئارامتر و لەسەرخۆتر لە چێژە وروژێنەرەکانی جۆری یەکەم بن، بەڵام مانەوەی زیاتر و شەکەتنەبوون، گرینگترین تایبەتمەندییانە.

بە ڕای من لێرەدا هیچ جیاوازییەک لە ئارادا نییە و ئەم بیروڕایە سادەترین و پێشکەوتووترین کار و پیشەکان دەگرێتەوە. ئەو منداڵە دوو ساڵانەی کە کەمێک پێشتر لێوەی دواین، بە گوێرەی ئەو شتانەی بۆم باس کردن، سەرەتاییترین جۆری پێوەندیی و گرێدان بە ژیانی زەمینییەوە نیشان دەدات. لە پلەیەکی باڵاتردا ئەم حاڵەتە لە شێعردا خۆی دەنوێنێت. شتێک کە شێعرە لیریکەکانی شکسپیر بەرز و بێهاوتا دەکات، هەمان ئەو هۆکارەیە کە منداڵێکی دوو ساڵان وا لێ دەکات لەگەڵ گژ و گیایەکی قوڕاوییدا بکەوێتە قسە و گفتوگۆوە.

بۆ نموونە تەماشایەکی ئەم دەستەواژەیە بکەن: «گوێ ڕادێرە بۆ چریکەی بولبول» یان «لە سەر ئەم لمە زێڕینانەدا بنیشنەوە«. لەم شێعرانەدا بە ئاشکرا دەرکەوتەی هەمان ئەو هەست و وروژانە بەدیی دەکەن کە منداڵە دوو ساڵانەکە بە هاوار و قیژەکانی دەری دەبڕێت. بە گشتیی جیاوازیی نێوان خۆشەویستیی و سێکسێکی ئاسایی (واتە جەستەیی) بهێننە پێش چاوتان. خۆشەویستیی ڕووداوێکە بە تووشبوونی، هەموو بوون و گیانمان تێوەی دەئاڵێت و ڕۆح و گیانێکی تازە بە بوونمان دەبەخشێت، بەڵام لە پێوەندییەکی سێکسیی بەتاڵ لە خۆشەویستییدا، هەستێکی ئاوها بەدی ناکرێت. کاتێک چێژێکی کاتیی و زووتێپەڕ کۆتایی هات، شەکەتیی و ڕق و نەفرەت و هەست بە پووچیی ژیان دێتە ئاراوە. خۆشەویستیی بەشێکە لە ژیانی زەمینیی و، پێوەندیی سێکسیی بەتاڵ لە خۆشەویستیی، شتێکی ترە.

ئەو خەمۆکییە تایبەتەی کە ئەمرۆکە بەرۆکی شارنشینانی گرتووە، تا ڕادەیەکی زۆر لە دوورکەوتنەوەیان لە ژیانەوە سەرچاوە دەگرێت. ئەم جۆرە ژیانە، لە سەفەرکردن بۆ بیابانگەلێکی گەرم و سووتێنەر دەچێت کە کەسی مسافر تا دێت زیاتر هەست بە تینوویەتیی دەکات.

کەسانێک کە لە ڕووی داراییەوە هێندە دەوڵەمەندن کە دەتوانن بە ویست و ئارەزووی خۆیان ڕێگای ژیانیان هەڵ بژێرن، بە هۆی تووشبوونیان بە خەمۆکییەوە، بەرەوڕووی ترسێک دەبنەوە کە خۆی ڕێژەی خەمۆکییان زیاتر دەکات. هەندێ جار بارودۆخەکەیان وای لێ دێت قابیلی تەحەمولکردن نییە. ئەوان بۆ هەڵاتن لە خەمۆکیی، تەنانەت لە خەمۆکییە سوودبەخشەکانیش هەڵ دێن و دەکەونە داوی خەمۆکیی نەرێنییەوە.

ژیانی شاد و بەختەوەرانە تا ڕادەیەکی زۆر، دەبێ ئارام و بێدەردەسەریی بێت، چوونکە تەنها لە بارودۆخێکی ئاوادایە کە ئارامش، ئامادەبوونی شادیی و خۆشیی ڕاستەقینە مسۆگەر دەکات.

## ٥

### شەکەتیی

شەکەتیی چەندین جۆری هەیە کە هەندێکیان گەورەترین بەربەستن لە بەردەم ئارامشدا. ئەگەر شەکەتیی بە تەنها جەستەیی و بە ڕادەیەکی دیاریکراو بێت، دەتوانێت ببێتە هۆی خۆشیی و خەوێکی قووڵ و ئارەزوویەکی باش بۆ خواردن و، هەروەها حەزی مرۆڤ بۆ شادیی و خۆشییەکانی ڕۆژانی پشوو بورووژێنێت. بەڵام شەکەتیی لە ڕادەبەدەر زیانی زۆر بە مرۆڤ دەگەیەنێت. ژنانی ناو گوندەکان بهێننە پێش چاوتان کە بێجگە ئەوانەیان کە لە کۆمەڵگا شارستانییەکاندا دەژین، لە تەمەنی سی ساڵاندا پیر دەبن. پیربوونەکەشیان بە گشتیی بە هۆی کاری زۆر و شەکەتییەوەیە. ئەو منداڵانەی کە لە سەردەمە پڕکارەکەی بە پیشەسازیبووندا ناچار بوون کار بکەن و هێشتاکەش لە ناو هەندێ کۆمەڵگای وەک "چین" و "ژاپۆن"دا نموونەیان ماوەتەوە، جەستەیان بە تەواوەتیی گەشە ناکات و زۆربەیان هەر بە گەنجێتیی دەمردن. ئەگەر کارکردن لە ڕادەیەکی دیاریکراوی تێ پەڕێنێت، ئەشکەنجە و ئازارێکی لێ دەکەوێتەوە کە ژیان لە مرۆڤ تاڵ و تەحەمولنەکراو دەکات. ئەمڕۆکە لە وڵاتانی ئەمریکای لاتیندا نموونەی کاری لە ڕادەبەدەری جەستەیی هێشتا برەوی هەیە.

لە وڵاتە پێشکەوتووەکانی جیهاندا بە هۆی پێشکەوتنی ئامێرە پیشەسازییەکانەوە تا ڕادەیەکی زۆر، شەکەتیی جەستەیی کەم بۆتەوە. زیاترین شەکەتیی ناو کۆمەڵگا پێشکەوتووەکانی ئەمڕۆ، شەکەتیی عەسەبییە و جێی سەرسووڕمانە کە زیاتر چینی دەوڵەمەند و تاکە خۆشگوزەرانەکان بە دەست ئەم جۆرە شەکەتییەوە دەناڵێنن. یان بە واتایەکی

ڕوونتر بڵێین شەکەتیی عەسەبیی، لە ناو کرێکاران و ئەوانەی کە کاری حەقدەسانە دەکەن کەمترە لەو کەسانەی کە ڕاستەوخۆ بە کاری فکرییەوە سەرقاڵن.

لەم سەردەمەی ئێمەدا بەرەنگاربوونەوەی شەکەتیی عەسەبیی، کارێکی ئێجگار دژوارە. بۆ نموونە تاکەکان بە درێژایی کاتژمێرەکانی کارکردنیان، بەرەوڕووی پرسە وەڕسکەر و ئازاردەرەکان دەبنەوە. تەنانەت کرێکاری شارنشین، لە مەودای نێوان کارخانە وماڵەوەش، بە ناچار دەبێ چەندین جۆر دەنگ و ژاوەژاوی جۆراوجۆر تەحەمول بکات. هەر چەند بەوە ڕاهاتووە کە بە ئەنقەست و ئاگایانە ئەم دەنگانە نەبیستێت، بەڵام بە هەر حاڵ لە درێژخایەندا مێشک و دەماری هیلاک دەکات و دایدەڕزێنێت. هیلاکیی و داڕزانەکەش بەم شێوەیە دەبێت کە تاک نابەرهەستانە (ناخودئاگا) هەوڵی نەبیستنی ئەو دەنگانە دەدات.

چاوپێکەوتن و بینینی کەسانی بێگانەش یەکێک لەو شتانەیە کە شەکەتیی عەسەبیی لێ دەکەوێتەوە. غەریزەی جۆری مرۆڤیش وەکوو ئاژەڵەکانی دیکە، لە بەرانبەر مرۆڤە نەناسراوەکانی دیکەدا دەکەوێتە جووڵە و دەیەوێت ڕێگایەک بۆ بەرەوڕووبوونەوە لەگەڵیاندا بدۆزێتەوە؛ واتە دەیەوێت بزانێت ئایا دەبێ هەڵسوکەوتێکی دوژمنکارانەیان لەگەڵدا بنوێنێت یان دۆستانە؟ ئەم غەریزە لای کەسانێک کە بۆ هاتوچۆکانیان کەڵک لە پاس و مێترۆ وەر دەگرن، زۆر زیاتر و جاڕسکەرترە. سەر لە بەیانییە و تاک بە پەلە خۆی بۆ چوونەسەر کار ئامادە دەکات. هەڵەشەیی و پەلەکردن بۆ زوو گەییشتنە سەرکار و بە پەلە خواردنی نانی بەیانیی، دەبێتە هۆی تێکچوونی هەرسی گەدە و، لە ناو ڕێگاشدا کەسانی نەناسراو و نامۆی زۆری دێتە سەر ڕێگا. لەم هەلومەرجەدا هەموویان وەکوو یەک وان و کەس خۆی بە سەر ئەوی تردا دانەسەپاندووە، بەڵام هەستێکی غەریزیی بەرەوڕووبوونەوە لەگەڵ کەسانی نائاشنادا دەبێتە هۆی شەکەتیی عەسەبیی و تاک کاتێک دەگاتە شوێنی مەبەست و کاری ڕۆژانەی دەست پێ دەکات، ئەعسابێکی شەکەت و هیلاکی هەیە کە کارکردنی بە لاوە سەخت و تەحەمولنەکردە دەکات. لەم بارودۆخەدا هەستێکی لە لا دروست دەبێت کە بە چاوی موزاحیم لە کەسانی چواردەوری دەڕوانێت و بۆی تەحەمول ناکرێن. خاوەنکاریش کە بە هەمان شێوە هاتۆتە سەر کار، وەک نە بای دیبێت و نە باران، کارێکی وا ناکات کەس پێی بزانێت.

ترسی دەرکردن لە سەر کار، دەبێتە هۆی ئەوە کە زۆر بە ئەدەبەوە هەڵسوکەوت بکات و هەر ئەم هەڵسوکەوتە ناسروشتییەش زەختی زیاتر دەخاتە سەر مێشک و دەماری. ئەگەر کرێکاران هەفتەیەک جارێک بۆیان هەبوایە تۆڵە لە خاوەنکارەکانیان بکەنەوە و بەبێ هیچ ترسێک پێیان بڵێن چ هەستێکیان بەرانبەریان هەیە، بە ڕادەیەکی زۆر مێشک و دەماریان ئەهوەن و ئاسوودە دەبووەوە. بەڵام ئەو سووکناییە بە تەنها کرێکاران دەگرێتەوە و بۆ خاوەنکارەکان کە چەندین کێشە و گرفتی عەسەبییان هەیە، هیچ سوودێکی نییە. وەک چۆن ترسی دەرکردن لە کار وڕەی کرێکار و فەرمانبەر دەڕووخێنێت؛ ترسی هەڵشکانیش وڕەی خاوەنکار دەڕووخێنێت. ڕاستە هەندێک لە خاوەنکاران لە پێگەیەکدان کە هەرگیز بیر لە هەڵشکان ناکەنەوە، بەڵام هەر ئەم تاقمە بۆ گەییشتن بەم پێگەیە، هێندە سەر و سەودایان کردووە و هێندە بەرەوڕووی پیلانی ڕکابەرەکانیان بوونەتەوە و هێندە سەفەریان کردووە و هێندە ڕەنج و شەونخوونییان کێشاوە کە ئێستاکە بە دەست جەستەیەکی هیلاک و ماندوو و پڕ لە هیلاکیی عەسەبییەوە دەناڵێنن. خاوەنکار بەردەوام شەکەت و هیلاک و نەخۆشە و، هێندە بەو شڵەژاوییەشی خووی گرتووە کە تەنانەت لە ڕۆژانی ئاساییشدا ڕووی تێ دەکاتەوە. کوڕە دەوڵەمەندەکانیش ڕێک هێندەی تەحەمول و توانای هەژاران بۆ تەحەمولکردنی هەژاریی و نەداریی، بارودۆخێکی لەبار و ئامادەیان بۆ وەرگرتنی دڵەڕاوکێ و شەکەتیی عەسەبیی هەیە. ئەوان بە ڕووکردنە هەندێ شتی وەک قومار و قوماربازیی، دایک و باوکانیان جاڕس دەکەن و لە لایەکی دیکەشەوە بە هۆی شەوگەردیی و سەرقاڵبوون بە کەیفخۆشییە بێهوودەکانی شەوانەوە، دەبنە هۆی داڕزین و هیلاکیی جەستە و دەماری خۆیان. ئەم گەنجە دەوڵەمەندانە لە کاتێکدا شوێن پێی باوکانیان دەگرنەوە کە توانای بەدەستهێنانی ئیرادیی و نائیرادیی داگیرکردنی بەختەوەرییان لە دەست داوە. هەر چۆنێک بێت مرۆڤی ئەم سەردەمە بیهەوێت و نەیهەوێت تووشی شەکەتیی عەسەبیی دەبێت. لە سەردەمە نوێیەدا تاکەکان هیلاکتر لەوەن کە بەبێ ڕووکردنە مەشرووبخواردنەوە بتوانن ئەعسابێکی ئارام و ئاسوودەیان هەبێت.

لێرەدا باسی ئەو دەوڵەمەندە نەزانانە ناکەین کە لە بری بەختەوەریی، کۆمەڵێک لە هۆکارەکانی بەدبەختیی بۆ خۆیان کۆ دەکەنەوە، بەڵکوو بارودۆخی ئەو کەسە ئاساییانە تاوتوێ دەکەین کە شەکەتییان لە کاری سەخت و تاقەتپڕووکێن و بە مەبەستی دابینکردنی

بژێویی ژیانەوە سەرچاوە دەگرێت. لەم جۆرە نموونانەدا، شەکەتیی، زیاتر بەرهۆکار (مەعلوول)ی دڵەڕاوکێ و نیگەرانییە و دەتوانرێت بە هەڵبژاردنی فەلسەفەیەکی باشتر بۆ ڕوانین لە ژیان و نەزمی فکریی، بخرێتە ژێر ڕکێفەوە و جڵەو بکرێت. زۆربەی تاکەکان (بە ژن و پیاوەوە) ناتوانن بە سەر بیر و ئەندێشەکانیاندا زاڵ ببن - مەبەستم نەتوانینە بۆ کۆنترۆڵکردنی ئەندێشە نیگەرانکەرەکان، واتە ئەو پرسانەی کە بە ورکە و دڵەڕاوکێ و نیگەرانیی هیچ چارەسەرێکیان بۆ نادۆزرێتەوە. خەڵکانێکی زۆر، کێشە و ئاریشەکانی ڕۆژانە و شوێنی کارکردنیان دەگوێزنەوە بۆ ماڵەوە و تەنانەت بۆ ناو نوێنیش و ڕێک لەو کاتانەدا کە دەبێ بە ئارامشەوە وزە [بۆ جەستە و ڕۆحیان] کۆ بکەنەوە، بە پێچەوانەوە بیر لە بابەتە تاڵ و ناخۆشەکان دەکەنەوە. بیرکردنەوە لە کێشەکانی ڕۆژی ڕابردوو و زیندووکردنەوەیان هیچ یارمەتییەکیان نادات بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانیان. لەم کاتانەدا بیرلێکردنەوە و لێوردبوونەوە، هیچ ڕێگەچارەیەکی لێ ناکەوێتەوە بەڵکوو تەنها داماویی و هیلاکیی و بێخەویی لێ دەکەوێتەوە. کە بەیانیی دادێت هێشتا پاشماوەی بیرکردنەوە بێهوودەکانی شەوی ڕابردووی لە مێشکدا ماوەتەوە و کاریگەریی «نەرێنیی»ش لە سەر کار و کردەوەکانی ئەمڕۆشیان دادەنێت؛ [بە درێژایی ڕۆژ] مۆن و تووڕەن و بە تووڕەییەوە بەرەوڕووی پرسە تازەکان دەبنەوە.

**کەسی ئاقڵ بە تەنها کاتێک بیر لە کێشە و گرفتەکانی دەکاتەوە کە بیهەوێت چارەسەریان بکات.**

لە کاتەکانی تردا بیر لە شتانی دیکە دەکاتەوە و شەویش بیر لە هیچ ناکاتەوە. دیارە مەبەستم ئەوە نییە کە تاک لە هەندێ کاتی ئاوارتەی وەک هەڵشکانێکی ئابووریی کە لەوانەیە تووشی ببێت، یان کاتێک کە پیاوێک بە تەواوەتیی پێوەندییە سێکسییە ناڕەواکانی هاوسەرەکەی [واتە خیانەتی هاوسەریی] بۆ دەرکەوتووە، بیر نەکاتەوە. بە هەر حاڵ دەبێ لە هەندێ کاتدا بە هێنانەئارای نەزمێکی فکریی، بیر لەو بابەتانە بکرێتەوە کە بە تەمای چارەسەرکردنیانە. ئەوە شتێکی زۆر سەرنجڕاکێشە ئەگەر بزانین پەروەردەکردنی بیر و ئەندێشەگەلی دروست و، زانینی ئەوە کە کەی دەبێ بیر لە چ شتێک بکەینەوە، تا چەند کاریگەریی لە سەر گەشەکردنی بەختەوەرییمان دادەنێت. دەبێ کاتێک بڕیار لە سەر [چارەسەرکردنی] کێشەیەک بدەین کە هەموو زانیارییە پێویستەکانمان کۆ کردبێتەوە. لە

کاتێکی ئاوادا دەبێ هەموو بیرکردنەوەکان بەبێ هیچ شڵەژاویی و پەرێشانییەک بە دەوری ئەو پرسەدا بسووڕێنەوە و لە سەری چڕ ببنەوە. لە وەها کاتێکدا وەرگرتنی بڕیارێکی دروست و لۆژیکیی، زۆر سوودبەخش و کاریگەر دەبێت. هێندەی بکرێت دەبێ واز لە دوودڵیی و گومان بهێنن و تەنها لە کاتێکدا بڕیارەکەتان بگۆڕن کە زانیاریگەلی تازەترتان دەست کەوتبێت. هیچ هۆکارێک هێندەی ڕاڕایی، شەکەتیی ناخولقێنێت. بێبڕیاریی خراپترین شتە، چوونکە بێبڕیاریی، هەستکردن بە پووچیی و بێهوودەیی لێ دەکەوێتەوە. یەکێک لە ڕێگەکانی بەرەوڕووبوونەوەی هەندێک لە ورکە ناخەکییەکان، بەئاگابوونە لەو پرسانەی کە نیگەرانییان خولقاندووە. من زۆر لێدوانم پێشکەش کردووە و سەرەتاکان زۆر لە بەردەنگ و گوێگرەکانم دەترسام و عەسەبیی دەبووم و هەر ئەوە وای لێ دەکردم نەتوانم باش قسەکانم بکەم. ئەم بابەتە هەندێ کێشەی بۆ خولقاندم و هێندە تەنگی پێ هەڵچنیم کە هیوام دەخواست قاچم بشکایە و بیانووی بەشدارییینەکردن لە لێدوانەکانم دەست کەوتایە و کاتێکیش کۆبوونەوەکە تەواو دەبوو بە ئەعسابێکی تێکشکاو و داتەپیوەوە دەگەڕامەوە بۆ ماڵەوە. وردە وردە ئەو ڕاستییەم بە خۆم سەلماند کە باش و خراپیی قسەکانی من هیچ کاریگەرییەکی لە سەر گۆڕینی بارودۆخی دنیا و چارەسەرکردنی کێشە و گرفتەکاندا نییە و ئەوەشم بە خۆم سەلماند کە تا ڕادەی دڵەڕاوکێکانم کەمتر بکەمەوە، باشتر و ئاسانتر دەتوانم قسە بکەم. هەر ئەم کارەشم کاریگەریی خۆی دانا و وردە وردە پەشۆکاویی و شڵەژاوییەکانی دوای لێدوانەکانم ڕەوینەوە. ئێوەش دەتوانن بەم شێوەیە بەرەوڕووی زۆرێک لە هۆکارەکانی هیلاکییە عەسەبییەکانتان ببنەوە. کارەکانی ئێمە زۆربەی کات هێندە گرینگ نین کە خۆمان بیری لێ دەکەینەوە و شکستخواردن و سەرنەکەوتنیش تیایاندا هێندە گرینگ نییە. تەنانەت دەتوانین کارەساتە هەرە گەورەکانیش لە بیر بکەین و وەک ئەزموونێک چاویان لێ بکەین و پشتگوێیان بخەین.

ئەو کێشە و نەهامەتییانەی کە پێمان وایە بۆ هەمیشە لە بەختەوەریی بێبەشیان کردووین، بە تێپەڕبوونی زەمەن لە بیر دەچنەوە و ڕۆژێک دادێت کە بچووکترین ئاسەوارێک لە تاڵیی و ناخۆشییەکانیشمان بە بیر نایەتەوە. ئەمە ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگرە کە »بوون«ی هیچ کەسێک بەشێکی گەورەی جیهان نییە. کەسێک کە توانای چڕکردنەوەی بیر و بۆچوونەکان و پەرەپێدانی هێزەکانی خۆی هەبێت، لە کاتی بەرەوڕووبوونەوە لەگەڵ کێشەکانی ژیاندا وەها

ئارامش و سووکناییەک بە دەست دێنێت کە ئەم ئارامشە بۆ کەسانی خۆپەرست، بە هیچ شێوەیەک دەست نادات و ناتوانن بیریشی لێ بکەنەوە.

سەبارەت بەو شتەی کە بە »تەندروستیی ئەعساب» ناوی لێ دەبەین، تا ئێستا لێکۆڵینەوەی ئەوتۆ ئەنجام نەدراوە. دیارە ئەم باسە شتێکی جیا لە دەروونناسیی پیشەسازییە، کە پشتی بە گەلێک توێژینەوە و لێکۆڵینەوە لەو بوارەدا قایمە. دەرەنجامی لێکۆڵینەوە دەروونناسانەکانی ئەمدواییانە ئەوە دەردەخات کە ئەگەر ئێوە بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ کارێک ئەنجام بدەن، تووشی شەکەتیی دەبن و دیارە بە تاقیکردنەوەش دەتوانین بەم ئەنجامە بگەین و پێویست بە زانیارییەکی بەرز و چڕوپڕی دەروونناسانەش ناکات.

زۆربەی زۆری لێکۆلینەوە سایکۆلۆژییەکان لە سەر شەکەتیی جەستەیی ئەنجام دراون و سەبارەت بە شەکەتیی و سەرکوێریی خوێندکارانیش هەندێ لێکۆڵینەوە ئەنجام دراوە کە هیچکامیان پێوەندییەکی ئەوتۆیان بە باسەکەی ئێمەوە نییە؛ واتە شەکەتیی ڕۆحیی و عەسەبیی. بەرچاوترین شەکەتیی ئەم سەردەمەی ئێمە، ورووژان (هەیەجان)ە. شەکەتییە جەستییەکان بە خەو و خواردن چارەسەر دەکرێن. شەکەتیی فکریی بەتاڵ لە دڵەڕاوکێش وەکوو شەکەتیی جەستەیی، قابیلی چارەسەرکردنە. زۆربەی کات زیانەکانی کارگەلی تاقەتپڕووکێن چەند هۆکارێکی دیکەشی هەیە کە بە گشتیی هەڵقولاوی دڵەڕاوکێن. دڵەڕاوکێگەلێکیش کە زۆربەیان هیچ و پووچن و گرینگیی پێدانیشیان مرۆڤ لە خەو و خواردن دەخەن. پرسی گرینگ لە بارەی شەکەتیی، ئەوەیە کە زۆربوونی شەکەتیی دەبێتە هۆی دژواربوونی بەرەنگاربوونەوەی.

یەکێک لە نیشانەکانی تێکچوونی خێرای نەزمی عەسەبیی، هاتنەئارای هەندێک بۆچوونی بێهوودەیە کە بەشێکی زۆری هزرمان داگیر دەکەن. بۆ نموونە لەم حاڵەتەدا بە خۆمان دەڵێین ئەگەر فلانە سەفەر بکەم، فلانە ڕووداوی ناخۆش ڕوو دەدات، یان ئەگەر بە مەبەستی ئیسراحەت وەرگرتن چەند ڕۆژێک واز لە کارەکەم بێنم، چەندین بەلامان بە سەردا دەبارێت. ئەگەر من پزیشک بوومایە، بۆ هەموو ئەو مرۆڤە پڕکارانەی کە گرینگیی زۆر بە کارەکەیان دەدەن، ئیسراحەتم بۆ پێشنیار دەکردن. تێکچوونی نەزمی عەسەبیی کە پێدەچێت بە هۆی کاری زۆرەوە بێت، لە ڕاستییدا بە هۆی ئەو بیرۆکە بێهوودانەیە کە کەسی نەخۆش

هەوڵ دەدات بە پشتبەستن بە کارەکەیەوە لە دەستیان هەڵ بێت. وەها نەخۆشێک ئازایەتیی یان حەزی وازهێنان لە کارەکەی نییە، چوونکە ئەگەر وا بێت هیچ ئامرازێکی بۆ جیاکردنەوەی ئەندێشە سوودبەخش و بێسوودەکان لە یەکتریی پێ نییە. ئەڵبەتە ڕەنگە ئەو کێشەیەی بە هۆی ترس لە «هەڵشکان» بێت کە لەو حاڵەتەدا کارەکەی، پێوەندیی ڕاستەوخۆی بە ئاڵۆزیی بیر و خەیاڵییەوە هەیە. بەڵام لەو کاتەشدا ئەگەری ئەوە هەیە کە دڵەڕاوکێ و بیرئاڵۆزیی، کاریگەریی لە سەر دابنێت و توانای داوەرییکردنی دروست و لۆژیکیی لە دەست بدات و زۆر زووتر و پێشوەختتر لەوە تووشی هەڵشکانێک بێت کە بیری لێ دەکاتەوە. بە گشتیی ورکە و دڵەڕاوکێ دەبێتە هۆی تێکچوونی نەزمی عەسەبیی و خودی «کار» دەورێکی ئەوتۆی نییە.

سایکۆلۆژیای دڵەڕاوکێ، بابەتێکی سووک و ئاسان نییە. پێشتر سەبارەت بە نەزمی فکریی، واتە ڕاهاتن لە سەر بیرکردنەوەی گونجاو و لە کاتی خۆیدا قسەم کردووە. ئەم نەزمە زۆر گرینگە. یەکەم؛ ئەوەی کە بە بەکارهێنانی کەمترین هێزی بیرکردنەوە، دەتوانرێت بە باشترین شێوە کارەکە ئەنجام بدرێت. دووهەم؛ باشترین چارەسەری بێخەوییە. سێهەم؛ توانای هێز و ئەقڵمان بۆ بڕیاردان زیاتر دەکات؛ بەڵام ئەم جۆرە شێوازانە هیچ پێوەندییەکیان بە نەست(ناخودئاگا)ەوە نییە و هەندێک لە پرسەکان هێندە ئاڵۆزن کە بێسێودوو، کاریگەریی لە سەر هەست(خودئاگا)دا دادەنێن. دەروونناسان لێکۆڵینەوەی زۆریان سەبارەت بە کارکردی «نەست» ئەنجام داوە بەڵام لە چاو «نەست»دا، لێکۆڵینەوەیەکی ئەوتۆیان لە سەر کارکردی «هەست» نەکردووە. سەرەڕای ئەمانەش ئەوەی دووهەم، بە هۆی کاریگەرییەک کە لە سەر تەندروستیی ئەقڵانییدا هەیەتی، زۆر گرینگە و ئەگەر بڕیار بێت باوەڕگەلی بنەڕەتیی، کاریگەریی لە سەر نەست دابنێن، دەبێ بە تەواوەتیی بیناسین. ئەم بابەتە بە تایبەتی سەبارەت بە دڵەڕاوکێ و نیگەرانییش، ڕاستیی لە خۆ دەگرێت.

بۆ نموونە زۆر ئاسانە بڵێین ئەگەر فلانە شت ڕوو بدات، بە هیچ شێوەیەک ناترسم، ئەم تەسەورە تا ئەو کاتەی کە هەست(خودئاگا) داگیر بکات، کێشەیەکی ئەوتۆی لێ ناکەوێتەوە، بەڵام ئەگەر خۆی گەیاندە نەست و داگیری کرد، بێخەویی و شڵەژاویی و چەند ئاڵۆزییەکی تری فکریی لێ دەکەوێتەوە. من پێم وایە ئەگەر وزە و توانای پێویست بە

«هەست» بگەینین، دەتوانێت نەست بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە و کۆنترۆڵی بکات. زۆرێک لە ناواخنەکانی نەستی ئەمڕۆمان، بەرهەمی بیرۆکە ورووژێنەرەکانی دوێنێ و ڕۆژانی تری ڕابردوومانن کە ئەمڕۆ لە ناو نەستماندا بە خاک سپێردراون و جێگیر بوونە. دەتوانین ئەم بە خاک سپاردنەش بە ئیرادەی خۆمان ئەنجام بدەین و، بەم جۆرە نەستمان بکەین بە سەرچاوەی شتە باش و سوودبەخشەکان. بابەتێک کە ئێستا دەمەوێ بۆتانی باس بکەم، ئەزموونێکی کەسەکیی خۆمە. ماوەیەک لەمەو بەر ئەوەم بۆ دەرکەوت کە کاتێک دەمەوێ بابەتێکی دژوار بنووسم، چەند کاتژمێر و تەنانەت چەند ڕۆژی تەواو بە هەموو هێزمەوە بیری لێ دەکەمەوە. سەرەنجام وای لێ دێت بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیک فەرمانێکی تازە دەردەکرێت و وەک بڵێی هەڵمێک لە ناو ئەو شوێنە زێڕینەدا دەگەوێتە گەڕ. پاش ماوەیەک کە بە هەستی خۆم دەچمەوە سۆراخی ئەو کارەوە، دەبینم کە کارەکە بە باشترین شێوە جێبەجێ کراوە. پێش دۆزینەوەی ئەم ڕاستییە، لەو وەستانە چەند حەفتەیی و چەند مانگەیە دەترسام کە دەکەوتە نێوان بیرکردنەوە و نووسینەوە. کاتێکی زۆرم بۆ بەدەستهێنانی ئەم دەرەنجامە بە فیڕۆ چوو و بە ڕاستیی حەیفی ئەو هەموو مانگە کە بە سەرگەردانیی و نیگەرانیی تێپەڕم کرد. لە کاتی ئەگەری ڕوودانی کارەساتە دڵتەزێنەکاندا، بە هەموو توانای فکریتانەوە بیر لە خراپترین لایەنی ئەو ڕووداوانە بکەنەوە و لە ئاکامدا خراپترین شێوازی ئەو ڕووداوانە لە فکرتاندا پراکتیزە بکەن و بە یارمەتیی هۆکارگەلی لۆژیکییەوە دەست بە شرۆڤە و شیکردنەوەی بکەن. لە وەها هەلومەرجێکدا بۆتان دەردەکەوێت کە ڕووداوەکە ئەگەریش ڕوو بدات، هێندە کارەساتبار نابێت. چوونکە لە خراپترین شێوازێکدا ڕوو نادات کە بایەخێکی جیهانیی هەبێت. پاش ئەوەی کە بۆ چەند جار بیرتان لە خراپترین لایەنی کردەوە، بەوپەڕی متمانە بەخۆبوونەوە بە خۆتان بڵێن «باشە کەواتە ئەم بابەتە بە گشتیی هێندە گرینگ نییە!« دەبینن کە بە ڕادەیەکی زۆر، ورکە و دڵەڕاوکێتان کەم دەبێتەوە. ڕەنگە دووپاتەکردنەوەی ئەم کارە پێویست بێت بەڵام ئەگەر لە کۆتاییدا ترستان لە بەرەنگاربوونەوەی خراپترین لایەنی ڕووداوەکە نەبێت، بە دڵنیاییەوە دڵەڕاوکێکەتان سڕاوەتەوە و کەواتە ئارامش و ئاسوودەیی جێگیر بووە.

ئەم ڕێگایەی کە پێشنیار کرا، یەکێک لە کردەییترین ڕێگەکانی بەرەنگاربووونەوەی ترسە. نیگەرانیی، هەڵقوڵاوی «ترس»ە و هەموو جۆرەکانی ترسیش، هیلاکیی و شەکەتیتان

بە سەردا دەسەپێنن. کەسێک کە ڕێگای هەڵاتن لە ترسی دۆزیبێتەوە، تا ڕادەیەکی زۆر لە ژیانی ڕۆژانەیدا، ڕێ لە شەکەتیی خۆی دەگرێت و لە هەمان کاتدا لە مەترسیدارترین بەشی ترس واتە ڕوودانی مەترسیی، پارێزراوە. لە هەندێ کاتدا بیرۆکەگەلێکی مەترسیدار بە مێشکی مرۆڤدا ختووره دەکەن کە هێز و توانایان بەندە بەوەوە کە تاک چۆن هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکات. بە هەر حاڵ هەموو تاکێک هەندێک ترسی شاراوەی هەیە. یەکێک لە شێرپەنجە دەترسێت، ئەوی تر لە ڕیسوابوون و ناوزڕان و دەرکەوتنی نهێنییە ئابڕووبەرەکەی و... سەرەنجام یەکێکیش بە دەست دڵپیسیی و ئێرەییردنی نابەجێوە دەناڵێنێت. کەسانێکیش لەوە دەترسن ئەفسانەی ئاگری دۆزەخ کە هەر بە منداڵیی بۆیان باس کردووە و خزاندوویانەتە مێشکییەوە و دەبوایە ڕێی لە کارە قێزەونەکانی بگرتایە، ڕاست بێت. بە گشتیی تاکەکان لە کاتی بەرەوڕووبوونەوەی ترس و نیگەرانییدا شێوازگەلی دروست بە کار ناهێنن و بە شێوەیەکی کزۆڵانە هەوڵ دەدەن بە بیرکردنەوە لە شتێکی تر و خۆسەرقاڵکردن بە کار یان سەرگەرمییەکی دیکەوە خۆیان لەو پرسە غافڵ بکەن.

ئەگەر جەوهەری ترس بە تەواوەتیی نەخرێتە بەر شرۆڤە و شیکارییەوە، ترسناکتر دەبێت. هەوڵدان بۆ سەرقاڵکردنی تاکەکان بە بابەتێکی ترەوە، خەڵاتێکی باش و گونجاوە بۆ ئەو دێوەزمەی وەهم و خەیاڵەی کە تاک پێشتر هەوڵی داوە لە دەستییەوە هەڵبێت. باشترین شێوەی بەرەنگاربوونەوەی ئەم ترسانە، شیکردنەوە و لێکدانەوەی دروست و لۆژیکییانە و، هەروەها ڕاهاتنە لەگەڵ هەندێکیاندا. چوونکە ئەم ڕاهاتنە وەکوو ڕاهاتن بە گیانەوەرێکی وەحشیی، سەرەنجام ترسەکە دەشکێنێت و پاش ماوەیەک بابەتی پێڕاهاتوو، وەڕسکەر دەبێت و بەبێ هیچ هەوڵ و تەقەلایەک لە دەستییەوە هەڵ دێین. ئەگەر پێتان خۆش بوو بیر لە بابەتێکی ترسێنەر بکەنەوە، زیاد لە پێویست بیری لێ بکەنەوە تا لە لاتان ئاسایی بێتەوە و سەرنجڕاکێشییەکەی لە دەست بدات.

یەکێک لەو کەموکوڕییانەی کە کاریگەریی لە سەر ڕەچاوکردنی بنەما ئاکارییەکانیش دادەنێت، ترسە. بە دڵنیاییەوە دەبێ چاوەڕێی ئەوە لە هەموو خەڵک بکەین بە تایبەت لە ڕۆژانی جەنگدا کە لە ڕووی جەستەییەوە ئازا و بوێر بن. کارمان بە جۆرە ئازایەتییەکانی دیکەوە نییە بەڵام چاوەڕێی ئازایەتییەکی لەو ڕادەیە لە ژنان ناکەین. ژنێکی بوێر ئەگەر

بیهەوێت بکەوێتە بەر دڵی پیاوان، دەبێ ئازایەتییەکەی بشارێتەوە. لە لایەکی دیکەوە ئەگەر پیاوێک لە هەموو ڕوویەکەوە بێجگە لە لایەنی جەستەیی ئازا بێت، کەسێکی نەخۆشە کە پێویستی بە چارەسەرکردن هەیە. بۆ نموونە کەمتەرخەمیی بەرانبەر بە ڕای گشتیی، بە جۆرە ئازایەتیی و بوێرییەک لە قەڵەم دەدرێت و ئەوەش لە کاتێکدایە ئەو کۆمەڵگایە سزای ئەو کەسە دەداتەوە کە ئازایانە و بە هەموو هێز و توانایەوە ڕای گشتیی نادیدە دەگرێت و بە پشتگوێی دەخات. بەڵام بە گشتیی دەبێ بایەخ بە بوێرییەکانی چ ژن و چ پیاو بدرێت. بۆ نموونە دەتوانین بە شێوەیەک کەڵک لە ئازایەتیی گەنجێک وەربگرین کە کۆمەڵگا خوازیاریەتی. بە هەر حاڵ تا بوێریی و ئازایەتیی زیاتر بێت، ترس و دڵەڕاوکێ کەمترە و کاتێکیش ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە زۆربەی داڕزینە عەسەبییەکان لە ترسەوە سەرچاوە دەگرن، دەبێ بەهایەکی ژیاتر بۆ ئازایەتیی قایل بین. وەک چۆن ئازایەتیی سەرباز لە گۆڕەپانی جەنگدا ستایش دەکرێت.

حەز کردن بە «وروژان»یش یەکێک لە سەرچاوەکانی هاتنەئارای شەکەتییە. ئەگەر کەسێک کاتەکانی ئیسراحەتی بۆ خەو تەرخان بکات، لانیکەم تەندروستیی خۆی دابین کردووە. بەڵام چەندین کاتژمێری دەوێت تا قەرەبووی ئەو کاتژمێرانەی بکاتەوە و کێشەکە لەوەدایە کە بە گشتیی ئەو چێژانەی بە خێرایی دەستەبەر دەبن، شەکەتیهێنەر و داڕزێنەری ئەعسابن. کاتێک حەزکردن بە وروژان لە سنووری خۆی تێ پەڕێنێت، هێمایەکە بۆ حەزکردن لە سەرگەردانیی و ناڕەزامەندیی غەریزیی. زۆربەی پیاوەکان هەر لە سەرەتاکانی دەسپێکردنی ژیانی هاوبەشەوە وا هەست دەکەن پێویستیان بە وروژان نییە، بەڵام لە سەردەمی ئێمەدا کێشە ئابوورییەکان هێندە پرۆسەی هاوسەرگیریی دوا دەخەن کە هەیەجانەکەشی ئاسایی دەبێتەوە و، ئەوپەڕی، بتوانرێت بۆ ماوەیەکی ئێجگار کەم، هەیەجانی [هاوسەرگیریی] بپارێزرێت. ئەگەر ڕای گشتیی و هەلومەرجی کۆمەڵایەتیی، ریگەی بە پیاوان بدایە بەبێ تەحەمولکردنی هیچ ئەرک و بەرپرسیارێتییەکی مادیی کە ئەمڕۆ باون، هاوسەرگیرییان بکردایە، بە دڵنیاییەوە زۆربەی پیاوان دوای بەدەستهێنانی ئەو چێژانە نەدەکەوتن کە وەک کارەکەیان ماندووکەر و جاڕسکەرە. بەڵام پێشنیاری ئاوها کە تاقە ڕێگەچارەشە، پێشنیارێکی

نائاکارییە و چارەنووسی دادوەر لیندسی[55] کە تانە و لۆمەی زۆری لە لایەن خەڵکەوە بینیوە، نموونەیەکی پڕ بە پێستی ئەم قسەیەمانە.

دادوەر لیندسی، سەرەڕای ئەو هەموو ڕێز و حورمەتەی [لە کۆمەڵگادا] لێی دەگیرا، پاش ئەوەی کە بڕیاری دا گەنجەکان لە کۆتوبەند و دەردەسەرییەکان ڕزگار بکات، چەندین بوختان و تۆمەتیان بۆ هەڵ بەست و بە تەواوەتیی ناوزڕیان کرد. جارێ با واز لەم باسە بێنین، چوونکە لە بەشی داهاتوودا و لە بەشی ئێرەییبردندا باسی لێوە دەکەین.

لای کەسانی ئاسایی کە ناتوانن یاسا و ڕێسا حقوقیی و کۆمەڵایەتییەکان بگۆڕن و ناچارن مل بۆ بنەما داڕێژراوەکانی ئاکارخوازە دەمارگیرەکان کەچ بکەن، پرسی ملدان و خۆگونجاندن لەگەڵ بارودۆخی کۆمەڵگادا، ڕێک هێندەی ڕووتەکبوونەوە لەگەڵیاندا گرینگە. بەڵام بابەتێکی گرینگ کە پێویستە خەڵک بیزانن ئەوەیە کە چێژە هەیەجانبەخشەکان، تاقە ڕێگای بەدەستهێنانی بەختەوەریی نییە. هەر چەند لەو کاتانەیدا کە چێژە دڵخۆشکەرەکان دەستەبەر نابن، تاک بە سەختیی دەتوانێت بەبێ پشتبەستن بە شەوق و هەیەجانەوە ژیان تەحەمول بکات. لە وەها بارودۆخێکدا تاکی ژیر و ئاقڵ دەبێ یارمەتیی لە خۆی وەربگرێت و خۆی لەو خۆشییە جارسکەرانە بپارێزێت کە ڕێگە لە کار و چالاکییە تەندروستەکانی دەگرن و، کارێکی زۆر نائاقڵانەیە ئەگەر بارودۆخێک بۆ خۆی بێنێتە ئاراوە کە پێویستی بە هاوسەرگیریی نەبێت، یان خۆی لە هاوسەرگیرییەکی بەختەوەرانە و دوور لە داخورانی عەسەبیی بێبەش بکات.

یەکێک لە کاریگەرییە نالەبارەکانی شەکەتیی عەسەبیی ئەوەیە کە دیوارێک لە نێوان مرۆڤ و دنیای دەرەوەدا دروست دەکات کە لە پشت ئەم دیوارەوە بینینی ئەبستراکتی دیمەنەکانی ژیان لە توانادا نابێت. چوونکە لەم کاتانەدا کە خەڵک لە بارودۆخی ئەو تێ ناگەن، بە گاڵتە دڵسۆزانەکانیان دەیڕەنجێنن و ئازاری دەدەن. ئەو، وەک پێویست چێژ لە خواردن و تیشکی هەتاو وەرناگرێت و، بیری لای چەند پرسێکی دیاریکراو تەسک دەبێتەوە و

55 - Judge Lindsy

بایەخێکی ئەوتۆ بە پرسەکانی دیکە نادات. ئەم بارودۆخەش ڕۆژ لە دوای ڕۆژ خەستتر دەبێت و وای لێ دێت پێویستی بە چارەسەرکردن دەبێت.

لە ڕاستییدا هەموو ئەم کێشانە دەرەنجام و سزای پێوەندیی نێوان مرۆڤ و زەوییە کە لە بەشی پێشتردا باسمان لێوە کرد. بەڵام کێشەی بنەڕەتیی ئەوەیە کە چۆن دەتوانرێت وەها پێوەندییەک لەم بارودۆخە گرژ و ئاڵۆزەی ئەمڕۆدا بهێنرێتە ئاراوە؟

وەڵامدانەوە بەم پرسیارە ئاسان نییە و لە هەمان کاتدا پرسیاری پێشووش پێویستی بە بەرەوڕووبوونەوە لەگەڵ چەندین پرسی کۆمەڵایەتییدا هەیە کە جارێ حەز ناکەم خۆمی تێوە بگلێنم.

## ٦

### ئێرەیی

پاش نیگەرانیی و دڵەڕاوکێ، ڕەنگە ئێرەیی، یەکێک لە گرینگترین هۆکارەکانی سەرهەڵدانی بەدبەختیی بێت، چوونکە ئێرەیی بردن یەکێک لە قووڵترین هەستە نەفسانییەکانە. ئەم هەستە بە تایبەتیی لە منداڵاندا زۆر دیار و بەرچاوە. تەنانەت ئەو منداڵانەش کە هێشتا تەمەنیان نەبووە بە یەکساڵ، ئەم هەستەیان لە لا دروست دەبێ و، ئەرکی سەرشانی مامۆستا و ڕاهێنەرانیشە بەوپەڕی وریایی و وردبینییەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکەن. کەمترین دەربڕینی خۆشەویستیی بۆ منداڵێک و کەمتەرخەمیکردن لەگەڵ منداڵێکی دیکەدا، دەبێتە هۆی ئازار و دڵئێشانی ئەو منداڵەی کە ئاوڕمان لێ نەداوەتەوە. بەرپرسانی پەروەردە و ڕاهێنانی منداڵان پێویستە ڕەچاوی دادپەروەریی یەکسان لە نێوان منداڵاندا بکەن و تەنانەت دەتوانین بڵێین دەبێ ڕەچاوی دادپەروەرییەکی ڕەها (موتڵەق) بکەن، چوونکە منداڵان زۆر زووتر لە گەورەکان تووشی ئێرەیی و بەخیلی پێبردن دەبن و هەڵوێست وەردەگرن. ئەڵبەتە ئەم هەستە لە گەورەکانیشدا بە زۆریی بەرچاو دەکەوێت و ڕەنگە تەنانەت لەوەی منداڵانیش زیاتر بێت. بۆ نموونە بەسەرهاتی خزمەتکارەکەی ماڵی خۆمتان بۆ دەگێڕمەوە کە نموونەیەکی تەواوی ئێرەیی بردنی ناو مرۆڤە بە تەمەنەکانە. کاتێک بە خزمەتکارێک کە دووگیان بوو وتم نابێ لەمە بە دوا کاری قورس بکات و چاوەڕێی ئەوەی لێ ناکەین بەم حاڵەیەوە کاری قورس و چالاکیی زۆر بکات، ئەم دەرەنجامەی لێ کەوتەوە کە خزمەتکارەکانی دیکەش خۆیان لە ئەنجامدانی کارە قورسەکان دزییەوە و تا ماوەیەک خۆمان ئەو کارانەمان ڕادەپەڕاند.

ئێرەیی بردن، بناغە و بنەڕەتی دیمۆکراسییە. هیراکلیتۆس[٥٦] دەڵێت دەبێ هەموو دانیشتووانی ئێفێسۆس[٥٧] لە سێدارە بدرێن چوونکە وتوویانە: »کەس لە ئێمە بۆی نییە پلەی یەکەم بە دەست بێنێت!». ڕەنگە بزاڤی حکوومەتی نەتەوەیی لە یۆناندا سەرچاوەی لەو بیرۆکەوە وەرگرتبێت. ئەم تیۆرە سەبارەت بە دیمۆکراسیی نوێش ڕاستیی لە خۆ دەگرێت. ئەڵبەتە تیۆریی ئایدیالیستیی «دیمۆکراسیی، باشترین جۆری حکوومەتە«، تیۆرێکی حاشا هەڵنەگرە و من خۆم یەکێکم لەو کەسانەی کە پێم وایە تیۆرێکی ڕاستە، بەڵام هیچ دەزگایەکی ڕاستەقینەی سیاسیی، بوونی نییە کە بتوانێت بە پشتبەستن بە گریمانە یۆتۆپیاییەکانەوە گۆڕانکاریگەلی گەورە بێنێتە ئاراوە. تیۆرەکان تەنها لە پاش ڕوودانی گۆڕانکارییە گەورەکان دەتوانن ڕاستیی (حەقانییەت)ی ئەو گریمانانە بسەلمێنن و ئەم گریمانانەش هەڵگری هەندێک هەستی توندوتیژن کە هەندێک گۆڕانکاریی گەورەیان لێ کەوتۆتەوە. بە هەر حاڵ، بێگومان دیمۆکراسیی دەرەنجامی هەندێک هەستی ئێرەییانەیە. بە خوێندنەوەی بیرەوەرییەکانی مادام ڕۆلاند[٥٨] کە وەک خانمێکی پاک و بە ڕەوشت و بەڕێز ناوبانگی دەرکردووە، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە یەکێک لە هۆکارەکانی بە چاکە ناودەرکردنی ئەم خانمە و هەروەها پشتیوانیکردنی لە حکوومەتی نەتەوەیی، ئەوە بووە کە لە کاتی سەردانی کۆشکی دەوڵەمەند و ئەریستۆکراتەکاندا لە جیاتی هۆڵی تایبەتیی میوانان، لە ژووری خزمەتکارەکاندا پێشوازییان لێ کردووە.

لە ناو ژنە بەڕێز و خاوەن کەسایەتییەکاندا، ئێرەییبردن دەورێکی زۆر گرینگ دەبینێت. کاتێک لە ناو شەمەندەفەری مێترۆدا دانیشتوویت و خانمێکی تەڕپۆش لە ناو شەمەندەفەرەکەدا ئەملاولا دەکات و دەسووڕێتەوە، ئەگەر تەماشایەکی ژنەکانی تری ناو شەمەندەفەرەکە بکەن بۆتان دەردەکەوێت هەر هەموویان بە نیگایەکی غەزەبناک و پڕ لە ڕق

---

٥٦ - Heraclitus؛ نزیکەی ساڵی ٥٠٤ی پ. ز. لە "ئێفێسۆس"دا لە دایک بووە. ئەم فیلسووفە ڕەشبینە، بە فەیلەسووفی گرینۆک ناوبانگی دەرکردووە و بە چاوی سووکەوە سەیری خەڵکی دەکرد. ئەو، ئاگری بە سەرچاوە و بناغەی هەموو شتێک دەزانی و پێی وا بوو دنیا وەکوو ئاگر تەنانەت بۆ چرکەیەک ئارامیی نییە.

57 - Ephesus

٥٨ - Madam Roland؛ ١٩٤٤ – ١٨٦٦؛ نووسەری فەرەنسیی.

و کینەوە تەماشای دەکەن. تەنها ژنە تەڕپۆشەکان تەماشای ناکەن. ژنان زۆر جار بە دوای دۆزینەوەی عەیب و نوقسانییەک لە ژنانی تەڕپۆشدا دەگەڕێن. حەزکردن بە بوختان هەڵبەستن و دەنگۆگەلی قێزەون، شێوازێکی تری دەربڕینی هەستی ئێرەیی و دڵپیسییە. هەر چیرۆکێک کە لە دژی ژنێک دەوترێت، بەبێ هیچ بیرلێکردنەوەیەک لە لایەن ژنانی دیکەوە قبووڵ دەکرێت. لەم حاڵەتانەدا پێویست بە بەڵگە و دەستبەڵگە ناکات.

ڕێسا بەرزە ئاکارییەکان بە مەبەستی خزمەتکردنی ئەم ئامانجە هاتوونەتە ئاراوە. کەسانێک کە توانای نادیدەگرتنی ئەم ڕێسایانەیان هەیە، دەکەونە بەر گومان و ئێرەیی دیترانەوە. تاکە حەسوودەکان داوای سزادانی ئەم جۆرە کەسانە دەکەن لە بەر ئەوەی کە بە ڕواڵەت وای نیشان دەدەن خوازیاری چاککردنەوەی ئاکار و گرینگیی پاکیی و خواترسیین. ئەوان دەڵێن جگە لەوەی کە تاوانە، لە هەمان کاتدا وەکوو جۆرە سەرکەشییەک وایە و کەسی ئەنجامدەریش دەبێ سزا بدرێت. بێگومان ئەم جۆرە تایبەتییەی خواترسیی، پاداشتی خۆی هەیە.

وەها حاڵەتێک کتومت لە ناو پیاوانیشدا هەیە بەڵام تەنها بە یەک جیاوازییەوە؛ ئەویش ئەوەیە کە ژنان هەموو ژنەکانی دیکە وەک ڕکابەر چاو لێ دەکەن، لە کاتێکدا پیاوان تەنها بەرامبەر ئەو پیاوانەدا هەستیارن کە ناکۆکیی دارایی یان پیشەیی لە نێوانیاندا هەبێت.

ئێستا با پرسیارێک لە تۆی خوێنەری ئەم کتێبە بکەم کە ئایا تا ئێستا ئەوەندە بوێر و نەترس بوویتە کە لە بەردەم ئەکتەرێکدا پەسن و پیاهەڵدانی ئەکتەرێکی دیکە بکەیت؟ ئایا هەرگیز لە بەردەم سیاسەتمەدارێکدا پیاهەڵدانی سیاسەتمەدارێکی تری هەمان ئەو حیزبەت کردووە؟ ئایا شوێنەوارناسێکت لە بەردەم شوێنەوارناسێکی دیکەدا ستایش کردووە؟ ئەگەر کارێکی ئاوات کردبێت لە سەدا سەد مەرج دەکەم ئێرەیی بردنی کەسی بەرانبەرت بە تەواوەتیی هەست پێ کردووە.

نموونەیەکی جوان کە دەتوانم لەم بارەوە ئاماژەی پێ بکەم، نامە نووسینەکانی نێوان لایبنیتس[٥٩] و "هیۆگێنز"ە[٦٠]. ئەم دوو کەسە چەندین نامەیان پێکەوە ئاڵوگۆڕ کردووە کە تیایاندا بە دڵخۆشییەوە باسیان لەوە کردووە نیۆتۆن[٦١] شێت بووە. ئەمە دەقی یەکێک لە نامەکانیانە: »ئایا جێی داخ و کەسەر نییە بلیمەتییە بێوێنەکەی نیۆتۆن بە هۆی نەبوونی لۆژیک و ئەرگۆمێنتەوە لێڵ و تاریک بووە؟« ئەم دوو پیاوە گەورەیە لە نامەکانیاندا فرمێسکی درۆزنانەیان بۆ نیۆتۆن هەڵدەڕشت و بە ڕیاکارییەوە داخ و پەژارەیان دەردەبڕی، لە کاتێکدا بیروڕاکانیان بە هیچ شێوەیەک دروست نەبوون. ئەوان بە بینینی چەند ڕەفتارێکی نائاسایی نیۆتۆن، دڵیان بەوە خۆش دەبوو کە شێت بووە و لە ڕاستییدا ئەوە «ئێرەیی بردن» بوو کە پێی دەوتن دەبێ دڵیان بە شێتبوونی ڕکابەرەکەیان خۆش بکەن.

ناتوانم لەم بارەوە گومان لەوەدا بکەم کە لە ناو سەرجەم تایبەتمەندییە مرۆییەکاندا، ئێرەیی بردن خراپترینیانە؛ چوونکە نەک تەنها سوودبەخش نییە بەڵکوو لە ڕاستییدا دەبێتە هۆی ناکامیی کەسی ئێرەییبەر و هەروەها کەسی ئێرەیی بەرکەوتووش بەرەوڕووی چەندین کێشە و گرفت دەکاتەوە. کەسی ئێرەییبەر، لە جیاتی ئەوەی کە ڕازیی بەو شتانە بێت کە هەیەتی، دڵی بەو شتانە دێشێت کە خەڵک هەیەتی و پێیان دڵمەند دەبێت و بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم نیگەرانییەشی، ئەگەر بۆی بکرێت خەڵک لەو شتانەی کە هەیانە بێبەش دەکات. کارێکی وەها لە ڕوانگەی کەسی ئێرەییبەرەوە نەک تەنها عەیب و عار نییە، بەڵکوو پێیشی وایە

---

٥٩ - Leibniz، ١٧١٦ – ١٦٤٦؛ فەیلەسووف و بیرکاریزانی ئەڵمانیی. لەو باوەڕەدا بوو کە حەقیقەتی تاکانە(واحید)، بە شێوەی بەشگەلێکی لێ هاتووە بە ناوی مۆناد، کە هەمان ئەتۆمی ئازادە، بەم جیاوازییەوە کە ئەتۆم گیاندارێکە هێزی ئافراندن و داهێنانی لە ناو خودی خۆیدایە.

٦٠ - Huyghens، ١٦٩٥ – ١٦٢٩؛ بیرکاریزان و فیزیکناس و ئەستیرەناسی ئەڵمانی.

٦١ - Newton، ١٦٤٢ – ١٧٢٧؛ سێر ئیزاک یان ئیسحاق نیۆتۆن، فیزیکناس و بیرکاریزانی بەریتانیی کە لە لانکشایر لە دایک بووە. پوختەی بیروباوەڕەکانی لە ساڵی ١٦٨٧دا بە ناوی **بنەما بیرکارییەکانی فیزیک** بڵاو کردەوە. هەموو بابەتەکانی ناو ئەم کتێبە لە سەر بنەمای یاسای «ڕاکشانی زەوی» ڕاوەستاون. ئەو بە بینینی کەوتنەخوارەوەی سێوی سەر درەختێک، دەرکی بە تیۆرییەکی زۆر گرینگ کرد و توانیی «هێزی ڕاکشانی زەوی» بدۆزێتەوە. نیۆتۆن بناغەدانەری حیسابی توخمە ئێجگار بچووکەکان و هەروەها تیۆری ڕووناکی یە. کتێبی **بنەما بیرکارییەکانی فیزیک** گۆڕانکارییەکی گەلێک گەورەی لە دنیای زانستدا هێنایە ئاراوە و لە ڕاستیدا ئەم بلیمەتە مەزنە، یاسا سروشتییەکانی دۆزییەوە.

کارێکی سەرکەوتووانە و ژیرانەی کردووە. ئەم هەستە ئەگەر بواری بۆ بڕەخسێت، سەرکەشییەکی هێندە وێرانکارانەی بە دواوە دەبێت کە دەتوانێت ببێتە دوژمنێکی سەرسەختی هەموو توانایی و لێهاتوویبە سوودبەخشەکان. بۆچی دەبێ پزیشکێک بە ئۆتۆمبیل سەردانی نەخۆشێک بکات و کرێکارێکیش ناچار بێت مەودای نێوان ماڵ و شوێنی کارەکەی بە پێ ببڕێت؟ بۆچی فلانە بیرمەندی توێژیار لە خانوویەکی گەرم و ئیسراحەتدا کاتەکانی بە سەر بەرێت و خەڵکی تر سەختییەکانی سروشت تەحەمول بکەن؟ بۆچی کەسێک کە بە هۆی بەهرە کەموێنەکەیەوە هەموو خەڵکی جیهان گرینگیی پێ دەدەن، کارە پڕ زەحمەتەکانی ماڵەوە ئەنجام نادات؟ ئەم پرسیارانەی کەسی ئێرەییبەر، وەڵامێکی لۆژیکیی و گەشبینانەیان نییە، بەڵام بەختەوەرانە ئینسان لە ناو جەوهەریدا خاوەنی هەستی قەرەبووکردنەوە و تۆڵەکردنەوەیە، کە لێرەدا بە شێوازی پەسن و پیاهەڵدان دەردەکەوێت. کەسێک کە حەز بکات بەختەوەرییەکی مرۆییانەی هەبێت و بەردەوامیش ڕوو لە زیادبوون بکات، دەبێ هەستی پەسن و پیاهەڵدان و ستایشکردن لە بوونی خۆیدا بەهێز بکات و هەستی ئێرەیی بردنیش لە ناخیدا بکوژێت.

ڕێگەچارەی بەرەنگاربوونەوەی ئێرەیی چییە؟ پیاوچاکان و خواترسەکان، لەخۆبوردوویی و واز لەخۆهێنان [یان گرنگیی نەدان بە خۆ] بە چارەسەری ئێرەیی دەزانن. لەگەڵ ئەوەشدا تەنانەت بوونی ئێرەیی لە ناو پیاوچاکاندا شتێکی مەحاڵ نییە [و دەکرێت پیاوچاکانیش هەستی ئێرەییان تێدا هەبێت]. نازانم ئەگەر سنت سیمۆن ستایلیت[٦٢] ئاگای لەوە هەبوایە کە لە سەردەمانی دواتردا پەیکەری پیاوچاکانی دیکەش تەنانەت لە سەر کۆڵەکەگەلی تەسک و باریکدا دادەنران، ئایا دەیتوانی هەستی خۆشحاڵیی و ڕەزامەندیی خۆی دەرببڕێت؟ بە هەرحاڵ با واز لە باسی پیاوچاکان و خواترسەکان بێنین و بگەڕێینەوە سەر بابەتەکەی خۆمان. دەبێ بڵێین بەختەوەریی، تاقە چارەسەری ژنان و پیاوانی ئاساییە، بەڵام کێشەکە لەوەدایە کە ئێرەیی بردن خۆی گەورەترین بەربەستی سەر ڕێگای بەختەوەرییە. من پێم وایە ناکامییەکانی سەردەمی منداڵیی، گەورەترین هۆکاری گەشەکردنی هەستی ئێرەیی بردنە. منداڵێک کە

---

٦٢ - Simon Stylite؛ ١٧٦٠ – ١٨٢٥؛ لەو باوەڕەدا بووە کە دەوڵەت (حکوومەت) خاوەنی هەموو شتێکە و کرێکاریش بە قەدەر پێویستیی خۆی، کەڵک لە کۆمەڵگا وەردەگرێت.

هەست دەکات زیاتر ئاوڕ لە خۆشک یان براکەی دەدرێتەوە، بە شێوەیەکی نابەرهەستانە(ناخودئاگا)، هەستی ئێرەیی بردن وەک خوویەک لە بوونیدا پەروەردە دەکات. وەها منداڵێک کاتێک پێ دەنێتە گۆڕەپانی ژیانەوە، بە دوای هەمان ئەو نادادپەروەرییەدا دەگەڕێت کە دەرحەق بە خۆی ئەنجام دراوە. ئەگەر نادادپەروەریی بەدیی کرد، بەرەنگاری دەبێتەوە و ئەگەریش بەدیی نەکرد، بەردەوام شێمانەی هاتنەئارای لە مێشکیدا هەڵدەگرێت. پێویست بە ڕوونکردنەوە ناکات کە وەها کەسێک بە ڕاستیی بەدبەختە و، دڵی خۆی و هاوڕێکانیشی دەڕەنجێنێت. چوونکە هاوڕێکانی ناتوانن ڕێ لەو هەڵسوکەوتە ساکار و کەمبایەخانەی بگرن کە بە لای ئەوەوە زۆر گرینگن. لە هەلومەرجێکی ئاوادا کەسی ئێرەییبەر، وا هەست دەکات کەس خۆشی ناوێت و سەرەنجام ئەو ڕەفتار و هەڵسوکەوتەی کە نیشانی دەدات، دەبێتە هۆی ئەوە کە گومان و بۆچوونەکانی ڕەنگ و بۆنی ڕاستیی(حەقیقەت) بە خۆوە بگرن. هۆکاری تری بەدبەختیی لە قۆناغی منداڵییدا، بوونی ئەو دایک و باوکانەیە کە ڕەفتارێکی سۆزدارانەیان لەگەڵ منداڵەکەیاندا نەبووە. تەنانەت ئەگەر ئەو منداڵە خۆشک و برایەکیشی نەبێت کە ببینێت ڕەفتاری ناسۆزدارانەیان لەگەڵدا دەکرێت، هەمیشە ئەم هەستەی لە لا هەیە کە منداڵانی بنەماڵەکانی دیکە زیاتر لەو دەکەونە بەر سۆز و خۆشەویستیی دایک و باوکانیان. ئەم پرسە دەبێتە هۆی ئەوە کە ئەم منداڵە ڕقی لە منداڵانی تر و دایک و باوکی خۆشی ببێتەوە. وەها منداڵێک کاتێک گەورە بوو، خۆی وەک ئیسماعیل[٦٣] دەبینێتەوە. هەموو تاکێک مافی سروشتیی خۆیەتی لەگەڵ لە دایکبوونیدا هەندێک لە جۆرەکانی بەختەوەریی لەگەڵیدا بن و، ئەگەر لێیان بێبەش بکرێت، بوونەوەرێکی مۆن و بەلاڕێداچووی لێ دەردەچێت.

ڕەنگە پیاوێکی ئێرەییبەر بڵێت: «سوودی ئەم قسەیە چییە کە تاقە چارەسەری ئێرەییەکەی من بەختەوەرییە؟ من مادام هەست بە بەختەوەریی ناکەم، ناشتوانم بەختەوەریی بە دەست بێنم و ئێوەش دەڵێن تا کاتێک بەختەوەریی بە دەست نەهێنم، ناتوانم واز لە ئێرەییەکەم بێنم؟». ئەوەی ڕاستیی بێت ژیانی ڕاستەقینە هەرگیز هێندە ئەقڵانیی و لۆژیکیی نییە. لە

٦٣ - ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیم، کە باوکی دەیویست [بە فرمانی خوا] قوربانیی بکات. و. ف.

ڕاستییدا هەموو کەسێک پاش دەرکپێکردنی هۆکارەکانی ئێرەیی، گەلێک هەنگاوی باشی بۆ چارەسەرکردنی هەڵگرتووە. عادەتی خۆ بەراوردکردن لەگەڵ کەسانی دەوروبەر، شتێکی زۆر کوشندە و ڕووخێنەرە. دەبێ ئەوپەڕی چێژ و خۆشیی لە هەموو شتێکی دڵخواز و دڵخۆشکەر وەربگیردرێت بەبێ ئەوەی کە بیر لەوە بکەینەوە ئەم شتە دڵخۆشکەرە بە بەراورد لەگەڵ شتە دڵخۆشکەرەکانی کەسانی دیکە، بچووک و کەمبایەخە.

مرۆڤی ئێرەییبەر، لە جیاتی پیاهەڵدانی ئەو بارودۆخەی کە باسی لێوە دەکەین دەڵێت: «بەڵی ئەمە زۆر ڕاستە کە ئەمڕۆ بە تایبەت لە بەر ئەوەی کە خۆر هەڵهاتووە و ساماڵە و بەهارە و باڵندەکان دەچریکێنن و شکۆفەکانیش پشکووتوونە، ڕۆژێکی خۆش و دڵبزوێنە، بەڵام ئەمەش قبووڵ بکەن کە بەهاری سیسیل هەزار جار جوانتر و دڵبزوێنترە و، چریکەی باڵندەکانی سەوزەزارەکانی هلیکۆن دڵگیرتر و خۆشترە و، هەروەها گوڵەباخە سوورەکانی شارۆن، زۆر زۆر لە گوڵەکانی باخەکەی من جوانترن!». کاتێک بیرۆکەگەلێکی لەم چەشنە هزری تاک داگیر دەکەن، هەتاو بە بەر چاویدا لێڵ و تاریک دەبێت و چریکەی باڵندەکان جوانیی و دڵگیریی خۆی لە دەست دەدات و گوڵەکانیش تەنانەت بایەخی چرکەیەک تەماشاکردنیان نامێنێت. ئەو، هەموو چرکەساتەکانی ژیانی بەم شێوەیە چاو لێ دەکات و بە خۆی دەڵێت: «بەڵی ڕاستە خۆشەویستەکەم جوانە و منیش خۆشم دەوێ و ئەویش منی خۆش دەوێ، بەڵام شاژنی **سەبا** زۆر جوانتر بووە. خۆزگە منیش سلێمان بوومایە!«.

وەها بەراوردکردنێکی بێ بنەما، زۆر گەمژانەیە و فەرق ناکات کەسی بەراوردکراو، شاژنی **سەبا** بێت یاخود دراوسێکەتان؛ لە هەموو حاڵەتێکدا کارێکی بێهوودەیە و بێجگە لە ئازار و خەمۆکیی نەبێت هیچ ئەنجامێکی تری لێ ناکەوێتەوە. هیچ تاکێکی ئاقڵ خۆی لەو چێژانەی کە لە بەر دەستیایەتی بێبەش ناکات تەنها لە بەر ئەوەی کە ڕەنگە کەسانی تر باشتر لەوەیان لە بەر دەستدا هەبێت. لە ڕوانگەی ئاکاریی و ئەقڵانییەوە، ئێرەیی بردن بە جۆرە ڕەزالەتێک لە قەڵەم دەدرێت و لەوێشەوە سەرچاوە دەگرێت کە بەها و جەوهەری ڕاستەقینەی شتوومەک و پرسەکان لە بەر چاو نەگیردرێت، بەڵکوو بایەخ بە پێوەندیی و گونجاوییان لەگەڵ شتەکانی دیکە بدرێت. من هەموو مانگێک تەنها هێندەی پێداویستییەکانی ژیانی خۆم مانگانە(مووچە) وەردەگرم و دەتوانم ژیانێکی تا ڕادەیەک ئارام و ئاسوودەم هەبێت. نەک

تەنها دەبێ ڕازیی بم بەڵکوو دەبێ خۆشحاڵیش بم. بەڵام [جار و بار] دەبینم کە کەسێک بەبێ ئەوەی کە هیچ تایبەتمەندییەکی زیاتر و شازتر لە منی هەبێت، دوو هێندەی من مانگانە وەردەگرێت. ئەگەر من کەسێکی ئێرەییبەر بم، ئەو بڕە پارەی کە وەری دەگرم بە کەم دەزانم و هەست بە نادڵکاویی (نارەزامەندیی) دەکەم و هەستکردن بە بوونی نادادپەروەریی، ئازاری ڕۆحم دەدات. چارەسەری ڕاستەقینەی ئەم کێشەیە، ڕێکخستن و تەکووزیدان بە ئەندێشەکانمانە، واتە خۆمان لە سەر ئەوە ڕابهێنین کە بیر لەم جۆرە پرسانە نەکەینەوە. دەرەنجامی ئەم کارەش پشتگوێخستنی پرسە بێبایەخ و بێهوودەکانە. داخۆ چ شتێک زیاتر لە بەختەوەریی، هەستی ئێرەیی مرۆڤ دەورووژێنێت؟ کاتێک توانیمان ئێرەیی و بەخیلیی پێبردنی خۆمان چارەسەر بکەین بەختەوەرین و لە ڕاستییدا کەوتووینەتە بەر ئێرەیی دیترانەوە. کەسێک کە دوو هێندەی من مانگانە وەردەگرێت، بێگومان پێی ناخۆش دەبێت ئەگەر بزانێت کەسێکی دیکە دوو هێندەی ئەو، مانگانە وەردەگرێت و ئەم پرسە بەردەوام درێژەی دەبێت. ئەگەر حەزتان لە ناو و ناوبانگ بێت، ڕەنگە ئێرەیی بە ناپلیۆن بەرن بەڵام "ناپلیۆن"یش ئێرەیی بە سیزار و سیزاریش ئێرەیی بە ئەسکەندەر و ڕەنگە ئەسکەندەریش ئێرەیی بە هێرکوول[٦٤] بردبێت کە هەرگیز بوونیشی نەبووە. کەواتە بە بەدەستهێنانی سەرکەوتنیش ناتوانرێت ئێرەیی بردن بنبڕ بکرێت چوونکە هەمیشە لە ناو مێژوو و ئەفسانەکاندا کەسانی سەرکەوتووتر بوونیان هەیە. ئێوە دەتوانن بە بەهرەمەندبوون لەو شتانەی کە هەتانە، یان ئەنجامدانی کارێک کە ناچارن ئەنجامی بدەن و هەروەها بەراورد نەکردنی خۆتان لەگەڵ ئەو کەسانەی کە لە مێشکتاندان و لەوانەشە هەر بوونیان نەبێت، لە خەسارەکانی بەخیلیی و ئێرەیی پارێزراو ببن و بەختەوەرتر لەوەی بن کە هەن. شەرمنیی لە ڕادەبەدەریش پێوەندییەکی زۆری بە ئێرەییەوە هەیە؛ ئەگەرچی هەندێ کەس شەرمێونیی بە سیفەتێکی باش لە قەڵەم دەدەن بەڵام من بەش بە حاڵی خۆم پێم وایە ئەگەر شەرمێونیی زێدەڕۆیانە بێت شیاوی ڕێزلێگرتن نییە. کەسانی شەرمن زۆر زۆر پێویستیان بە باوەڕبەخۆبوون هەیە چوونکە زۆربەی کات بوێریی ئەنجامدانی کارگەلی گەورەیان نییە، لە کاتێکدا دەتوانن بە باشترین شێوەش ئەو کارانە ئەنجام بدەن.

---

٦٤ - Hercules؛ گەورەترین مرۆڤی پاڵەوانی ئەفسانەی خواوەندەکانی یۆنان بوو و لەم ڕووەوە دەتوانین لێکچوونێکی زۆر لە نێوان ئەو و ڕۆستەمی "ئێران"دا بەدیی بکەین.

کەسانی شەرمن لەو باوەڕەدان هەمیشە لە ژێر کاریگەریی کەسانی دەوروبەریاندان و لە دۆخێکی ئاوهادا بە کردەوە خۆیان بۆ سەرهەڵدانی هەستی ئێرەیی بارگاویی دەکەن و بە پەرەسەندنی ئێرەییەکەشیان بە ئاراستەی بەدبەختیی و دوژمنکارییدا دەڕۆن.

من پێم وایە بۆ پەروەردەکردنی منداڵان بە شێوەیەک کە خۆیان بە کەسانێکی باڵا و شایستە بزانن، چەندین ڕێگە لە بەردەمدا هەیە و دەتوانین بە تێروتەسەلیی ڕوونکردنەوە لەم بارەوە بکەین. بەڵام با بە هێنانەوەی نموونەیەکی سادە، خۆمان لەو ڕوونکردنەوە زۆرانە ڕزگار بکەین. پێم وا نییە هیچ "تاوس"ێک ئێرەیی بە کلکی تاوسەکانی دیکە بەرێت چوونکە ئەوەی خۆی بە جوانترین کلک دەزانێت. دەرەنجامەکەشی دەبێتە ئەوە کە تاوسەکان وەک پەلەوەرگەلێکی جوان دەمێننەوە و بە ئاشتیی و تەبایی پێکەوە دەژین. تەسەوری ئەوە بکەن چ دۆخێکی نالەبار و ناخۆش دەهاتە ئاراوە ئەگەر "تاوس"یان فێری ئەوە بکردایە قایل بە پێگە و بارودۆخی خۆی نەبێت، یان فێری ئەوەیان بکردایە خۆپەرستیی(خودشەیدایی)، کارێکی دروست نییە. چوونکە کاتێک ئەم "تاوس"ە چاوی بە "تاوس"ێکی دیکە بکەوتایە کە کلکی وەک چەتر لێ کردووە، بە خۆی دەوت:

- من نابێ پێم وابێ کلکی من لەو جوانترە چوونکە ئەمە خۆپەرستیی و خۆبەزلزانینە، بەڵام ئەی چی لە هیوا و ئارەزووەکانم بکەم؟ وا دیارە ئەو پەلەوەرە قێزەون و ناشیرینە زۆر شانازیی بەو کلکە جوانەیەوە دەکات! ئایا دەتوانم چەند تووکێک لە کلکی لێ بکەمەوە؟ چوونکە ئەگەر ئەم کارە بکەم چیدی لەوە ناترسم کلکی خۆم لەگەڵ هی ئەودا بەراورد بکەم!

لەوانەشە ئەو "تاوس"ە داوێکی لە سەر ڕێگای ڕکابەرەکەی دانابایە تاکوو بیسەلمێنێت کە ئەو "تاوس"ێکی خراپە و بە پێچەوانەی تاوسەکانی دیکە، هەڵسوکەوتێکی ناشیرین و نابەجێی کردووە و بەم شێوەیە لە بەر چاوی گەورەترەکانەوە ناوزڕی دەکرد. بەم ڕەفتارەوە وردە وردە بنەما و ڕێسایەک دادەڕێژرا کە "تاوس"ە کلک جوانەکان لەخۆبایی و خۆبەزلزانن. لە هەلومەرجێکی ئاوادا فەرمانڕەوای زانای قەڵەمڕەوی تاوسەکان دەبوایە بە دوای "تاوس"ێکی خاکەڕادا گەڕابایە کە چەند تووکێکی کلکی خۆی لە خاک و خۆڵەوە گلاندبێت. کاتێک ئەم یاسا گشتییە پەسەند کرا، ئەویش هەوڵ دەدات سزای مەرگ بۆ هەموو "تاوس"ە کلک

جوانەکان ببڕێتەوە و لە ئاکامدا لە هەموو جوانییەکانی کلکە شکۆمەندەکەی تاوسەکان، بە تەنها بیرەوەرییەک لە یادەکاندا دەمێنێتەوە و هیچی تر.

هەر چەند ئەم نموونەیە ناتوانێت شێوازێکی ڕاستیی لە خۆ بگرێت، بەڵام نموونەیەکە لە سەرکەوتنی بەخیلیی و ئێرەیی، کە جلێکی ئاکارییمان بە بەردا کردبێت. بەڵام لە هەلومەرجی ئاساییدا وەزعەکە زۆر ئاسایی دەچێتە پێشەوە و پێویست بەم فرۆفێڵانەش ناکات. هەموو "تاوس"ێک خۆی بە گەورەتر لە تاوسەکانی دیکە دەزانێت و پێویست بە سەرکوتکردنیش ناکات. هەموو "تاوس"ێکی نێر بە تەمای بەدەستهێنانی "تاوس"ە مێیینەکانە و لە گۆڕەپانی پێشبڕکێی بەدەستهێنانی مێیینەکاندا پلەی یەکەم بە دەست بێنێت. کاتێک "تاوس"ی نێر لە لایەن "تاوس"ی مێیینەوە وەرگیرا، دیارە پلەی یەکەمی بە دەست هێناوە و پێم وا نییە ئەوانی تر ئێرەیی پێ بەرن.

دیارە ئێرەیی پێوەندییەکی زۆر نزیکی لەگەڵ ڕکابەرییدا هەیە. ئێمە هەرگیز خەمی ئەو بەختەوەرییانە ناخۆین کە بە گشتیی لێمانەوە دوورن. لە سەردەمانێکدا کە پلەوپایەی کۆمەڵایەتیی لە ئارادا بوو، چینەکانی خوارووی کۆمەڵگا مادام پێیان وا بوو ئەوە خوایە کە چارەنووس و پلەوپایەی ئەوان و دەوڵەمەندەکانیشی دیاریی کردووە و بە گوێرەی ویستی خوا دەبێ هەر کامەیان پێگە و جێگەی خۆیانیان هەبێت، هێندە ئێرەییان بە چینی دەوڵەمەند و خۆشگوزەران نەدەبرد. سواڵکەرەکان ئێرەیی بە کەسانی ملیۆنێر نابەن لە کاتێکدا بەرانبەر بە سواڵکەرەکانی دیکە هەست بە ئێرەیی دەکەن. ناجێگیربوونی بارودۆخی کۆمەڵایەتیی جیهان و باوەڕگەلی یەکسانیخوازانەی هەڵقوڵاوی دیمۆکراسیی و لایەنگریی لە دابەشکردنی دادپەروەرانەی سەروەت و سامان لە ناو کۆمەڵانی خەڵکدا، پانتایی بەخیلیی و ئێرەیی بەرفراوانتر کردووە. لەم کاتەی ئێستادا ئەم دۆخە زۆر زیانبەخشە، بەڵام دەبێ تا ئەو کاتەی کە سیستمێکی کۆمەڵایەتیی دادپەروەرانە دێتە ئاراوە، تەحەمولی بکەین. ئەگەر لە ڕوانگەی لۆژیکەوە چاو لە نادادپەروەرییەکان بکەین بۆمان دەردەکەوێت هۆکارەکانی نادادپەروەریی، پرسگەلێکی چەوسێنەرانە(زاڵمانە)ن کە تەنها پشت بە بنەمای بەهرە و شایستەیی و لێهاتوویی مرۆڤەکانەوە دەبەستن. کاتێک نەبوونی دادپەروەریی وەک شتێکی چەوسێنەرانە وێنا بکەین،

چیدی هیچ ڕێگەچارەیەک بۆ لەناوبردنی ئێرەیی نامێنێتەوە، مەگەر ئەوەی کە نادادپەروەریی و زوڵم و چەوساندنەوە لە ناو بچن.

بە گوێرەی ئەم لێکدانەوە و شیکردنەوانە، ئێرەیی لەم سەردەمەی ئێمەدا پانتاییەکی بەرینی داگیر کردووە: هەژاران ئێرەیی بە دەوڵەمەندان دەبەن. نەتەوە هەژارەکان ئێرەیی بە نەتەوە دەوڵەمەندەکان و ژنانیش ئێرەیی بە پیاوان دەبەن. ژنانی پاک و خواترس، ئێرەیی بەو ژنە ناپاکانەی دەبەن کە سزای بەدڕەوشتییەکانیان وەرنەگرتووە. کەواتە ئێرەیی، چەندین شێوازی جۆراوجۆری هەیە کە چەندین لێکدانەوە و ڕاڤەکاریی جۆراوجۆریش هەڵدەگرن. هەندێک لە شێوازەکانی ئێرەیی، پێوەندییان بە ڕەگەزەوە هەیە و هەندێکیشیان شێوەی پێشبڕکێ بە خۆوە دەگرن و هەندێکیشیان پێوەندییان بە دەستەبەری کۆمەڵایەتییەوە هەیە. بەڵام لە هەمان کاتدا ئەم حەقیقەتەش لە ئارادایە کە دادپەروەریی هەڵقوڵاوی ئێرەیی، خراپترین جۆریەتی. چوونکە ئەم دادپەروەرییە لە چێژ و خۆشییەکانی تاکە بەختەوەرەکان کەم دەکاتەوە و چێژە دڵخوازەکانی تاکە بەدبەختەکانیش دابین ناکات.

بە دڵنیاییەوە ئەو هەست و عاتیفانەی کە لە ژیانی کەسەکیی تاکەکاندا وێرانکردن و کاولکارییان لێ دەکەوێتەوە، کاریگەرییەکی هاوشێوەش لە سەر ژیانی کۆمەڵایەتیی دادەنێن و ناتوانین لە »هەوێنی« گەندەڵیی، چاوەڕێی خێر و خۆشیی بکەین. کەواتە کەسانێک کە لە بەر خاتری هۆکارە ئایدیالیستییەکانەوە خوازیاری گۆڕانکاریی گەورەن لە ناو سیستمی کۆمەڵایەتیدا، دەبێ بە مەبەستی پراکتیزەکردنی ئەو گۆڕانکارییانە، پشت بە هۆکارگەلێکی دیکەی جگە لە ئێرەیی ببەستن.

ناشیرینییەکان پێوەندییان بە یەکەوە هەیە و هەر کامەیان دەتوانن [بۆ خۆیان] هۆکارێکی دیکە بن. بۆ نموونە هەر لەم پێوەندییەدا دەتوانین بڵێین کە یەکێک لە هۆکارەکان، ئێرەییە. کەسێک کە خۆی لە ڕاپەڕاندنی کارێکدا بە ناتەوان و نەگۆمە دەزانێت، جۆرە نادڵکاوییەکی تایبەتی تێدا دروست دەبێت کە دەبێتە هۆی ئێرەیی بردنی بە کەسانێک کە کارگەلی ئاسانتر ئەنجام دەدەن. ئەوەشمان لە بیر نەچێت کە هەستی خۆ بە لاواز زانین، یەکێک لە هۆکارەکانی سەرهەڵدانی ئێرەییە و لە بەر ئەوەش کە بە هۆی شەکەتییەوە کارایی تاک دادەبەزێت، کەواتە یەکێک لە ڕێگەکانی دوورکەوتنەوە لە ئێرەیی، کەمکردنەوەی شەکەتییە. جیا لەوەش پرسی

دابینکردنی ژیان و دەستەبەرکردنی غەریزە سرووشتییەکان لە گۆڕێدایە. ئەمڕۆ زۆربەی ئەو ئێرەییانەی کە لە ناو کار و پیشەکاندا دەبینرێن، لە بنەڕەتدا پێوەندیی بە «سێکس»ەوە هەیە. پیاوێک کە ژیانێکی ژنومێردایەتیی بەختەوەرانە و سەرکەوتووی هەیە، بە دەگمەن ئێرەیی بەو پیاوانە دەبات کە لێی دەوڵەمەندترن یان سەرکەوتنی زیاتریان بە دەست هێناوە. ئەم دۆخە تا کاتێک هەلومەرجی پێویست بۆ پەروەردەی منداڵان و درێژەدان بەو ڕێگایانەی کە بە لایەوە پەسەند و جوانن فەراهەم بێت، وەک خۆی دەمێنێتەوە.

بنەماکانی بەختەوەریی مرۆڤ زۆر ئاسانن. هێندە ئاسانن کە تاکە سەفسەتەکارەکان ناتوانن ئەم حەقیقەتە قبووڵ بکەن کە بە ڕاستیی چ کەمایەسیگەلێکیان لە ژیانیاندا هەیە. ئەو ژنانەی کە پێشتر ئاماژمان پێ دان و وتمان کە ئێرەیی بە تەرپۆشیی ژنانی تر دەبەن، لە ژیانی ژنومێردایەتیی و غەریزەی «سێکسیی»دا بەختەوەر نین.

بەختەوەریی غەریزیی لە وڵاتە ئینگلیزی زمانەکان، بە تایبەت لە ناو ژناندا بە دەگمەن هەیە و پێدەچێت شارستانییەت لەم ڕووەوە ڕێگایەکی هەڵەی بڕیبێت. ئەگەر بڕیار بێت ڕێژەی ئێرەیی کەم بکرێتەوە، دەبێ کارێکی وا بکەین کە هۆکارە دروستکەرە بنەڕەتییەکانی ئێرەیی لە ناو بەرین. ئەگەری ئەوە لە ئارادایە کە شارستانییەتی ئێمە بە هۆی ڕق و نەفرەتەوە بەرەوڕووی مەترسیی هەڵوەشانەوە ببێتەوە. لە سەردەمانی کۆندا خەڵک بە تەنها ئێرەییان بە دراوسێکانیان دەبرد، چوونکە خەڵکە دوورەدەستەکانیان کەمتر دەناسی. بەڵام ئەمڕۆ بە هۆی پەروەردە و فێرکاریی و پەرەسەندنی ئامرازەکانی پێوەندییەوە[٦٥] لێک نزیک بوونەتەوە و زانیاریی مرۆڤ لایەنێکی گشتیی بە خۆوە گرتووە و وەک شتێکی کەسەکیی نەماوەتەوە. ئێمە ئەمڕۆکە ئاگامان لە کۆمەڵگاگەلێک هەیە کە تەنانەت یەکێک لە تاکەکانیان ناناسین. بە هۆی "سینەما"وە خەڵک بە ژیانی ئەو دەوڵەمەندانە ئاشنا دەبن کە پێشتر زۆر بە دەگمەن دەیانتوانی ئەو جۆرە ژیانانە ببینن. بە هۆی گۆڤار و ڕۆژنامەکانەوە لە شەڕاشۆیی و شەڕخوازیی نەتەوەکانی دیکە بە ئاگا دەبن و لە ڕێگەی پڕوپاگەندەوە لە کردەوە ناباوەکانی کەسانێک بە ئاگا دەبن کە تەنها ڕەنگی پێستیان لەگەڵ ئەواندا جیاوازیی هەیە.

---

65 - Communication

زەردپێستەکان ڕقیان لە سپی پێستەکانە و سپی پێستەکانیش ڕقیان لە ڕەشەکانە و بەم جۆرە دەتوانین بڵێین کە بە هۆی پڕوپاگەندەوە پانتایی ڕق و نەفرەت بەرینتر و بەرفراوانتر دەبێت. دیارە ئەمە ڕوونکردنەوەیەکی سادە و ساکارە، چوونکە ئەگەر ئامانجی پڕوپاگەندە هەستاندنی ڕق و نەفرەت بێت، ئاسانتر سەر دەکەوێت. بێگومان ورووژاندنی هەستگەلی مرۆڤدۆستانە هێندە ئاسان نییە و دەبێ لە ناو قووڵایی دڵی مرۆڤی شارستانیی سەردەمی نوێدا بە دوایدا بگەڕێین. ئایا بۆچی مرۆڤی ئەمڕۆ ڕق و نەفرەت زووتر و باشتر لە هاوڕێیەتیی قبووڵ دەکات؟ ڕەنگە هۆیەکەی ئەوە بێت کە دڵە ناڕەزامەند و ئازار پێگەییشتووەکان، زیاتر حەزیان لە ڕقە. دڵە ئازار پێگەییشتووەکان بە گشتیی و ڕەنگە بە شێوەیەکی نابەرهەست پێیان وایە ژیان تا ڕادەیەک واتا و ناوەڕۆکی ڕاستەقینەی خۆی لە دەست داوە. ڕەنگە کەسانی دیکە بتوانن لەو نیعمەتانەی کە سروشت بۆ چێژ و خۆشیی ئێمە ناویەتی بەردەستمان، کەڵک وەربگرن، بەڵام ئێمە خۆمان ناتوانین.

گومان لەمەدا نییە کە دەرفەتە چێژبەخشەکانی سەردەمی ئێمە، زۆر زیاترە لەوەی کۆمەڵگا سەرەتاییەکان، بەڵام ئایا دەبێ زیادبوونی ڕێژەی چێژ و خۆشییەکان تا کوێ بێت؟ ئەمە پرسێکە دەبێ بە جیا باسی لێوە بکرێت. ئەگەر دەرفەتێکی واتان دەست کەوت کە لەگەڵ منداڵەکانتاندا بڕۆن بۆ باخی ئاژەڵان، خەمێک لە چاوی ئەو مەیموونانەدا بەدیی دەکەن کە بێدەنگ و جووڵە دانیشتوون و بایەم ناشکێنن. هەموو کەسێک دەتوانێت لەو کاتەدا تەسەوری ئەوە بکات کە ئەوان حەز دەکەن ببنە مرۆڤ، بەڵام نازانن چۆن! ڕەنگە ئەوان بیر لەوە دەکەنەوە کە بۆچی لە ڕەوتی گەشەکردنیاندا ڕێگەیان ون کردووە و لە هاوڕەگەزە دووپێیەکانیان [واتە مرۆڤ] بە جێ ماون! هاوشێوەی هەر ئەم خەم و خەفەتەش تەشەنەی کردۆتە ناو بوونی مرۆڤی شارستانییەوە. مرۆڤ دەزانێت کە دۆخێکی سەرووتر و باشتر لەم دۆخەی ئێستای لە بەر دەمدایە بەڵام نازانێت چۆن بە دوایدا بگەڕێت و بە دەستی بێنێت. ئەم مرۆڤە سەرەنجام لەوپەڕی بێهیواییدا ڕق لەو هاوڕەگەزانەی خۆی هەڵ دەگرێت کە ئەوانیش وەکوو خۆی ڕێگەیان ون کردووە.

ئێمە لە ڕەوتی گەشەکردنماندا گەییشتووینەتە قۆناغێک لە گۆڕانکاریی، کە دوا قۆناغ نییە و دەبێ بە خێرایی ئەم قۆناغە تێ پەڕێنین، ئەگینا لە ناو ڕێگەدا تیا دەچین و ئەوانەی

کە دەمێننەوە لە ناو دارستانێکی پڕ لە گومان و دڵەڕاوکێدا ون دەبن. لە هەلومەرجێکی ئاوادا هەر چەند ئێرەیی هەندێک کاریگەریی مەترسیدار و تۆقێنەری هەیە، بەڵام بە تەواوەتیی شتێکی شەیتانیی و ناپەسەند نییە و تا ڕادەیەکیش نیشانەی ڕەنج و ماندووبوونێکی قارەمانانەیە - ماندووبوونی کەسانێک کە لە کاتی شەودا و کوێرانە بە دوای شوێنێکدان بۆ حەسانەوە و ئاسوودەیی. ڕەنگە ئەوان بە دوای ئارامش و ئاسودەییدا بەرەو مەرگ و نەمان هەنگاو باوێن. مرۆڤی شارستانیی بۆ دۆزینەوەی ڕێگای دروست و هەڵاتن لە بێهیوایی، دەبێ دەلاقەکانی دڵ و ئەندێشەی بکاتەوە و بە واتایەکی دیکە، بە چاوی دڵ ڕێگاکە ببڕێت و بەم شێوازە داوای ئازادیی لە جیهان بکات و بە دەستی بێنێت.

٧

## هەستی تاوانباریی

سەبارەت بە هەستی تاوانباریی لە بەشی یەکەمدا هەندێک شتمان باس کرد، بەڵام چوونکە یەکێک لە هۆکارەکانی بەدبەختیی مرۆڤە باڵقەکان «هەستکردن بە تاوانباری»یە، دیارە پێویست بە ڕوونکردنەوەی زیاتر دەکات.

سەبارەت بە ڕۆڵی تاوان، وتەیەکی ڕۆحیی - ئایینیی هەیە کە ئەم وتەیە لە ڕوانگەی دەروونناسەکانەوە بایەخێکی ئەوتۆی نییە، بە تایبەت لە [زانستی] دەروونناسیی نوێدا هیچ پێگە و جێگەیەکی بۆ دانانرێت.

لە ناو پڕۆتستانەکاندا ئەم باوەڕە برەوی هەیە کە پاش ملدان بە وەسوەسەیەکی تاوانکارانە، ئەگەری ئەوە هەیە کە ویژدانی تاک بە خەبەر بێتەوە و تووشی یەکێک لەم دوو هەستەی خوارەوەی بکات:

١) هەستکردن بە پەشیمانیی؛ کە دیارە پاش ئەنجامدانی تاوان هیچ سوودێکیشی نییە.

٢) تۆبە کردن، یان هەستکردن بە هەڵاتن و پاکبوونەوە لە تاوان کە ئەگەر بە دڵ و گیان ئەنجام بدرێت، دەتوانێت تاوانەکە بسڕێتەوە.

لەو وڵاتە مەسیحییانەی کە خەڵکەکانیان پێڕەویی لە ئایینزای پرۆتستان دەکەن، هەر چەند باوەڕی خۆیان لە دەست داوە بەڵام بەو حاڵەشەوە زۆربەی خەڵک لە کاتی تووشبوونی تاواندا شوێن هەمان تیۆرە کۆنەکە دەکەون و بە هەندێک گۆڕانکارییەوە کەم تا زۆر ئەم تیۆرەیان پاراستووە.

لە سەردەمی ئێمەدا پرسی بەرەنگاربوونەوەی تاوان، بە هۆی دۆزینەوەی هۆکارە ڕۆحییەکان و لە هەمان کاتدا کامڵبوونی شێوازی دەروونشیکاریی[٦٦] بە تەواوەتیی گۆڕاوە و، دەبێ بڵێین کە شیکردنەوەی تاوان بە بەراورد لەگەڵ هەمان تیۆرە کۆنەکەدا ئەنجام دەدرێت.

ئەڵبەتە گۆڕان بەسەردا هاتنی بیروباوەڕەکان نەک تەنها پڕۆتستانەکان بەڵکوو باوەڕمەندانی کڵێسەی "ئۆرتۆدۆکس"یشی گرتۆتەوە و ئەمڕۆکە ویژدان چیتر ئەو هێزە نهێنیی و تەمومژاوییە نییە؛ کە هەر ئەو تەمومژاویبوونەشی بووبووە هۆی ئەوە کە بە »دەنگی خوای گەورە»ی لە قەڵەم بدەن.

ئێستا ئێمە دەزانین کە کارکردی ویژدان لە شوێنە جۆراوجۆرەکانی دنیادا - بە گوێرەی بارودۆخە کۆمەڵایەتیی و ئابووریی و فەرهەنگییەکان - لە شێوەگەلی جۆراوجۆردا دەردەکەوێت. بە واتایەکی دروستتر دەتوانین بڵێین کارکردی ویژدان لە هەموو شوێنێکدا لەگەڵ دابونەریتە خێڵەکییەکاندا دێتەوە.

بەو زانیارییانەی کە لە سەر کارکردی ویژدان هەمانە، کاتێک دەبیستین کەسێک ویژدانی ئازاری دەدات، دەبێ بزانین ئایا بە ڕاستیی چی لێ قەوماوە. ویژدان، لە ڕاستییدا پێکهاتەیەکە لە چەند هەستی جۆراوجۆر کە سادەترینیان ترس لە دەرکەوتن (کەشفبوون)ی تاوانە.

من دڵنیام لەوەی کە تۆی خوێنەری بەڕێز تووشی هیچ تاوانێک نەبوویتە و بە ڕاستیی هیوادداریشم هەر وا بێت، بەڵام ئەگەر لە کەسێک کە تاوانێکی ئەنجام داوە و بزانێت بە دەرکەوتنی تاوانەکەی بە دڵنیاییەوە سزا دەدرێت، بۆت ڕوون دەبێتەوە کە لە کاتی دەرکەوتن(کەشفبوون)ی تاوانەکەدا پەشیمان دەبێتەوە.

دیارە ئەم قسەیە ئەو تاوانکارە پڕۆفیشناڵانە ناگرێتەوە کە چەندین و چەند جار تووشی تاوانکاریی بوونە و بە مەبەستی تەمێکردن جارجارە بۆ ماوەیەک دەیانگرن و بەندیان دەکەن. ئێمە لێرەدا زیاتر بۆ نموونە مەبەستمان لە بەڕێوەبەری بانکێکە کە لە ڕووی ناچارییەوە لە

---

٦٦ - Psychoanalysis؛ دەروونشیکاریی فرۆید، کە بە مەبەستی شیکردنەوە و لێکدانەوەی خەو و تاقیکردنەوەگەلی هاوشێوە، کەسی تووشبوو بە نەخۆشییە ڕۆحییەکان، بیرەوەرییەکانی ڕابردوو و ئارەزووە ناخەکییەکانی خۆی بە بیر دێنێتەوە و کێشمەکێشە دەروونییەکانی خۆی ڕێک دەخات.

پارەکانی بانک دەدزێت، یان ئەو پیاوە ڕۆحانییەی کە بە پێچەوانەی دەستوورەکانی کڵێسە کەوتۆتە داوی هەوەسە نەفسانییەکانییەوە. ئەم تاکانەش ئەگەر تاوانەکەیان هێندە جیدیی نەبێت، دەتوانن تاوانەکەیان لە بیر بکەن، بەڵام ئەگەر تاوانەکە زۆر گەورە بێت و سزایەکی زۆر گەورەشی هەبێت و ئەگەری دەرکەوتن(کەشفبوون)یشی هەبێت، لەو کاتەدا هیوا دەخوازن کە خۆزگە بە پاکیی مابانەتەوە و ئەو تاوانەیان ئەنجام نەدایە. ڕەنگە ئەم هیوایە، تاوانەکە بە بەر چاویاندا چەندین هێندەی تر گەورەتر بکات.

کەسێک کە لە قوماردا گڕ(گز) دەکات، یان قەرزێکی بێ بەڵگەی[٦٧] لە لایە و نایداتەوە، هەر چەند بە ڕواڵەت ڕەخنەی لێ ناگیردرێت بەڵام لە ناوەوە و لە ڕووی ئاکارییەوە ئەو توانایەی تێدا نییە کە بتوانێت لە هەمبەر ناوزڕان و دەرکەوتنی کردەوەکەیدا خۆڕاگریی بکات. لەم بارەوە بە پێچەوانەوە، بیدعەتکارە ئایینییەکان، یان کەسانی دژی حکوومەت، یان کەسانی شۆڕشگێڕ و خەباتکار، لەو باوەڕەدان ئەم دۆخە نالەبارەی ئێستایان لە چاو چارەنووسی نادیاری داهاتوویاندا هیچ گرینگییەکی نییە، چوونکە داهاتوو هی ئەوانە و، ئێستا چەند ڕق و نەفرەتیان بەرانبەر دەرببڕدرێت، هێندەی ئەو ڕق و نەفرەتە لە داهاتوودا شانازییان پێوە دەکرێت. کەسانێکی ئاوا لە هەمبەر دژایەتیی و دوژمنکارییەکانی کۆمەڵگادا هەست بە تاوانباریی ناکەن، بەڵام کەسێک کە یاسا و ڕێسا کۆمەڵایەتییەکانی بە تەواوەتیی قبووڵ کردووە و کەچی بە پێچەوانەیان دەجووڵێتەوە، ئەگەر بێت و لە ڕیزی چینێکی باڵا[ی کۆمەڵگا] دوور بخرێتەوە، ئێجگار زۆر هەست بە ئازار و بەدبەختیی دەکات و ترسی ئەو کارەساتە و هەروەها ئازارەکانی، ڕەنگە بە ئاسانیی ببێتە هۆی ئەوە کە ئەو کردەوەی خۆی بە تاوان لە قەڵەم بدات.

هەستکردن بە تاوان لە گرینگترین شێوازیدا هەندێک کاریگەریی زۆر قووڵی لێ دەکەوێتەوە کە لە نەست(ناخودئاگا)وە سەرچاوە دەگرێت. دیارە ئەو کاریگەرییانە بە هۆی ترس لە لۆمە و سەرکۆنەی خەڵکەوە خۆیان دەر ناخەن. لە نەست(خودئاگا)دا هەندێک کردەوە بەبێ هەبوونی هۆکاری دیار و ئاشکرا، لە ڕوانگەی تاکی دەروونگەراوە[٦٨] بە تاوان دەژمێردرێن.

---

٦٧ - واتە قەرزێک کە هیچ بەڵگە و زەمانەتێکی بۆ وەرنەگیراوە و، زارەکییە. و. ک.

٦٨ - دەروونگەرا؛ واتە تاکی گۆشەگیر و دوورەپەرێز و بە ناخی خۆدا ڕۆچوو. و. ک.

ئەنجامدانی نائاگایانەی ئەم جۆرە کردەوانە، کاریگەریی ئەوتۆ لە سەر هەست(ئیحساس) و هیوایەتەکانی تاکدا دادەدنێت کە تاکەکان دەتوانن خۆیان لە ئەنجامدانی ئەو جۆرە کردەوانە بپارێزن کە بە تاوانیان دەزانن. کەسێک کە بە خەیاڵ پێی وایە تووشی تاوان بووە، ڕێز لەو کەسانە دەگرێت کە پێی وایە دڵێکی پاکیان هەیە و، ستایشیان دەکات و بە دەربڕینی پەشیمانیی و داخێکی تا ڕادەیەک زۆرەوە دان بەوەدا دەنێت کە شیاوی بوونێکی پاک و بێگەرد و خواترسانە نییە. لە ڕاستییدا لای ئەو، خواترسیی شتێکە کە لە ژیانی ئاساییدا قابیلی پراکتیزەکردن نییە و هەر لە بەر ئەو مەحاڵبوونەشی، هەست بە تاوانباریی دەکات و لەو باوەڕەدایە کە باشترین جۆری ژیان هەرگیز بە نسیبی نابێت و خۆشترین چرکەساتەکانیشی ئەوانەن کە بۆ نزا و پاڕانەوە تەرخانیان دەکات.

لە ڕاستییدا سەرچاوەی هەموو ئەم حاڵەتانە فێرکاریگەلی ئاکارییە کە مرۆڤ پێش تەمەنی شەش ساڵیی لە دایک یان پەرستارەکەیەوە فێر دەبێت. لە قۆناغە سەرەتاییەکاندا فێر دەبێت کە پشتبەستن بە سوێندخواردنەوە کارێکی قێزەون و ناشیرینە و بە تەنها ئاخافتنی نەرمونیان و بە ئەدەبانە شیاوی ڕێزلێگرتنە؛ زۆر خواردنەوەی پیاوە شەڕاشۆکان و جگەرەکێشان و درۆکردن، لەگەڵ ڕێسا ئاکارییەکاندا نایەنەوە. لە سەروو هەمووشیانەوە فێر بووە کە هەموو جۆرە حەزکردن و گوێدانە پرسە سێکسییەکان، کارێکی قێزەون و نارەوایە. ئەو دەزانێت ئەم باوەڕانە کە لە ڕاستییدا باوەڕی دایکی بوونە، لەگەڵ ویستی خوای گەورەدا بە تەواوەتیی دێنەوە. لە هەلومەرجێکی ئاوادا ڕەنگە بە هۆی کەمتەرخەمیی دایکیەوە بۆ نواندنی سۆز و میهرەبانیی، ڕوو بکاتە سۆز و میهرەبانیی پەرستار و گەورەترین چێژ و خۆشیی ژیان لای ئەو، دەبێتە بەدەستهێنانی سۆز و، ئەویش تەنها لە کاتێکدا دەستەبەر دەبێت کە تووشی تاوانێکی دژی ڕێسا ئاکارییەکان نەبووبێت. کەواتە هەر کارێک کە لە ڕوانگەی دایک یان پەرستارەکەیەوە ناپەسەند و ناشیرین بێت، لای ئەو ڕوخسارێکی لێڵ و ترسناک بە خۆوە دەگرێت و وردە وردە لە ساڵانی دواتردا ئەوە لە بیر دەکات کە سەرچاوەی ئەو ڕێسا ئاکارییانە لە کوێوەیە و سەرپێچی لێکردنیشیان چ سزایەکی بە دواوە دەبێت. بەڵام مێشکی ئەو، ئەو فێرکارییە ئاکارییانە فڕێ نادات و ترس و ورکەی ئەوە کە ئەگەر ئەو ڕێسا و فێرکارییانە پێشێل بکات یان بە درۆیان بخاتەوە شایستەی عەزابێکی ترسناکە، وازی لێ ناهێنێت.

ئێستا چیدی بەشێکی زۆری فێرکارییە ئاکارییەکانی سەردەمی منداڵیی، بەها و بایەخی خۆیان لە دەست داوە و هەر بۆیەشە ناتوانین لەگەڵ ڕەفتاری ئاسایی کەسێکی ئاساییدا بەراوردیان بکەین.

بۆ نموونە کەسێک کە لە ناو قسەکانیدا وشەی سووک و بێ ئەدەبانە بە کار دێنێت، لە ڕووی ئەقڵانییەوە لەگەڵ کەسێکدا کە وەها کارێک ناکات چوونیەک نین و قابیلی پێکەوە بەراوردکردن نین. لەگەڵ ئەوەشدا کەسێک کە بەردەوام هەوڵ دەدات پێڕەویی لە یەکێک لە پیاوچاک و خواترسەکان بکات، لە سەریەتی لە ئاخافتنیدا قسەی سووک و ناشیرین بە کار نەهێنێت. هەڵسەنگاندنی ئەم نموونانەنەش بە پێوەرە ئەقڵییەکان کارێکی گەمژانەیە. دەکرێت وەها هەڵسەنگاندنێک لە مەڕ ئەلکۆل و جگەرەش ڕاست بێت. شەرابخواردنەوە لە وڵاتانی باشوورییدا هەستی تاوانباریی لێ ناکەوێتەوە و لە ڕاستییشدا بە هۆکاری بێدینیی و خوانەناسییان بە ئەژمار ناهێنن، چوونکە خەڵکی ئەو شوێنانە باوەڕیان بەوە هێناوە کە عیسا و هاوڕێکانیشی شەرابیان خواردۆتەوە. بەڵام سەبارەت بە تەماکۆ(تووتن) پێچەوانەی ئەمە ڕاستە، چوونکە سەرجەم پیاوچاکان و خواترسە گەورەکان، پێش [سەردەمی] بەکارهێنانی تەماکۆ ژیاون. بەڵام لێرەدا ناتوانین باسێکی ئاقڵانە و لۆژیکیی بێنینە گۆڕێ. ئەم باوەڕە کە هیچ مرۆڤێکی خواترس جگەرە ناکێشێت، لە وەرنەگرتنی چێژەوە سەرچاوە دەگرێت و ئەمەش خۆی دەرەنجامی توێژینەوەکانی ئەمدواییانەیە.

خووی ڕیازەتکێشان[٦٩] تا ڕادەیەکی زۆر، بووە بە بەشێکی دانەبڕاوەی نەست(ناخودئاگا) و، بە گشتیی دەیەوێت ڕێسا ئاکارییەکانی سەردەمی ئێمە وەک شتانێکی نائەقڵانیی نیشان بدات. بە پێی بنەما ئەقڵانیی و بەڵگەمەندە ئاکارییەکان، دابینکردنی کەیف و خۆشیی خود و ئەوانی دیکەش کارێکی شیاو و پەسەند کراوە، بە مەرجێک هیچ ئێش و ئازارێکی بە دواوە نەبێت. کەسی خواترسی بەرباسەکەمان ئەگەر لە ڕیازەتکێشانی جەوهەریی ڕزگاری بێت، تاکێکە بواری کەڵکوەرگرتن لە هەموو چێژە سوودبەخش و خۆشیبەخشەکان بۆ هەموو کەسانی دیکەش دەڕەخسێنێت. من نکووڵیی لەوە ناکەم کە دنیا لێوانلێوە لە درۆ، بەڵام

٦٩ - واتە خۆڕاهێنان بە سەختیی و نەهامەتییەکانی ژیان. و.ک.

پێویستە هێندەی بۆمان بکرێت بە دوای حەقیقەتدا بڕۆین. بەڵام ئەوەم قبووڵ نییە کە درۆکردن لە هەموو هەلومەرجێکدا تاوانێکە قابیلی لێبوردن نییە و، ڕەنگە کەسانی ئاقڵ و ئاوەزمەند لەم بارەوە لەگەڵمدا هاوڕا بن.

جارێکیان لە دەوروبەری گوندێکی دەرەوەی شاردا پیاسەم دەکرد و چاوم بە "ڕێوی"یەک کەوت لە بەر شەکەتیی و هیلاکیی خەریک بوو بمرێت، بەڵام بەو حاڵەشەوە بە ڕاکردن بە دوای پەناگەیەکدا دەگەڕا و دیارە سەرکەوتنیشی بە دەست هێنا. چەند خولەک دواتر تووشم بە تووشی چەند ڕاوچییەک بوو کە بە دوای ڕێوییەکەدا دەگەڕان. سۆراغی ڕێوییەکەیان لە من گرت و پێیان وا بوو من بینیومە. پێم وتن بەڵێ بینیومە. پرسییان بە کام لادا ڕۆشتووە و منیش درۆم لەگەڵ کردن و پێم وا نییە ئەگەر ڕاستم بووتایە، کەسێکی باشتر و بەئەخلاقتر دەبووم.

بەڵام سەبارەت بە پێوەندییە سێکسییەکان، فێرکارییە ئاکارییەکانی سەردەمی منداڵیی زۆر مەترسیدارترن. ئەگەر منداڵێک بە گوێرەی دابونەریتە دێرینەکان و لە بەر دەستی دایک و باوک یان پەرستارێکی تا ڕادەیەک سەختگیر و کەللەڕەقدا پەروەردە کرابێت، پێوەندیی نێوان تاوان و کۆئەندامی زاوزێ [یان کۆئەندامی نێرینە و مێینە] لە تەمەنی شەشساڵیدا هێندە خەست و خۆڵ دەبێت کە کاریگەرییەکانی تا کۆتایی تەمەنی دەمێنێتەوە و لە ناو ناچێت. ئەڵبەتە ئەم هەستە بە هۆی «گرێی ئۆدیپ»ەوە[٧٠] بەهێزتر دەبێت. بۆ نموونە ژنێک کە لە قۆناغی منداڵییدا سەرەڕای ئازادبوونی پێوەندییە سێکسییەکان نەیتوانیوە چێژ لەو توانایەی وەربگرێت، کاتێک هەلی تێرکردنی حەزە سێکسییەکانی بۆ دەرەخسێت و دەیهەوێت قەرەبووی هەموو ئەو ڕۆژە لە دەستچووانە بکاتەوە، لە ڕوانگەی پیاوانەوە بە ژنێکی گەندەڵ و بەلاڕێداچوو لە قەڵەم دەدرێت. ئەوان ئەگەر لە لایەن هاوسەرەکانیانەوە داواکاریی سێکسییان

---

٧٠ - بە گوێرەی ئەفسانەکانی یۆنان، ئۆدیپ پاڵەوانی دێرینی یۆنان بوو کە باوکی خۆی کوشت و دایکی لە خۆی مارە کرد. لە دەروونناسییدا بە هەستەکانی کوڕی ٣ بۆ ٦ ساڵان بەرامبەر بە دایک و باوک و کچە هاوتەمەنەکانی خۆی دەوترێت کە زۆربەی کات تێکەڵە بە جۆرێک لە ڕق و کینە و دوژمنکاریی. هەستە ڕقئاسا و تێکەڵ بە بوغز و کینەی کچ وکوڕان بە شێوەی سەرکەشیی و سەرپێچیکردن لە قسەی دایک و باوکان و هەروەها شپرزەیی و بێسەروبەریی لە کارەکانی ژیانیانیدا خۆی دەر دەخات.

بخرێتە بەردەم، ناتوانن ڕێز لە هاوسەرەکانیان بگرن مەگەر ئەوەی کە ڕقیان لە سێکس بێت. ئەوە لە کاتێکدایە ئەگەر هاوسەرەکەی لە ڕووی سێکسییەوە سارد بێت، بۆ تێرکردنی حەزە سێکسییەکانی خۆی پەنا دەباتە بەر هەندێک ڕێگەی تر و تەنانەت هەوڵ دەدات لە ڕێگەی ناڕەوا(حەرام)ەوە حەزە سێکسییەکانی تێر بکات. ئەم تیۆرە شەهوانییە تەنانەت ئەگەر کاتیی و زووتێپەڕیش بێت، تێکەڵ بە هەستی تاوانکاریی دەبێت و وای لێ دێت کە پیاوی پابەند بە بنەماگەلی ئاکاریی، لەگەڵ هیچ ژنێکدا چ هاوسەری بێت یاخود شتێکی تر، بەختەوەر نابێت. وەها حاڵەتێک ئەو ژنانەش دەگرێتەوە کە بە شێوازێکی ئایینیی پەروەردە کراون و ئەم جۆرە ژنانە خۆیان لە هەموو جۆرە پێوەندییەکی سێکسیی لەگەڵ مێردەکانیاندا بە دوور دەگرن و تەنانەت چێژی سێکسیی دەیانترسێنێت. ئەمڕۆ لە پێوەندیی لەگەڵ ژناندا وەها دۆخێک لە چاو پەنجا ساڵ پێش ئێستا، زۆر کەمتر بۆتەوە. دەبێ ئەوەش بڵێین کە ئەمڕۆکە لە ناو چینی خوێندەواردا ژیانی سێکسیی پیاوان زۆر گرژ و ئاڵۆزترە لەوەی ژنان و کاریگەریی ژەهری کوشندەی هەستکردن بە تاوانکاریی، زیاتر پیس و ئالوودەی کردووە. بە هۆی بێدەنگیی دەسەڵاتدارانی حکوومەتەوە، ئەم ئاگایی و وشیارییە هاتۆتە ئاراوە کە دابونەریتە کۆنەکانی سەبارەت بە پرسە سێکسییەکان، گەلێک زەرەر و زیانیان بۆ لاوەکان هەیە و ڕێگەچارەکەشی زۆر ئاسانە:

پێش ئەوەی کە منداڵێک - کوڕ یان کچ - بگاتە تەمەنی باڵقبوون، نابێ فێری پرسە سێکسییەکان بکرێت و نابێت ئەوەش بخزێنرێتە مێشکییەوە کە سێکسی سروشتیی کارێکی قێزەونە، بەڵکوو هەر کاتێک وەختی فێرکردنی پرسە سێکسییەکان هات دەتوانرێت بە پشتبەستن بە ڕێساگەلی ئەقڵییەوە ئەنجام بدرێت. بە هەر حاڵ من نامەوێ لەم کتێبەدا بابەتەکە لە ڕەهەندی پەروەردەییەوە تاوتوێ بکەم، بەڵکوو مەبەستم زیاتر ئەوەیە کە تاکە باڵقەکان چۆن دەتوانن دەرەنجامە خراپ و زیانبەخشەکانی ئەو پەروەردە و فێرکارییەی کە هەڵگری هیچ ڕێسایەکی ئاکاریی نییە و خۆی لە خۆیدا دەبێتە هۆی هەستکردن بە تاوانکاریی، بگەیننە کەمترین ئاست. ئاڵۆزترین پرس لێرەدا هەمان ئەو شتەیە کە لە یەکێک لە بەشەکانی پێشووتردا شرۆڤەمان کرد و بەو دەرەنجامەش گەییشتین کە نەست (ناخودئاگا) ناچارە باوەڕە کارتێکەرەکانی سەر ناخ (دەروون)ی وشیارمان بورووژێنێت.

نابێ باوەڕی تاکەکان هەموو چرکەساتێک لە ژێر کاریگەریی حاڵەتە ڕۆحییەکاندا گۆڕانی بە سەردا بێت. هەستکردن بە تاوانکاریی، بە زۆریی لەو کاتانەدا دەردەکەوێت کە ئیرادەمان بە هۆی شەکەتیی، نەخۆشیی، سەرخۆشیی(مەستیی)، یان هەر هۆکارێکی ترەوە سست و لاواز بووبێت. شتێک کە تاک لەم ساتەوەختانەدا هەستی پێ دەکات (بێجگە کاتەکانی مەستیی)، سەرچاوەکەی دەگەڕێنێتەوە بۆ ئیلهامە ڕۆحییەکانی جەوهەر(زات)ی خۆی.

«شەیتان پاش لاوازیی و پەککەوتن، گۆڕا بە بوونێکی پیرۆز» بەڵام ئەوە شتێکی بێهوودەیە کە پێمان وابێت چرکەساتەکانی لاوازیی و ناتەوانیی، زیاتر لە چرکەساتەکانی بەهێزیی و بەتوانایی، دەبنە هۆی ژیریی و دووربینیی. لە کاتەکانی لاوازییدا خۆڕاگریی لە هەمبەر وەسوەسەگەلی منداڵانەدا کارێکی ئەستەمە، بەڵام هیچ هۆکارێکیش لە ئارادا نییە کە ئەم جۆرە بیرکردنەوانەی تاکە باڵقەکان سەرەڕای تەندروستیی توانا فکریی و ئەقڵییەکانیان بە باشتر بزانرێن. بە پێچەوانەوە تاک دەبێ وەفاداریی تەواو و ڕاستەقینەی بەرانبەر هەموو ئەو شتانە هەبێت کە ئاگایانە و بە پلانی پێشوەخت بۆداڕێژراو و بە پشتبەستن بە ئەقڵ و ئاوەزی خۆیەوە باوەڕی پێیان هەیە و ئەمەش وەک پرەنسیپ و ڕێسایەکی چەسپاو چاو لێ بکات. سەرکەوتن بە سەر وەسوەسەگەلی منداڵانەی نەست و تەنانەت بە تەواوەتیی گۆڕینی ناوەڕۆکیان کارێکی زۆر ئاسانە. هەر کاتێک لە هەمبەر ئەنجامدانی کردەوەیەکدا کە ئەقڵ بە کردەوەیەکی پیس و ناپاکی نازانێت، هەست بە پەشیمانیی دەکەن، دەبێ بە وردیی لە هۆیەکانی پەشیمانییەکەتان بکۆڵنەوە و بە تەواوەتیی پووچیی و بێهوودەیی ئەو کردەوەیەتان بۆ دەربکەوێت و هەوڵ بدەن باوەڕە ویژدانییەکانتان هێندە ڕوون و ئاشکرا و لێبڕاوانە بن کە کاریگەریی لە سەر نەست دابنێن و شوێنەواری پەروەردەی دایک یان پەرستار لە قۆناغی منداڵییدا پووچەڵ بکەنەوە. نابێ دوابەدوای یەکدا هاتنی چرکەساتە لەبار و نالەبارەکان ببێتە هۆی شادیی و کەیفخۆشیی. بە ئیرادەیەکی بەهێز و بەم بیرۆکەوە کە بایەخێکی ئەوتۆی ڕاستەقینەیان نییە، هەموو شتێکی نالەبار و گەمژانە(ناژیرانە) تاقیی بکەنەوە و مەهێڵن بیرۆکە نائەقڵانییەکان بوونتان داگیر بکەن و بە سەرتاندا زاڵ بن. لە هەمان کاتدا ئەو بیرۆکە و هەستە پڕوپووچانەی کە دزە دەکەنە ناو «نەست»تانەوە ڕیشەکێش بکەن

و پاش تاقیکردنەوە فڕێیان بدەن و هەرگیز مەهێڵن وەک منداڵێکی دوودڵ و ڕاڕا کە هەندێک جار پێڕەویی لە ئەقڵ دەکات و هەندێک جاریش گرفتاری نەزانییەکی منداڵانەیە، بمێننەوە. هەرگیز لە بێڕێزیکردن بەو کەسانەی کە قۆناغی منداڵیی ئێوەیان لە ژێر ڕکێفدا بووە مەترسن. لەو کاتانەدا لە بەر ئەوەی کە ئێوە لاواز و بێهێز بوون، ئەوان وەک کەسێکی زانا و بەتوانا دەردەکەوتن، بەڵام ئێستا چیدی ئێوە نەزان و ناتەوان نین و پێویستە هێز و توانای ئەقڵییان هەڵسەنگێنن تاکوو بۆتان دەربکەوێت ئایا بە ڕاستیی شیاوی ئەو ڕێز و حورمەتە هەن کە ئێوە بە پێی عادەت بۆیان دادەنێن یان نا؟ بە شێوەیەکی جیدیی ئەم پرسیارە لە خۆتان بکەن ئایا دەکرێت بارودۆخی دنیا بە هۆی ئەو فێرکارییە ئاکارییە تەقلیدییانەی کە نەوەی گەنجی پێ پەروەردە کراوە، باشتر بکرێت؟ لەوە ورد ببنەوە کە تا چ ڕادەیەک خورافاتی پڕوپووچ لە پەروەردەکردنی ڕۆح و جەستەی تاکی چاکەکاری کۆنپارێز (مەحافزەکار)دا دەوری هەبووە و بیر لەوەش بکەنەوە مادام تابۆگەلی سەرسووڕهێنەر و گەمژانە، وەکوو پەناگەیەک لە بەردەم مەترسییە نادیار و وەهمییەکاندا وان، چۆن کەمتەرخەمیی دەکرێت لە ئاست هەڵوەشانەوەی ڕاستەقینەی ئاکارییدا کە هەڕەشە لە تاکی باڵق دەکات و ژیانی بەرەوە گەندەڵیی و ڕزیویی دەبات؟ ئایا بە ڕاستیی ئەو کردەوە زیانبەخشە ڕاستەقینانە چین کە دەوریان هەیە لە کارتێکردن و وەسوەسەکردنی تاکەکاندا؟ ئەو هەڵسوکەوتە توندوتیژئاسا و قێزەونانەی کە یاساش ڕێیان لێ ناگرێت و لە کار و پیشەکاندا ئەنجام دەدرێن، وەکوو توندوتیژیی لەگەڵ فەرمانبەراندا، چەوساندنەوەی ژن و منداڵ و ئێرەیی بردن بە ڕکابەرەکان، چەوساندنەوە لە مشتومڕە سیاسییەکاندا؛ بەڵێ ئەمانە ئەو تاوانە زیانبەخشانەن کە ئەمڕۆ لە ناو کەسانی ئابڕوومەند و بەڕێزدا برەوی زۆریان هەیە. مرۆڤ بە هۆی ئەم تاوانانەوە بەدبەختیی و بێهیوایی بە دەوروبەری خۆیدا پەخش و بڵاو دەکاتەوە و بەش بە حاڵی خۆی، یارمەتیی هەڵوەشانەوەی شارستانییەت دەدات. ئەوەشمان لە بیر نەچێت ئەمانە پرسگەلێک نین کە لە کاتی نەخۆشییدا تاک ناچار بکەن خۆی وەک کەسێکی دەرکراو و نەفرەتلێکراوی کۆمەڵگا و هەروەها بێبەش لە هەموو بەخششە خواییەکان وێنا بکات. ئەمانە هۆکارگەلێک نین کە تاک لە ناو مۆتەکەکان یان لەگەڵ دەنگە لۆمەئاساکانی دایکییەوە بەرەوڕوویان ببێتەوە. بۆچی واتا و ناوەڕۆکی ئاکارییانەی «نەست» بەم شێوەیە نالۆژیکیی و نائەقڵانییە؟

چوونکە باوەڕمەندیی بە هەموو بنەما ئاکارییەکانی سەرپەرستەکان (بەخێوکەرەکان)ی سەردەمی منداڵیی، شتێکی گەمژانە بووە. بەڵێ ئەو بنەمایانە لە خوێندنەوە و ئەرکەکانی تاک بەرانبەر بە کۆمەڵگاوە سەرچاوەیان نەگرتووە بەڵکوو بە تەنها هەڵگری هەندێک تابۆی کۆنی نالۆژیکیین. بڕوام پێ بکەن دڵنیام لەوەی کە توخمەکانی گەندەڵییەکی هەڵقوڵاوی نەخۆشیی ڕۆحیی بوو کە "نێرۆن"ی ئیمپراتۆری لە کاتی سەرەمەرگیدا ئازار دەدا، نەک یاساگەلی ئاکاریی. یاساگەلێکی ناڕاستەقینە و بەناو ئاکاریی ئێمە لە لایەن پیاوانی ئایینیی و ئەو ژنانەوە ڕێک خراون کە فکریان دیل و کۆیلە بووە. ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە تاکەکان لە ژیانێکی ئاساییدا، بەشی شیاو و شایستەی خۆیان هەبێت و فێر بن کە لە دژی ئەم جۆرە وەهم و خەیاڵە قێزەون و ناشیرینانە هەستنەوە و شۆڕش بکەن.

ئەگەر ئەم سەرکەشیی و ڕابوونە بۆ بەدەستهێنانی بەختەوەریی سەر بکەوێت و تاک بتوانێت بنەمای خۆڕاگریی بکات بە تەوەری سەرەکیی ژیانی خۆی و، لە نێوان دوو «ئینفیعال»دا خۆی لە دوودڵیی و دڕدۆنگیی بە دوور بگرێت، پێویستە بە قووڵیی دەرک بە فرمانە ئەقڵییەکان بکات. پێدەچێت زۆربەی تاکەکان لە کاتی هەڵاتن لە خورافەکانی سەردەمی منداڵیی، پێیان وایە لەم ڕووەوە ڕزگاریان بووە. بەڵام ئەوان بێئاگان لەوەی کە ئەم خورافانە هێشتا لە ناوەوە جموجۆڵیان هەیە و چاوەڕێی هەلی گونجاو دەکەن. ئێمە کاتێک باوەڕ بە ڕێسایەکی گشتیی دێنین و تیایدا شێلگیر دەبین، دەبێ وە دوای دەرەنجامەکانی بکەوین و ئەو باوەڕانەی ناتەبان لەگەڵ باوەڕە تازەکان، بخەینە لاوە، چوونکە ئەگەر ئەو کارە نەکەین ئەگەری مانەوەی باوەڕەکانی پێشوو زیاتر دەبێت و لە کاتی هەستکردن بە تاوانکارییدا بەهێزتر دەبن. لە کاتی هەستکردن بە تاوانکارییدا نابێ پاشماوەی باوەڕەکانی پێشوو وەک دەنگ و ئیلهامێکی لە سەرووی شتەکانی دیکەوە لە قەڵەم بدەین. دەبێ بە دەرەنجامی نەخۆشیی ڕۆح و لاوازیی خۆمانیان بزانین - بێجگە لەو کاتانەی نەبێت کە لەو بنەمایانەوە سەرچاوەیان گرتبێت کە لەگەڵ ئەقڵی ئێمەدا ناتەبان. بە واتایەکی دیکە بێجگە لەو کاتانەی کە ئەقڵمان لاوازە، دەبێ بە گژ پاڵنەرە پووچەڵە ناسراوەکاندا بچینەوە.

من نالێم تاک دەبێ خاوەنی بنەماگەلی ئاکاریی نەبێت؛ بەڵکوو پێم وایە دەبێ ڕێساگەلی ئاکاریی تێکەڵ بە خورافات، کە واتاکەیان بە تەواوەتیی گۆڕانی بەسەردا هاتووە، فەرامۆش بکرێن.

بە هەر حاڵ من بە گومانم لەم پرسەدا کە مرۆڤ لە کاتی هەستکردن بە تاوانکاریی لە هەمبەر پرسەکانی دژی بەرنامە و پلانەکانی ژیانی خۆی، بتوانێت بە ژیانێکی مەعنەویی باش و گونجاو بگات. چوونکە هەر چۆنێک بێت لە سەرووی هەستکردن بە تاوانکارییەوە، باوەڕبەخۆبوونێک هەیە کە ئەگەر مرۆڤ لێی بێبەش بێت وەکوو کارەساتێک وایە و بە لەدەستدانیشی شتێکی باشتر بە نسیبی نابێت.

دروستترین ڕێگە لەم ناوەدا هەمان ئەزموونە. واتە بە بینینی کردەوە نەشیاوەکانی تاکەکانی دیکە و ئەزموونکردنی کردەوە نائاساییەکانی خۆمان، لەو شتانە نزیک نەکەوینەوە کە هەستی تاوانکاریی دەوروژێنن تا لە دەرەنجامەکانی هەستکردن بە تاوانکاریی بە دوور بین.

لە ڕاستییدا هەستکردن بە تاوانکاریی نەک تەنها نابێتە هۆی ژیانێکی بەختەوەرانە بەڵکوو کاریگەرییەکی تەواو پێچەوانەشی لێ دەکەوێتەوە. ئەم هەستە نەک تەنها کاریگەریی تەواوی لە سەر بەدبەختیی مرۆڤدا هەیە، بەڵکوو دەبێتە هۆی سووکیی و بچووکبوونەوەی تاک و، ئاکامەکەشی دەبێتە ئەوە کە بەدبەختیی تاک لە دژی ئەو کەسانەدا دەوروژێنێت کە ڕەفتارێکی زێدەڕۆیانەیان هەیە و دەبنە هۆی ئەوە کە چێژەکان واتای خۆیان لە دەست بدەن و دواجاریش جڵەوی کاروبارەکانی ژیانی لێ دەستێنن.

وەها کەسێک کە لە هەمبەر هەستکردن بە تاوانکارییدا خۆی بە کەسێکی بەدبەخت دەزانێت، بە هۆی ئەو خۆبەکەمزانینەی کە لە ناخیدا ڕەگی داکوتاوە، بە ڕق و کینەوە لەگەڵ کەسانی گەورەتر و سەرووتر لە خۆی هەڵسوکەوت دەکات کە دیارە پێویست بە ڕوونکردنەوەی دەرەنجامەکانی ئەم ڕەفتارەش ناکات. لای ئەو، ئێرەییبردن ئاسان و، پەسن و پیاهەڵوتن کارێکی سەخت و ئەستەمە و، بە هۆی خۆدەرخستنی وەک کەسێکی تووڕە و ناوچاوگرژ، دەکەوێتە پەراوێزەوە و گۆشەگیر دەبێت. ئەوەش لە کاتێکدایە کە هەڵسوکەوتی چاکەکارانەی تێکەڵ بە لێبووردەیی، نەک تەنها ڕەزامەندیی دیترانی لێ دەکەوێتەوە بەڵکوو دەبێتە هەوێنی سەرەکیی بەختەوەریی بۆ خودی ئەو کەسە. کەسێک کە خاوەنی تایبەتمەندییەکی ئاوا بێت

دەکەوێتە بەر دڵان و لای خەڵک خۆشەویست دەبێت و دیارە ئەمەش حاشای لێ ناکرێت. بەڵام ڕەفتاری لەم جۆرە لای کەسانی دیلی هەستی تاوانکاریی، نەک تەنها ئەستەمە بەڵکوو هەر پێیان ناکرێت و تەنانەت ئەگەر هەوڵی زۆریشی بۆ بدەن بە سەختیی دەتوانن پێی بگەن. ئەم ڕەفتارە دەرخەری هاوسەنگیی و باوەڕبەخۆبوونە و لە تەکامولی فکرییەوە سەرچاوە دەگرێت و لە ڕەوتی کامڵبوون و گەشەکردنیدا لایەنە جۆراوجۆرەکانی سروشتی مرۆڤ لە **هەست** و **نیمچەهەست**(نیمەخودئاگا)ەوە بگرە تا **نەست**، بە یەک ڕێژە هاوسەنگ دەبن و دژبەرایەتیی یەکدیش ناکەن. زۆربەی کات بە بوونی پەروەردە و فێرکارییەکی ئاقڵانە، هێنانەئارای ئەم هاوسەنگییە کارێکی سووک و ئاسانە. بەڵام ئەگەر فێرکاریگەلی نائاقڵانە پەیڕەو بکرێت، گەییشتن بەم ئامانجە دژوار و تەنانەت مەحاڵ دەبێت و ئەگەریش کەسی خاوەن ئەم تایبەتمەندییە پێداگرانە خۆڕاگریی بکات، تەنانەت دەروونناسان و دەروونشیکارانیش ناتوانن هیچ کارێکی بۆ بکەن.

من پێم وایە زۆربەی کات کەسی نەخۆش خۆی، دەتوانێت ببێتە پزیشکی چارەسەرکەری خۆی و پێویستییەکی ئەوتۆی بە یارمەتیی کەس نابێت مەگەر لەو کاتانەی نەبێت کە بارودۆخی زۆر خراپ و نالەبار بێت.

ئەگەر کەسێک بە خۆی بڵێت: «من دەرفەتی وەها کارێکم نییە و ژیانێکی جەنجاڵ و پڕکێشەم هەیە و هیچ چارەیەکی دیکەم نییە بێجگە لەوەی کە لێگەڕێم نەست(ناخودئاگا)م چ فڕوفێڵک ئەنجام دەدات با بدات»؛ هیچ هۆکارێک هێندەی ئەم ڕوانینە نابێتە هۆی دابەزینی ئاستی بەختەوەریی و کارامەیی تاک.

لە وەها حاڵەتێکدایە کە نیوەیەک لە بوون (وجوود)مان لە دژی نیوەکەی ترمان هەڵدەستێتەوە و لەم ململانێیەشدا هەر کامەیان هەوڵی لەناوبردنی ئەوی تریان دەدات کە هەر ئەمە خۆی، لە هێز و وزەی هەر دوو لا کەم دەکاتەوە. بەڵام کاتێک بمانەوێت لایەنە جۆراوجۆرەکانی کەسایەتیی هەماهەنگ بکەین، هیچ هەلێک بۆ لەکیسچوون نامێنێتەوە.

ئەڵبەتە من پێشنیار ناکەم تاکەکان هەموو ڕۆژێک کاتژمێر [یان چەند کاتژمێر]ێک بۆ بەخۆداچوونەوە تەرخان بکەن، چوونکە ئەمە دوایین و باشترین ڕێگە نییە، چوونکە دەبێتە هۆی ڕۆچوونی زیاتری تاکەکان بە ناو خۆیاندا. ڕۆچوونە ناو خۆش، نەخۆشییەکی دیکەیە

کە دەبێ چارەسەر بکرێت، چوونکە کەسایەتییەکی هەماهەنگ بە یەک ڕێژە بایەخ بە دنیای ناوەوە و دەرەوە دەدات. پێشنیاری من ئەوەیە کە تاک دەبێ بڕیار بدات باوەڕەکانی لە سەر بنەمای ئاکارێکدا دابمەزرێنێت و ڕێگە نەدات باوەڕگەلی دژبەیەکی نالۆژیکیی - تەنانەت ئەگەر کەمیش بن - ئازادانە دزە بکەنە ناو بوونییەوە.

چەمکێک بە ناوی «ململانێ لەگەڵ دەروون[٧١]»دا هەیە کە مەبەست لێی، ئەو چرکەساتانەیە کە تاک حەزی گەڕانەوە بۆ سەردەمی منداڵیی لە لا دروست دەبێت. ئەم ململانێیە ئەگەر تا ڕادەیەکی زۆر بەهێز بێت، بە خێرایی دەتوێتەوە و ماوەیەکی کەم دەخایەنێت و لە ناو دەچێت. بەڵام لەو کاتانەیدا کە ململانێکە یەک لایەنەیە و کەسایەتیی مرۆڤیش بە توندیی بەرهەڵستکاریی ناکات، دەمێنێتەوە و کێشەیەکی ئەوتۆشی لێ نابێتەوە.

زۆرێک لە تاکەکان حەزێکی ئەوتۆیان بۆ پێڕەویکردنی ئەقڵ و لۆژیک نییە و تا کاتێکیش هێز و توانای ئەقڵ و لۆژیک قبووڵ نەکەن، ئەم قسانەی من بە هەند وەر ناگرن و بە گوێشم ناکەن. بە باوەڕی من ئەم بۆچوونە، لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە باوەڕێکی هەڵەیان سەبارەت بە کاریگەریی ئەقڵ و لۆژیک لە سەر ژیان لە لا دروست بووە. ئەم کەسانە دەبێ بزانن کە ئەرکی ئەقڵ، هێنانەئارای سۆز و عاتیفە و ئیحساسات نییە - هەر چەند لەوانەشە بەشێک لە ئەرکەکانی، کۆنترۆڵکردنی ئیحساسات بێت و بە دڵنیاییەوە بەختەوەریی هەوسارپچڕاو جڵەو دەکات. ئەرکی ئەقڵ، دۆزینەوەی ڕێگایەکە بۆ کەمکردنەوەی ڕق و نەفرەت و کینە و چاوچنۆکیی و ئێرەیی، کە ڕوونکردنەوەی ئەم بابەتە لە ئەستۆی «سایکۆلۆژیای ئەقڵیی»دایە. بەڵام ئەمە شتێکی هەڵەیە ئەگەر پێمان وابێت بە بێهێز و لاوازکردنی ئەم ئیحساساتە، تاوانبارێتیی عاتیفە لە بارەگای ئەقڵدا دەستەبەر دەبێت. لە خۆشەویستیی ئاگریندا، لە سۆزداریی دایک و باوکدا، لە هاوڕێیەتیدا، لە چاکەکاریی و خۆتەرخانکردن بۆ هونەر و زانستدا، مەرج نییە ئەقڵ هەوڵی کەمکردنەوە یان کۆنترۆڵکردنیان بدات. لای کەسانی ئاوەزمەند و ئاقڵ، ئەم ئیحساس و عاتیفانە، شادیی ورووژێنەر و سەرسامکەرن و بە شێوەیەکی سروشتیی، تاکێکی ئاقڵ هیچ هەوڵێک بۆ کەمکردنەوەی هێز

---

٧١ - نەفس

و توانایان نادات، چوونکە هەموویان بەشێکن لە ژیانی بەختەوەرانە و، هەر ئەم جۆرە پرسانەن کە دەبنە هۆی بەختەوەریی تاکەکان.

ئەو عاتیفانەی کە باسمان لێ کردن، هیچ شتێکی نالۆژیکیی و دژی بنەما ئەقڵییەکانیان تێدا نییە و هەر کامەیان بە جیاجیاش بەها و بایەخی تایبەتیی خۆیان هەیە. کەسانێک کە بێزارن لە دەسەڵاتی ئەقڵ، لە جیاتیی بایەخدان بەم جۆرە تایبەتمەندییانە، گرینگیی بە پێوەرە بێبەهاکان دەدەن. بێگومان دەتوانین بڵێین نابێ هیچ کەسێک ترسی لە پێڕەویکردنی بنەماگەلی ئەقڵیی و لۆژیکیی هەبێت و لەوە بترسێت کە نەکا ژیانی لێ تاڵ بکەن. کەسێک کە پێڕەوی بنەماگەلی ئاکاری و ئەقڵییە، بە هۆی ئەو هەماهەنگییە دەروونییەی کە هاتۆتە ئاراوە، بە شێوەیەکی ئازادتر و ئاسانتر بیر لە دنیا دەکاتەوە و بە هێز و توانایەکی زیاتریشەوە ئامانجەکانی خۆی لە دنیادا بەرەو پێشەوە دەبات و بە گشتیی ئەم جۆرە کەسانە سەرکەوتووتر لەو کەسانەن کە بەردەوام دەرگیری کێشە و ململانێی دەروونین.

یەکێک لە وەڕسکەرترین دۆخەکان ئەوەیە کە تاک، خۆی لە دەروونی خۆیدا زیندانیی و گرفتار بکات. بە پێچەوانەشەوە شتێکی زۆر شادیبەخشە ئەگەر مرۆڤ هەموو هێز و سەرنجی لە سەر لایەنەکانی دەرەوەی بوونی خۆی چڕ بکاتەوە.

بنەما ئاکارییە تەقلیدییەکان، بەبێ ڕەچاوکردنی یاسا و ڕێساکان، وامان لێ دەکەن هەموو سەرنجمان لە سەر نەفسی خۆمان چڕ بکەینەوە و هەست بە تاوانبارییش بەشێکە لەم چڕبوونەوە نائاقڵانەیەی سەر نەفس. کەسانێک کە حاڵەتە دەروونییەکانیان تاقیی نەکردۆتەوە، نازانن کە هۆکاری ئەم حاڵەتانە ڕێسا هەڵە ئاکارییەکانن و، کاتێکیش ئەقڵ و ئاوەز بە شتێکی ناپێویست و ناگرینگ لە قەڵەم دەدەن، ئەگەری ئەوە هەیە کە هەڵخەڵەتابن.

کەسانێک کە تەنها بۆ جارێک تووشی ئەم نەخۆشییە بوونە، بۆ چارەسەرکردنی خۆیان پێویستیان بە ئەقڵ هەیە و ڕەنگە ئەم نەخۆشییە هەنگاوێک بێت بۆ گەشەکردنی هێزە فکرییەکانیان.

بە باوەڕی من کەسێک کە پاش تووشبوونی نەخۆشیی، وا هەست بکات کە توانیویەتی خۆی چارەسەر بکات، ناتوانێت دان بە ڕۆڵ و کاریگەریی ئەقڵ لە ڕەوتی چارەسەرەکەیدا نەنێت. دیارە سەلماندنی ئەم بابەتە بۆ کەسێک کە هەرگیز تووشی ئەو نەخۆشییە نەبووە و

پێویستیشی بە چارەسەر نەبووە، کارێکی ئاسان نییە، چوونکە ئەو بە هیچ شێوەیەک لەگەڵ ئەم کێشەیەدا ئاشنا نییە و دەرک بە زەروورەتیشی ناکات.

دژایەتیکردنی ئەقڵ و ئاوەز کە ئەمڕۆکە بۆتە شتێکی باو، لەم حەقیقەتەوە سەرچاوە دەگرێت کە کارکردی ئەقڵ بە قەدەر پێویست لەگەڵ ڕێسا دروستەکاندا نایەتەوە و تەنانەت ئەگەریش بێتەوە، بە تەواوەتیی دەرکی پێ نەکراوە.

کەسانی گرفتار - مەبەست لەو کەسانەیە کە شەڕ و کێشەیان لەگەڵ ناخ و دەروونی خۆیاندا هەیە - کاتێک بە دوای وروژان(هەیەجان) و جۆشوخرۆشدا دەگەڕێن، لە هەرێمی ئەقڵی تێ دەپەڕێنن. ئەوان هەیەجانیان پێ خۆشترە لە ئارامشێک کە لە ئەقڵەوە سەرچاوەی گرتبێت. کەسێکی ئاوا سەرەڕای ئەوەی کە کەسێکی خاوەن ئەقڵێکی تەواو تەندروستە، بەڵام جۆشوخرۆش و هەیەجانی زۆر پێ خۆشە، چوونکە کەمترین قازانجی بۆ ئەو ئەوەیە کە تووشی لەبیرچوونەوەی دەکات و خەیاڵ و بیرۆکە ئازاراوییەکانی لێ دوور دەخاتەوە. ئەم کەسانە کە خوازیاری جۆش و خرۆش و هەیەجانن، ئەوە لە بیر دەکەن کە لەبیرچوونەوەکە کاتییە و هەرکە توایەوە، خەیاڵ و بیرۆکە ئازاراوییەکان بە توندییەکی خەستوخۆڵترەوە خۆیان دەردەخەنەوە.

کەسانی خوازیاری هەیەجان، هەموو جۆرە عاتیفەیەکیان بە لاوە کەیفخۆشکەرە و لە بەر ئەوەش کە ناتوانن بە تەواوەتیی لە بەختەوەریی ڕاستەقینە تێ بگەن، لە ناو ئێش و ئازار و مەستیی(=سەرخۆشیی)دا بە دوای ئارامشدا دەگەڕێن. پێویستە ئاماژە بەوەش بکەم ئەم حاڵەتە، نیشانەی قۆناغێکی پێشکەوتووتر و قووڵتر و ڕەگداکوتاوتری نەخۆشییەکەیە.

مرۆڤێک کە گرفتاری نەخۆشیی هەستکردن بە تاوانکاریی نەبێت، کاتێک پێی وایە بەختەوەریی بە دەست هێناوە کە سەرجەم هێزەکانی خۆی لە خزمەتی خۆیدا ببینێتەوە، لە کاتێکدا کەسی تووشبوو ناتوانێت جڵەوی هێزەکانی خۆی بە دەستەوە بگرێت.

مرۆڤ لە چرکەساتە سەختەکانی بیرکردنەوەدا بچووکترین شت لە بیر ناکات. بەئاگابوون و بەدەستهێنانی شتە شاراوەکان، زیاترین چێژ و خۆشیی بە نسیبی مرۆڤ دەکات. ڕێک وەکوو حەلکردنی پرسێکی ئاڵۆزی بیرکاریی کە زۆر دڵخۆشکەرە. ئەم خۆشییەش

شادمانییەکی ڕاستەقینەیە و شادمانیی هەڵقوڵاوی مەستیی و خۆلەبیرکردن، شتێکی بێهوودە و ناڕاستەقینەیە.

ئێستاکە ئەو سەختییانەی کە دەبنە هۆی ڕەزامەندیی و شادمانیی، بە بەکارهێنانی تەواوەتیی هێزەکانی دەرک و تێگەییشتن لەم دنیایەدا دەستەبەر دەبن و هیچ ڕێگایەکیش جگە لە کەڵکوەرگرتن لە دەرک و تێگەییشتن (=ئیدراکات) بۆ گەییشتن بە ڕەزامەندیی و شادمانیی، بوونی نییە.

## ٨

## هەستی چەوساوەیی

هەستی چەوساوەیی، لە شێوە خەستوخۆڵەکەیدا، جۆرێکە لە شێتیی. هەندێ کەس پێیان وایە کە بەردەوام کەسانێک هەن هەوڵی کوشتن یان گرتن یان زیان پێگەیاندنیان دەدەن. لەم جۆرە کاتانەدا ئەو کەسە لە بەر ئەوەی کە خۆی لە چەوسێنەرە خەیاڵییەکان بە بەهێزتر دەزانێت، هەندێ کردەوەی بێشەرمانە و دژی ئاکاری گشتیی کۆمەڵگا ئەنجام دەدات کە لە ئاکامدا خۆی لە نیعمەتی «ئازادیی» بێبەش دەکات. ئەم جۆرە شێتییەش وەکوو زۆرێک لە هۆکارەکانی تری شێتیی، هەڵقوڵاوی ئەو حەز و مەیلە زێدەڕۆیانەیە کە تەنانەت لە ناو ئەو کەسانەشدا دەبینرێت کە خۆیان بە کەسانی ئاسایی و سروشتیی لە قەڵەم دەدەن. من نامەوێ جۆرە پێشکەوتووەکانی ئەم نەخۆشییە تاوتوێ بکەم چوونکە ئەم پرسە کاری "دەروونناسان"ە و قسەکانی من کاریگەرییەکی ئەوتۆیان نابێت. مەبەستی من لێرەدا تاوتوێکردنی جۆرە ئاساییەکانی ئەم نەخۆشییەیە کە دەبێتە هۆی بەدبەختیی و لە هەمان کاتیشدا هێندە پێشکەوتوو نییە کە کەسی تووشبوو بە تەواوەتیی شێت بکات و هەر بۆیەشە کەسی نەخۆش دەتوانێت خۆی چارەسەر بکات - بە مەرجێک بتوانێت هۆکاری تووشبوونەکەی دەسنیشان بکات و بەو قەناعەتە بگات کە لە بوون(وجوود)ی خۆیدا بە دوایدا بگەڕێت و دەست نەکات بە دوژمنکاریی و دژایەتیکردنی خەیاڵییانەی کەسانی دیکە.

ژنان و پیاوانێکی زۆر دەناسین کە بە گوێرەی قسەکانی خۆیان هەمیشە کەوتوونەتە بەر ئەمەگنەناسیی و نامیهرەبانیی و خیانەت[ی کەسانی دەوروبەریان]ەوە. ئەم جۆرە کەسانە بە گشتیی کەسانێکی ئێسک سووک و خوێنشیرین و شیاوی بەزەیی پێداهاتنەوەن و تەنانەت

کەسانێکیش کە ئاشنایی و هاوڕێیەتییەکی ئەوتۆیان لەگەڵیاندا نییە دەتوانن بە ئاسانیی لێیان نزیک ببنەوە و هاوڕێیەتییان بکەن. دەبێ ئاماژە بەم خاڵەش بدەم کە سەرجەم ئەو بەسەرهاتانەی سەبارەت بە خۆیان و ژیانیان دەیانگێڕنەوە، لەوانەیە بە ڕاستیی ڕوویان دابێت و هەروەها ئەو ئەگەرەش هەیە کە ئەو ڕەفتارە خراپانەی کە دەرحەقیان کراوە، ڕاست بێت. بەڵام شتێک کە جێی گومانە ئەوەیە کە ژمارەی ئەو گلە و گازندانەی کە دەیانخەنە ڕوو، زۆر زۆرن؛ بە تایبەت زۆربەی گلە و گازندەکانیان پێوەندییان بە چەوساندنەوە کۆمەڵایەتییەکانەوە هەیە کە ناتوانرێت بخرێنە خانەی شتە کەسەکییەکانەوە.

ئەوە شتێکی زۆر سروشتییە ئەگەر تاکەکان لە کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکاندا بە درێژایی ژیانیان بەرەوڕووی چەندین ناکامیی و شکست بووبێتنەوە، بەڵام تەنها ئەم کەسانەن کە خۆیان بە بەرکەوتووانی نامیهرەبانیی دەزانن و پێیان وایە کەسی تر تووشی ئەم کێشەیە نەبووە.

ڕەهەندێکی تری پرسەکە ئەوەیە کەسێک هەیە کە بە ڕاستیی لە هەموو ڕوویەکەوە عەزیەت و ئازار دەدرێت، بەڵام تەنانەت دەبێ لەم جۆرە کاتانەشدا لە «بوون»ی کەسەکە خۆیدا بە دوای سەرچاوەی ئازارەکاندا بگەڕێین. بە واتایەکی دیکە ڕەگی عەزیت و ئازارەکان لە «بوون»ی خۆیەوە سەرچاوە دەگرن و دەبنە هۆی ئەوە کە کەسانی تر لە هەمبەریدا هەڵوێست وەربگرن. ئەم جۆرە کەسانە یان بە هۆی ئەو زەرەر و زیانە خەیاڵییانەی کە هەرگیزیش ڕوویان نەداوە، یان بە شێوەی ناخودئاگا هەندێک کردەوەیان لێ دەبێتەوە کە ڕق و تووڕەیی دیتران دەورووژێنن و ئەوانیش بەرپرچیان دەدەنەوە. لەم جۆرە کاتانەدا کەسانی کارامە و لێهاتوو تووشی کەسانی بە خەیاڵی خۆیان ستەملێکراو دەبن و زۆربەی جاریش خۆیان لە هاوسۆزیکردنیان دەدزنەوە و کەسی بە خەیاڵی خۆی ستەملێکراویش ئەوان وەک دوژمنی خۆی چاو لێ دەکات.

چارەسەرکردنی ئەم نەخۆشییە کارێکی زۆر سەختە، چوونکە ئەگەر هاوسۆزییان لەگەڵ بکرێت دەورووژێن و [دەبێتە هۆی هەڵچوونیان و] ئەگەریش دژایەتییان بکرێت هەر بە هەمان شێوە. کەسێک کە تووشی هەستی چەوساوەیی بووە، کاتێک باوەڕ بە بەسەرهاتی یەکێک لە ناکامییەکانی بهێنن، هێندە لقوپۆ بە بابەتەکە دەبەخشێت و هێندە بە دەوریدا دەسووڕێتەوە

کە دڵنیا بێت لەوەی کە توانیویەتی باوەڕ بە گوێگرانی بهێنێت و ئەگەریش باوەڕیان پێ نەهێنا، ئەوەش بە هۆکارێکی تری دڵڕەقیی مرۆڤ لە ئاست خۆی لە قەڵەم دەدات.

ئەم نەخۆشییە تەنها لە ڕێگەی دەرک و تێگەییشتن لە هۆکارەکانی چارەسەر دەکرێت. دەبێ ئەوە بە کەسی نەخۆش بسەلمێنرێت ئەو هەستی چەوساوەییە کە لای دروست بووە شتێکی نادروست و هەڵەیە و ئەگەر ئەم کارە سەرکەوتوو بوو، کەسی نەخۆش دەتوانێت بیر لە چارەسەرکردنی خۆی بکاتەوە.

لەم بەشەدا هەوڵ دەدەم هەندێ بیرۆکە و بۆچوونی سادە و ئاسایی بخەمە ڕوو، تا کەسانی تووشبوو بە هەستیی چەوساوەیی، بتوانن لە بوونی خۆیاندا توخمەکانی بناسن. چوونکە ئەو ژمارە زۆرە تووشبووانە ئەگەر سەرکەوتن بە دەست بهێنن، بە ناسینی هۆکارەکانی هەستی چەوساوەیی، هەوڵی سڕینەوەیان دەدەن و بە وتەی توێژەرەوان، بەختەوەر دەبن. بەڵام بە بوونی ئەو هەستە کە هەموو خەڵک دوژمنت بێت، بەدەستهێنانی بەختەوەریی شتێکی مەحاڵە.

یەکێک لە هۆکارەکانی هەستی چەوساوەیی، عادەتی ناڕەوا و ناپەسەندی غەیبەت و پشتەملە قسەکردنە. ئەگەر بە وردیی سەرنج بدەن، بۆتان دەردەکەوێت کە ژمارەیەکی ئێجگار کەمی خەڵک خۆیان لە قسەهەڵبەستن و دەنگۆسازیی بۆ خزم و هاوڕێکانیان دەپارێزن [بە واتایەکی دیکە زۆرینەی خەڵک خەریکی پڕوپاگەندە و دەنگۆ سازکردن و دەرهێنانی قسەی پڕوپووچن سەبارەت بە خزم و هاوڕێکانیان]. بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە هەر ئەم خەڵکە زۆرە کاتێک قسەیەک سەبارەت بە خۆیان دەبیستنەوە تووڕە دەبن و هەست بە ئازار دەکەن. واتای ئەو پەرچەکردارییەشیان ئەوەیە کە پێدەچێت چاوەڕێی وەڵامی قسە پڕوپووچەکانی خۆیان لە زاری خەڵکی ترەوە ناکەن. هەر ئەم پرسە سادەیە ئەگەر خەستتر ببێتەوە، دەگۆڕدرێت بە هەستی چەوساوەیی.

ئێمە چاوەڕێی ئەوە دەکەین خەڵک بە هەمان ڕێز و حورمەتەوە هەڵسوکەوتمان لەگەڵدا بکەن کە بەرانبەر بە خۆمان هەمانە، بەڵام ئاگامان لەم بابەتە نییە کە نابێ چاوەڕێی ئەوە بکەین ڕەفتار و هەڵسوکەوتی خەڵک باشتر لەوەی بێت کە ئێمە دەرحەق بەوانی ئەنجام دەدەین.

هۆی ئەم چاوەڕوانییەش پیاهەڵدانی شایستەییە نوێیەکانی بوونمانە - ئەو شایستەییانەی کە پێمان وایە بوونیان هەیە، لە کاتێکدا بوونیان نییە و کەسیش هەستیان پێ ناکات.

ئەوە لە کاتێکدایە کە پێوەری بەهای ڕاستەقینەی دیتران - ئەگەر بەهایەک لە ئارادا هەبێت - تەنها بە هۆی چاوپۆشیلێکردنەوە قابیلی بینینە. کاتێک ئێوە دەبیستن فلان کەس قسەیەکی نابەجێی سەبارەت بە ئێوە کردووە، ئەوەتان بە بیر دێتەوە کە چەندین جار ویستووتانە ڕەخنەیەکی بەجێ و دادپەروەرانەی لێ بگرن بەڵام پشتگوێتان خستووە؛ بەڵام ئەوە لە بیر دەکەن کە چەندین جاریش شتێکتان لە بارەی ئەوەوە دەربڕیوە کە پێتان وا بووە دروستە.

ئایا ئەمە پاداشی سەبر و تەحەمولەکەی ئێوەیە؟ بەڵێ، لە ڕوانگەی کەسی بەرامبەرەوە ڕەفتارەکەی ئێوە ڕێک وەکوو ڕەفتاری ئەو لەگەڵ ئێوەدا وایە. چوونکە ئەو، لەو پشتگوێخستنەی ئێوە بێخەبەرە و تەنها ئاگای لەو دوایین قسانەیە کە لە بارەی ئەوەوە دەرتان بڕیوە. ئەگەر ڕۆژێک بێت و بە هۆی هێزێکی سیحراوییەوە توانای خوێندنەوە و تێگەییشتنی بیر و ئەندێشەی کەسانی ترمان هەبێت، یەکەمین دەسکەوتی بەرچاوی [ئەو هێزە]، دەرکەوتنی پووچ و بێبنەمابوونی هاوڕێیەتییەکانە و، ڕەنگە دەسکەوتی دواتریش زۆر گرینگ بێت چوونکە ژیان بەبێ هاوڕێ، زۆر ئەستەمە و تەحەمول ناکرێت. کەواتە فێری ئەوە دەبین یەکترمان خۆش بوێت بەبێ ئەوەی کە پێویستمان بە دەمامکێکی فریودەر و هەڵخەڵەتێنەر هەبێت تا نوقسانیی و عەیبەکانمان داپۆشێت. ئێمە بیر لەوە ناکەینەوە کە هاوڕێکانمان نابێ هیچ نوقسانیی و کەموکوڕییەکیان هەبێت، ئێمە دەزانین کە هاوڕێکانمان هەندێک هەڵە و کەموکوڕییان هەیە، کەچی بەو حاڵەشەوە خۆشمان دەوێن، بەڵام پێمان ناخۆشە ئەوانیش هەر ئەم شێوازە سەبارەت بە ئێمە بگرنە بەر. ئێمە چاوەڕێی ئەوە دەکەین ئەوان بە پێچەوانەی هەموو تاکەکانی دیکە، وەک کەسانێکی بێ کەموکوڕیی چاومان لێ بکەن. کاتێک ناچار دەبین دان بە هەڵەکانماندا بنێین، پێدەچێت دەربڕینی حەقیقەت کارێکی زۆر ئەستەم بێت. نابێ هیچ کەسێک پێی وا بێت هیچ کەموکوڕییەک لە ڕەفتاریدا نییە و لەوەش دڵگران بێت کە هەموو کەسێک دەبێت ڕێگای کامڵبوون ببڕێت.

هەمیشە سەرچاوەی هەستکردن بە چەوساوەیی، بیرکردنەوەی لە ڕادەبەدەر و زێدەڕۆیانەیە سەبارەت بە شایستەیی و لێهاتوویی خۆمان. بۆ نموونە من لە بەر خۆمەوە دەڵێم شانۆنووسم.

هەموو تاکێکی بێ کینە و بە ویژدان دەبێ ئەوە بزانێت کە من گەورەترین و درەوشاوەترین شانۆنووسی سەردەمی خۆمم. بەڵام لە بەر چەند هۆکارێک، شانۆگەرییەکانی من کەمتر نمایش دەکەن و ئەگەریش نمایش بکرێن سەرکەوتنێکی ئەوتۆ بە دەست ناهێنن. ئایا هۆکاری ئەمە چییە؟ دیارە بەڕێوەبەرانی هۆڵی شانۆ و ئەکتەرەکان و ڕەخنەکارانی بواری هونەر یەکیان گرتووە و هۆکارەکەشی بۆ خۆم ڕوون و ئاشکرایە، چوونکە لە بەردەم گەورەپیاوانی شانۆدا کڕنۆشم نەبردووە و ماستاوم بۆ ڕەخنەکارە ئەدەبییەکان نەکردووە و بە شانوباڵمدا هەڵ نەداون. شانۆگەرییەکانی من سەبارەت بە پرسە ڕاستەقینەکانن و ئەو کەسانەش کە دەوستەویەخەی ئەو پرسانەن، پێیان ناخۆشە و هەر بۆیەشە شایستەیی و لێهاتوویی من بە نەناسراویی دەمێنێتەوە.

وەکوو نموونەیەکی دیکە، "داهێنکار"ێک[٧٢] لە بەر چاو بگرن کە کەس ئاوڕ لە داهێنانەکەی ناداتەوە. خاوەن کارخانەکان ڕێگایان لێ گرتووە؛ داهێنانەکەی ئەو پەسەند ناکەن و ژمارەیەکی کەمیش کە چاکسازیخواز و خوازیاری پێشکەوتنن، هەندێک داهێنانی تایبەتییان هەیە کە ڕێ لە چالاکیی ئەو بلیمەتانە دەگرن کە بە پشتبەستن بە هێز و توانای خۆیانەوە گەشەیان کردووە و شتێکی سەرسووڕهێنەریش کە لێرەدا هەیە ئەوەیە کە کۆمەڵگا گەشە سەندووەکان دەسنووسی تاکەکان ون دەکەن، یان بەبێ ئەوەی کە بیانخوێننەوە دەیانێرنەوە بۆیان و وەڵامێکی ڕێکوپێکیش بەو کەسانە نادەنەوە کە لە نزیکەوە سەردانیان دەکەن. ئایا ئەمە چۆن ڕوون دەکرێتەوە؟ دیارە یەککگرتنێکی تۆکمە لە نێوان کەسانێکدا کە هەمیشە خەریکی حەپەلووشکردنی بەرهەمی داهێنانی تاکەکانن لە ئارادایە و، کەسێکیش کە ئەندامی ئەم تاقمە نەبێت قسەکانی بە هەند وەرناگیردرێت.

لە لایەکی دیکەوە توشمان بە تووشی کەسێکەوە دەبێت کە گلەیی لە حەقیقەت هەیە بەڵام بە پێی ئەزموونە کەسەکییەکانی خۆی، گلەییەکەی دەگشتێنێت و بەو دەرەنجامە دەگات کە بەدبەختییەکەی، پێوەندییەکی تەواو و ڕاستەوخۆی بە پرسە گشتییەکانەوە هەیە. بۆ نموونە بۆی دەردەکەوێت لە ناو دەزگای نهێنیی دەوڵەتدا ڕیسواییەکی گەورە کەوتۆتەوە کە لە

٧٢ - موختەریع. ئەم وشەیەم بۆ ئەو داهێنەرانە داناوە کە لە بواری تەکنیکیی و پیشەسازیی و ئەلکترۆنیی و ئامێرە کارەباییەکاندا داهێنان دەکەن و، داهێنان لە بواری ئەدەب و هونەر و... ناگرێتەوە. و. ک.

بەرژەوەندیدا نییە ئاشکرای بکات. سەبارەت بە تێگەییشتنەکەی هیچ پڕوپاگەندەیەک ناکات و پێدەچێت تەنانەت کەسانی زۆر ڕۆشنبیریش ناتوانن ئەو ڕق و بێزارییەی کەم بکەنەوە کە ڕۆحی ئەویان داگیر کردووە. تا ئێرە ڕاستییەکان هەمان ئەو شتانەن کە خۆی باسیان دەکات، بەڵام نەبوونیی و بێبەشییەکان کاریگەرییەکی وەهایان لە سەری داناوە کە پێی وایە هەموو کەسە دەسەڵاتدارەکانی جیهان بە تێکڕا دەیانەوێت ئەو جینایەتانە کە بناغەی مەزنایەتیی و شانوشکۆی ئەوانی پێک هێناوە بشارنەوە و هیچ دەسەڵاتێکیش بەبێ بوونی جینایەت، بوونی نابێت.

چارەسەرکردنی ئەم نەخۆشانە زۆر ئەستەمە، چوونکە بەشێک لە بیرکردنەوەکانیان ڕاستەقینەیە و دیارە کاریگەریی شتە ڕاستەکانیش بە لایانەوە بۆ نموونە زۆر گرینگترە لەو پرسە گرینگانەی جیهان کە پێوەندیی ڕاستەوخۆیان بە کارەکەی ئەوەوە نییە. ئەم ڕەوتە دەبێتە هۆی ناهاوسەنگیی و ئەویش گرینگیی حەقیقەتەکان بە شێوەیەکی نایەکسان دەرک دەکات و؛ ئەو حەقیقەتانەی کە پێوەندییان بە خۆیەوە هەیە بە لاوە گرینگترە وەک لەوانەی بوونی ڕاستەقینەیان هەیە.

یەکێکی تر لە قوربانییەکانی هەستی چەوساوەیی کە ئەمڕۆکە تا ڕادەیەکی زۆر باوە، ئەو کەسە مرۆڤدۆستانەن کە سەرەڕای کەمتەرخەمیی و گوێنەدانی خەڵکانی دیکە، هەمیشە هەوڵ دەدەن خزمەتی خەڵک بکەن و، کە ئەوانیش ئەمەگنەناسانە بە خزمەتەکانیان نازانن، دڵگران و خەمبار دەبن. پاڵنەرەکانی ئێمە بۆ دڵسۆزیی و خزمەتکردنی خەڵک، ئەوەندەش کە خۆمان بیری لێ دەکەینەوە پاک و بێخەوش نین. حەزکردن بە دەسەڵات، نەخۆشییەکی پڕ لە نهێنییە کە لە چەندین شێوەی جۆراوجۆردا دەردەکەوێت و زۆربەی کات سەرچاوەی خۆشیی و چێژەکانی هەڵقوڵاوی دەسەڵاتخوازیی، ئەو کردەوە خێرخوازانەن کە دەرحەق بە کەسانی تر ئەنجامیان دەدەین. هەندێ جار هۆکارێکی دیکەش دەور دەبینێت و خزمەت و دڵسۆزییەکانی ئێمە دەرحەق بە کەسانی تر، لە شێوەی لۆمەکردنیان بۆ کردەوەگەلی نادروستی وەک مەشرووبخواردنەوە و قومار و سووکەسەرییدا خۆی دەنوێنێت. ئەوان لە هەلومەرجێکدا ڕێ لەو کردەوە خراپانە دەگرن کە خۆیان گیرۆدەی ئەو شتانە نین؛ بۆ نموونە کەسانێک کە لە پەرلەماندا لە دژی جگەرەکێشان دەنگ دەدەن، بێگومان خۆیان جگەرە ناکێشن. بەڵام بێگومان

ئەگەر ئەوان چاوەڕێ بن کەسانی جگەرەکێش بە کۆمەڵ بێنە لایان و لە بەر خاتری ئەوەی کە هەوڵی ڕزگارکردنیان لە عادەتی قێزەون و ناشیرینی جگەرەکێشان دەدەن، سوپاسیان لێ بکەن، بێگومان تووشی نائومێدیی و بێهیوایی دەبن. ئەوان پێیان وایە خۆیان بۆ خزمەتکردنی کۆمەڵگا تەرخان کردووە و ئەگەر بەو کار و خزمەتانەیان نەزانرێت و سوپاسیان نەکرێت، [لە ڕاستییدا] ڕێز لە فیداکارییەکانیان نەگیراوە و بە گشتیی خەڵکی ئەو کۆمەڵگایە کەسانێکی سپڵە و ئەمەگنەناسن.

سالانی پێشووتر خانمەکانی ماڵەوە ئەم جۆرە ڕەفتارانەیان دەرحەق بە خزمەتکارەکانیان ئەنجام دەدا. ئەوان خۆیان بە بەرپرسی خەسڵەتە پەسەندەکانی خزمەتکارەکانیان دەزانی، بەلام لەم سەردەمەی ئێمەدا پرسی خزمەتکارەکان هێندە ئاڵۆز بۆتەوە کە نواندنی ئەم جۆرە میهرەبانییانە دەرحەقیان زۆر کەمترە.

شتی لەم جۆرە لە ڕیزەکانی سەرەوەی سیاسەتیشدا ڕوو دەدات. سیاسەتمەدارێک کە جڵەوی دەسەلاتی بە دەستەوە گرتووە و لە پێناوی ڕاپەڕاندنی ئەرکە نەتەوەیی و ئابڕوومەندانەکانی خۆیدا، وازی لە هەموو خۆشیی و ئاسوودەییەک هێناوە و لە بواری سیاسەتدا سەرکەوتوو دەبێت، کاتێک خەڵک دژایەتیی دەکەن و ڕێز لە کارەکانی ناگرن، تووشی سەرسووڕمان و خەمباریی دەبێت.

ئەو لە لای خۆیەوە پێی وایە کارەکانی لە بەرژەوەندیی و قازانجی کۆمەڵگادان و ئەوەش لە کاتێکدایە کە چێژی فەرمانڕەوایی، زیاتر لە هەموو هۆکارێکی دیکە پاڵنەری کار و چالاکییەکانێتی. لێدوانە پێشکەشکراوە ئاساییەکانی ناو هۆڵ یان ڕۆژنامە گشتیی و حیزبییەکان، هێدی هێدی بە بەرچاویدا ڕەنگی ڕاستیی بە خۆوە دەگرن و لە جیاتیی ئەوەی کە قسە پڕ باقوبریقە حیزبییەکان بە وردیی لێک بداتەوە و شیکردنەوەیان لە سەر بکات، بە پاڵنەری چالاکییەکانی خۆیی لە قەڵەم دەدات. کە گەییشتە ئەم قۆناغە، تووشی ڕق و کینە و بێزاریی دەبێت و دەکەوێتە داوی بیر و خەیاڵە پڕوپووچەکانی خۆیەوە. وە ڕێک لەو کاتەدایە کە دنیا پشتی تێ دەکات و ئەویش گۆشەگیریی هەڵدەبژێرێت و داخی ئەوە دەخوات کە بۆچی وە دوای کار و خزمەتێکی بێهوودە کەوتووە کە کەس پێی نازانێت و ڕێزی لێ ناگرێت.

ئەم نموونانە چوار ڕێسای گشتیمان دەخەنە بەر دەست کە ئەگەر بە تەواوەتیی دەرک بە ناوەڕۆک و ناواخنیان بکرێت، ڕێ لە سەرهەڵدان یان لانیکەم گەشەسەندنی هەستی چەوساوەیی دەگرن.

١) ئەوەتان لە بیر بێت پاڵنەرەکانی ئێوە، هەمیشە بەو ڕادەیەش کە خۆتان بیریان لێ دەکەنەوە، مرۆڤدۆستانە نین.

٢) سەبارەت بە شایستەیی و لێهاتوویی خۆتان زیاتر لەوەی کە هەن، زێدەڕۆیی مەکەن.

٣) ئاستی چاوەڕوانیی و حەزی خەڵک بەرامبەر بە خۆتان و ئاستی حەز و خۆشەویستیی خۆتان بەرامبەر بە خەڵک هاوسەنگ بکەن و بیانخەنە یەک ئاستەوە.

٤) پێتان وا نەبێت خەڵک هەمیشە بیر لە عەزیەت و ئازاردانی ئێوە دەکەنەوە.

لێرەدا هەوڵ دەدەین سەبارەت بە هەر کام لەو ئامۆژگارییانەی سەرەوە هەندێ ڕوونکردنەوە بکەین.

گومانکردنی تاک لە جەوهەری کار و چالاکییەکانی خۆی، بە تایبەت بۆ کەسانی مرۆڤدۆست و هەروەها دەسەڵاتداران زۆر پێویستە. هەندێ جار زانیارییەکانی ئەوان سەبارەت بە چۆنیەتیی بارودۆخی جیهان یان بەشێکی جیهان ڕاستن و هەندێ جاریش هەڵەن و پێویست ناکات هەموو بیر و باوەڕ و بۆچوونەکانی خۆیان بۆ مەبەستی خێرخوازیی و خزمەتکردنی کۆمەڵگا مرۆییەکان بە دروست بزانن. بە هەر حاڵ ئەوان دەبێ ئەم ڕاستییە بزانن کەسانی سوودمەند لە کار و چالاکییەکانی ئەوان، لە دەربڕینی بیر و باوەڕ و هەڵبژاردنی جۆری ژیانیاندا ئازادن. فڵان دەسەڵاتدار دڵنیایە لەوەی کە بیر و بۆچوونەکەی خۆی تەواو دروستە و هەموو بۆچوونەکانی تر هەڵەن. بەڵام تەنانەت ئەگەر بۆچوونەکانیشی دروست بن، بە واتای لەسەر حەقبوونی ئەو نییە. زۆربەی کات چێژ و خۆشیی گۆڕانکارییە دڵخوازەکانی، بە هۆی بۆچوونەکانییەوە دەشاردرێنەوە [پەردەیەکیان بە سەردا دەکێشرێت]، چوونکە هەستی دەسەڵاتخوازیی خۆی لە خۆیدا لووتبەرزیی و خۆپەرستییشی تێکەڵە و، [ هەر ئەم لووتبەرزیی و خۆ پەرستییەش] لەم جۆرە کاتانەدا وەک هۆکارێکی کاریگەر دەور دەبینێت. ئەو ڕۆشنبیرە خەیاڵاوییانە کە خۆیان بۆ ئەندامێتیی پەرلەمان دەپاڵێون [لێرەدا باس لە ئەزموونە

کەسەکییەکانی خۆم دەکەم][73] پێیان وایە دەنگدەران دەبێ ڕەشبینیی و گومانکاریی بخەنە لاوە و تەنها و تەنها دەبێ بیر لەوە بکەنەوە کە دەنگ بەوان بدەن و ئارەزووی بە ئەندامبوونی پەرلەمانیان بۆ بەدی بێنن. بەڵام کاتێک ململانێی هەڵبژاردن کۆتایی دێت و دەرفەتی پێویستیان بۆ بیرکردنەوە لە بەردەمدایە، تازە لەوە تێ دەگەن کە حەق بە دەنگدەرە ڕەشبین و گومانکارەکان بووە. ڕووکردنە وەهم و خەیاڵ، بیرۆکە سادە و ساکارەکان دەگۆڕێت بە بیرۆکەگەلی سەیر و سەمەرە و هەر بۆیە بوونی تۆزقاڵێک گومانکاریی بۆ سیاسەتوانەکان پێویستە، تا ڕێ لە وەهم و خەیاڵ بگرن و بتوانن کسانێکی واقعبین بن.

ئەوەشمان لە بیر نەچێت کردەوە مرۆڤدۆستانەکان بە پێی بنەما کۆنە ئاکارییەکان، بەهایەکی هێندە بەرز و باڵایان هەبووە کە مرۆڤی ئەمڕۆ بە ناچار هاوسەنگیی (=دەسکاریی) تێدا کردوون. لە ڕابردوودا کردەوەگەلی مرۆڤدۆستانە پێویستی بە لەخۆبوردوویی هەبووە و کەسانی مرۆڤدۆستیش بە ڕاستیی ئامادەیی لەخۆبوردووییان هەبووە، بەڵام ئەمڕۆ بە هۆی بارودۆخی تایبەتیی ئەم سەردەمەوە، لەخۆبوردوویی کارێکی ئەستەمە. ئەمڕۆ هەموو کار و کردەوەکانی خەڵک تەنانەت ئەوانەش کە زۆر دەوڵەمەندن لە پێناوی پاراستنی بەرژەوەندییە کەسەکییەکاندایە، چوونکە بە داخەوە ئەگەر ئاوا نەبێت، [زاوزێکردن و] وەچەخستنەوە و تەنانەت درێژەدان بە ژیان مەحاڵ دەبێت. کەسێک کە کاتی خۆی بە تەماشاکردنی نانخواردنی دیتران بە فیڕۆ دەدات، نابێ چاوەڕێی تێربوون بکات؛ تەنانەت ئەگەر بە هۆی مرۆڤدۆستیی و لە خۆبوردووییەوە چێژ لە نانخواردنی دیتران وەربگرێت، دیسانەوە سوودی نابێت و سەرەنجام لە برسان دەمرێت. کەسی مرۆڤدۆستی بەرباسی ئێمە، دەبێ لانیکەم بۆ نەهێشتنی برسێتیی، خواردن بخوات تا بتوانێت لە دژی نادادپەروەرییەکان هەنگاو هەڵبگرێت. دیارە ئەگەر وەکوو پێویست خواردن نەخوات، هێز و وزەی پێویستیشی بۆ بەرەنگاربوونەوەی زوڵم و نادادپەروەریی نابێت و لە لایەکی تریشەوە خواردنی ناجۆر و نەگونجاو، ئارەزووی خواردنی نابزوێنێت تا بتوانێت وزەی پێویست کۆ بکاتەوە؛ کەواتە ئەم ئینسانە مرۆڤدۆستە، بۆ چێژوەرگرتنی خۆیەتی کە خواردن دەخوات چوونکە ئەگەر خواردنی

---

٧٣ - ئەم ڕستەیە، هی بێرتراند ڕاسڵ خۆیەتی. و. ک.

بێتام و وزەنابەخش بخوات، ناتوانێت درێژە بە لایەنە چێژبەخشەکانی بەرەنگاربوونەوەی زوڵم و نادادپەروەرییەکان بدات و چێژی ڕاستەقینە وەربگرێت. کەواتە ئێوەش چاوەڕێی ئەوە ناکەن کە ئینسانی مرۆڤدۆستی بەرباسی ئێمە، لە کاتی خواردندا بیر لە چاکەکاریی و خێری ئەم دنیایە و هەروەها خێر و پاداشتی ڕۆژی پەسڵان بکاتەوە و تێر ببێت.

جیا لەو نموونەیەی سەرەوە، دەبێ ئەم ڕاستییەش بزانن کە تەنها کاتێک کردەوەکانی ئێمە دەتوانن تەواو و کامڵ و بە دڵی خۆمان بن کە بە حەز و ویستی خۆمان پراکتیزە بکرێن و حەز و ویستیش هەرگیز بەبێ پاڵنەری خۆویستیی نابێت.

خۆویستییش چەندین پلەی هەیە کە دەبێ گرینگیی پێ بدرێت. خۆویستیی مرۆڤدۆستانە لە پاراستن(یان پارێزگاری لێکردن)ی جەوهەری «خود» سەرچاوە دەگرێت، بۆ نموونە پاڵنەری خۆویستانەی پاراستنی ژن و منداڵ و بەرگریکردن لە مافەکانیان، یەکێکە لە سیفەتە جەوهەرییەکانی مرۆڤ و، لە ڕووی ئاکارییشەوە ناتوانرێت ڕەخنەی لێ بگیردرێت.

ئەگەر کەسێک ئەمڕۆ بانگەشەی ئەوە بکات کە من هێندە کەسێکی لەخۆبوردووم کە ئەگەر تەنانەت زوڵم و ستەم لە ئەندامانی بنەماڵەکەم بکرێت، گرینگیی بە پاراستنیان نادەم، نەک تەنها کارێکی شیاو و شایستەی ئەنجام نەداوە بەڵکوو کەسێکی کەمتەرخەمە بە بەرانبەر پرسە ئاکارییەکان. ئەوەش لە کاتێکدایە خۆی پێی وایە دەبێ شانازیی بەو سیفەتەیەوە بکات. ئەم جۆرە لەخۆبوردوویيە خۆ فریودانە، چوونکە کەسێکی ئاوا بە مەبەستی خۆ دزینەوە لە بەرپرسیارێتیی پاراستنی ئەندامانی بنەماڵەکەی خۆی و نەبوونی توانای بەرگریکردن، [بە خەیاڵی خۆی] خۆی بە کەسێکی لێبووردە لە قەڵەم دەدات. شانۆنووسێک کە نووسینەکانی لە لایەن خەڵکەوە ئاوڕیان لێ نادرێتەوە و گرینگییان پێ نادرێت، نابێ بە وتنی ئەم قسەیە کە پیلانیان لە دژی گێڕاوە، خۆی لە داهێنانی کاری گەورەتر و باشتر بدزێتەوە؛ ئەو دەبێ وەک فەیلەسووفێکی ژیر، کەموکورتیی کارەکانی بدۆزێتەوە و چارەسەری بکات و بە بیانووی ئەوە کە خەڵک گوێ بە نووسینەکانی نادەن، خۆی لە درێژەدان بە کارەکانی نەدزێتەوە.

ئەڵبەتە لە ناو مێژوودا هەمیشە بەهاگەلی نەناسراو یان درەنگ ناسراو هەبووە، بەڵام ژمارەیان بە بەراورد لەگەڵ بەها شایستەکاندا زۆر کەمە. کەسێک کە خاوەنی زەوق و سەلیقەیەکە و سەرەڕای چاوەڕوانییەکانی ڕێزی لێ ناگیردرێت، دەبێ بە هەموو

ئەمەگنەناسییەکانیشەوە هەوڵی گەییشتن بە ئامانجە باڵاکانی بدات. چوونکە ئەگەر ئاوا نەکات، دیارە کەسێکی لەخۆباییییە و کەواتە نابێ چاوەڕێی سەرنج و ئاوڕدانەوەی خەڵک لە کارەکانی بکات.

لێرەدا تەنها یەک ئاوارتە هەیە و ئەویش بلیمەتیی و داهێنانی «شاکار»ە و، دەبێ بڵێین کە شت [یان کەسی] ئاوارتە ئەم ڕێسایە نایگرێتەوە. ئەگەر خەڵک لە کار [یان داهێنانی]ی بلیمەتێک کە چەندین سەدە لەوانەوە دوورە، تێ نەگەییشتن، ئەوە شتێکی ئاوارتەیە و دەتوانرێت لە بەر خاتری بلیمەتیی داهێنەرەکەی تەحەمول بکرێت. لە دۆخێکی ئاوادا دەتوانرێت سەد ساڵ پاش مردنی، بوترێت ئایا حەق بە ئەو بووە یان بە خەڵک، کە لەم حاڵەتەشدا نە قازانجی بۆ ئێوە هەیە و نە بۆ خەڵک.

بۆ ناسین و شیکردنەوە و توێژینەوەی خۆمان با گوێ لەم پرسیار و وەڵامەی خوارەوە بگرین:

ئایا پاڵنەری ئێوە بۆ داهێنانی بەرهەمێک، حەزی لە ڕادەبەدەرتانە بۆ دەربڕینی بیر و بۆچوون و باوەڕەکانتان، یان پەسن و پیاهەڵدان لە لایەن خەڵکەوە هانتان دەدات؟

وەڵامی ئەم پرسیارە لە ڕوانگەی هونەرمەندێکی ڕاستەقینەوە، هەر چەند بێگومان حەزیشی لەوە هەیە خەڵک پیایدا هەڵ بڵێن، بەڵام دەربڕینی بیر و باوەڕ گرینگیی زیاتری هەیە. چوونکە هونەرمەندێکی ڕاستەقینە کاتێک کەمترین ئاوڕیش لە بەرهەمەکەی نەدرێتەوە، بە هۆی باوەڕێک کە بە کارەکەی خۆی هەیەتی، شێوازی خۆی ناگۆڕێت. بەڵام کەسێک کە بۆ پەسن و پیاهەڵدان لە لایەن خەڵکەوە کار دەکات، ئەو هێزە دەروونییە پێویستانەی نییە کە بۆ داهێنانی بەرهەمەکەی پاڵی پێوە بنێن. کاتێک هیچ گوشارێک بۆ داهێنانی بەرهەمێک لە ئارادا نەبێت هیچ بەرهەمێکیش ناخولقێنرێت و کاتێک هیچ بەرهەمێک نەخولقێت هیچ پەسن و پیاهەڵدانێکیش لە گۆڕێدا نییە. هونەرمەندێک کە بە تەنها بۆ چەپڵەکانی خەڵک کار دەکات، لە چوارچێوەی ڕێسایەکدا ڕێگە دەپێوێت کە لای خەڵک ناسراو بێت و ئەگەر لەو بوارەدا توانای پێویستی نەبێت، بەرهەمێک پێشکەش دەکات کە گرینگییەکی ئەوتۆی پێ نادرێت. بەڵام هونەرمەندی ڕاستەقینە بیر و باوەڕەکانی لە چوارچێوەیەکدا دادەڕێژێت کە خەڵک شیاوی وەرگرتنیان بن و دیارە بایەخیشیان پێ دەدرێت.

ئەگەر هونەرمەندێک پێی وا بێت خەڵک شایستەی تێگەییشتنی بەرهەمەکانی ئەو نین، بە هەڵەدا چووە چوونکە لە ڕاستییدا ئەگەر بەرهەمێک بەهێز و ڕەسەن بێت، پێویستی بە تێگەییشتن و پەسن و پیاهەڵدانی خەڵک نییە و ئەگەریش هونەرمەند پێویستی بە پەسندانەوە لە لایەن خەڵکەوە هەبێت، دیارە کارێکی وای پێشکەش کردووە کە خەڵک بە باڵایدا هەڵ بڵێن کە لەم حاڵەتەشدا دیسانەوە حەق بە خەڵکە. هیچ پیلانگێڕییەک بۆ هیچ کەسێک لە گۆڕێدا نییە و ئەگەریش هەبێت، لە ئاستێکی زۆر بچووکدایە و شتێکی گشتیی نییە. ئێمە دەتوانین چەند کەسێک هەڵ خەڵەتێنین و لە دژی بابەتێکی دیاریکراو هانیان بدەین، بەڵام ئەگەر بابەتەکە ڕەسەن بێت، لە بەردەم ئەو ژمارە کەمەدا خۆڕاگریی دەکات.

کەواتە دەتوانین لە ڕستەیەکی کورتدا بەم دەرەنجامە بگەین کە نابێ نەتوانینی خۆمان بخەینە ئەستۆی تێنەگەییشتنی کەسانی تر و، ئەگەر هات و ڕێزیان لێ نەگرتین، هەست بە چەوساوەیی بکەین.

با سەبارەت بە لێبووردن و چاوەڕێکردنی دوولایەنە[٧٤] نموونەیەک بێنینەوە.

لە ڕابردوودا ژنانی پیر و کەلەلا پێیان وا بوو دەبێ یەکێک لە کچەکانیان ئەرکی بەخێوکردن و ڕاپەڕاندنی کارەکانی بگرێتە ئەستۆ و تەنانەت دەبێ بە مەبەستی ئەم کارە، واز لە مێردکردنیش بێنێت. دایکە زەحمەتی زۆری بۆ کچەکەی کێشاوە، بەڵام ئێستا کە پێویستی بە [یارمەتیی] کچەکەی هەیە، ئایا ئەمە خۆپەرستیی نییە کە چوونکە زەحمەتی لە پێناوی کچەکەیدا کێشاوە، داوای هەموو ژیانی کچەکەی بکات؟

ئێوە تا زیاتر چاکە لەگەڵ کەسانی دەوروبەرتان بە تایبەت خزمانی نزیکتان بکەن، ئەوانیش چاوەڕێی زیاترتان لێ دەکەن، بەڵام لە هەموو هەلومەرجێکدا دەبێ لە ئاستێکدا چاوەڕوانی کار یان شتێک لە کەسێک بکەین کە ئەقڵ و ئاوەز وەری بگرێت [واتە لە ئاستێکی ئاقڵانە و ئاوەزمەندانەدا بێت]. چوونکە ئەگەر چاوەڕوانییەکەمان زیاتر لە ئاستی پێویست بێت و قابیلی جێبەجێکردن نەبێت، لەو کاتەدا هەست بە چەوساوەیی دەکەین.

---

٧٤ - تەوەقوعی دوو لایەنە

ئەگەر دایکێک چاوەڕێی ئەوە دەکات کچەکەی بەخێوی بکات و کارەکانی بۆ ڕاپەڕێنێت و ئەو کچە گەنجەش زیاتر بایەخ بە ژیانی کەسەکیی خۆی بدات وەک لەوەی بایەخ بە دایکی بدات، نابێ دایکەکە پێی وا بێت کچەکەی، ژیانی ئەوی بە لاوە گرینگ نییە و [لە ئەنجامی ئەوەشدا] هەست بە چەوساوەیی بکات. کچەکە درێژە بە ژیانی خۆی دەدات و لە هەمان کاتدا دایکیشی بە لایەوە گرینگە. ئەگەر دایکەکە پێی وا بێت دەبێ هێندە بە لای کچەکەیەوە ئازیز و خۆشەویست بێت کە هەموو ژیانی خۆی بۆ تەرخان بکات، دیارە چاوەڕوانییەکی خۆپەرستانەیە و وا باشترە کچەکەش هەرگیز مل بەو داواکارییە نەدات؛ لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر هات و کەسێک لە کاتێکی ئاوهادا وازی لە دایکی خۆی هێنا، بە هیچ شێوەیەک نابێ لۆمە و سەرزەنشت بکرێت. زۆربەی ئەو گلە و گازندانەی کە خەڵک لە کەسانی تریان هەیە، ئەوەیە کە ئەو کەسانە ئاستی داواکاریی و چاوەڕوانییەکانیان زۆر زۆر لە سەرەوەیە و، خۆپەرستییان لە ئاستی پێویستی تێی پەڕاندووە. چوارەمین ڕێسایەک کە باسمان لێوە کرد، بریتییە لە تێگەییشتنی ئەو حەقیقەتە کە دیتران زۆر کەمتر لە خۆتان بیر لە ئێوە دەکەنەوە.

تاکی بێئەقڵی گەمژەی تووشبوو بە هەستی چەوساوەیی، پێی وایە هەموو خەڵکی دنیا شەو و ڕۆژ بیر لەوە دەکەنەوە کە زیانی پێ بگەینن. لە کاتێکدا هەر کەسەو سەرقاڵی کێشە و گرفتەکانی خۆیەتی و کەس کاری بە «شێت»ێکی ئاواوە نییە. تاکی تووشبوو بە هەستی چەوساوەیی، لە هەموو جووڵە و ئاماژەیەکی خەڵکدا، شتێک سەبارەت بە خۆی بەدیی دەکات کە لە ڕاستییدا بە هیچ شێوەیەک بوونی نییە. ئەڵبەتە ئەم باوەڕە تا ڕادەیەک کاریگەریی لە سەر دامرکاندنی خۆپەرستیی و خۆبایییەکەیدا هەیە و جۆرە سووکنایییەکی پێ دەبەخشێت. ڕەنگە ئەم ڕێسایە تاکە گرینگ و پلەبەرزەکان بگرێتەوە کە بابەتی باسەکەی ئێمە نییە؛ بەڵام سەبارەت بە تاکێکی ئاسایی کە شایستەیی تەواوی نییە و لە هەمان کاتدا پێی وایە خەڵک بەردەوام بیری لێ دەکەنەوە، دەبێ بڵێین کە پێی ناوەتە جادەی شێتیی و خۆپەرستییەوە. بۆ نموونە وای دابنێن لە میوانداریی ئێوارە خوانێکدا قسە دەکەن و وێنەی چەند وتەبێژتان بینیوە کە لە ڕۆژنامەکاندا چاپ کراون و وێنەی ئێوەی تێدا نییە. ڕەنگە پرسیار لە خۆتان بکەن بۆچی وێنەی ئێوەیان تێدا نییە؟ دیارە هۆی ئەم کارە، جیاوازیی خەستوخۆڵی وتەبێژەکانی دیکە لە توانای وتەبێژییدا نەبووە. ئەو وتەبێژانەی کە وێنەیان چاپ دەکرێت، لە

میوانییەکی تایبەتیی(خسووسیی)دا لێدوانیان پێشکەش نەکردووە و ئەگەریش وا بوویێت، کارێکی باشیان نەکردووە و کەواتە نابێ ئێوەش چاوەڕێ بکەن ئەو کارە هەڵەیە بۆ ئێوەش دووپاتە بکرێتەوە. ئەگەر ئێوە گرینگیی زۆر بە چاپی وێنەی خۆتان بدەن، کەسێکی لەخۆبایی و خۆپەرستن و ئەم خۆپەرستییەش بە هیچ شێوەیەک بەختەوەریی ڕاستەقینەی بە دواوە نابێت. لە قووڵایی بیر و ئەندێشەکانی خۆتاندا لەوە تێ دەگەن کە ڕاستییەکان بە شێوەیەکی دیکەن و لە پێناوی شاردنەوەشیاندا ناچارن هەندێ گریمانە و بیرۆکەی باوەڕپێنەکراو و بێمانا دابهێنن. لەم جۆرە کاتانەدا ئێوە وا هەست دەکەن بەرەوڕووی پیلانگێڕیی و دوژمنکارییەکی گشتلایەنە بوونەتەوە و ئەم هەستە ئازاراوییەتان لە لا دروست دەبێت کە لەگەڵ هەموو دنیادا دوژمنایەتیتان هەیە. هیچ دڵکاویی و ڕەزامەندییەک کە لە سەر خۆپەرستیی و لەخۆباییبوون بنیات نرابێت، هەتاهەتایی نییە و دەبێ هزرمان بەم شتە ڕاهاتبێت کە بتوانین بەرەنگاری تەنانەت حەقیقەتە تاڵەکانیش ببینەوە و عادەتیان پێ بکەین و هەوڵ بدەین ژیانمان لەگەڵ یاسا و ڕێساگەلی ئاقڵانە و لۆژیکییدا بگونجێنین و بەها ڕاستەقینەکان گرینگترین شت بن بە لامانەوە.

**٩**

## ترس لە ڕای گشتیی

کەسانێک کە هەست بە بەختەوەریی دەکەن بە بەراورد لەگەڵ کەسانێک کە گیرۆدەی هەستی ناکامیین، زۆر کەمن. ئەم ژمارە کەمە لە بەر ئەوە هەست بە بەختەوەریی دەکەن کە شێوەی ژیان، جۆری بیرکردنەوە و جۆری مامەڵەکردنیان لەگەڵ دابونەریتە کۆمەڵایەتییەکاندا، بە دڵی کەسانی دەوروبەر و بە تایبەت هاوسەرەکەیانە.

یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگا نوێیەکان، دابەشبوونی خەڵکە بۆ چەندین گرووپ[٧٥] و دەستەی جیاواز. ئەم گرووپانە لە ڕووی ڕەچاوکردنی بیروباوەڕ و بنەما ئاکارییەکانەوە جیاوازییان لەگەڵ یەکدیدا هەیە. ئەم دۆخە بە دەسپێکردنی بزاڤی ڕیفۆرمی ئاینیی[٧٦] (بزاڤی ئاینیی سەدەی شانزەهەمی زاینیی کە چاکسازیی کڵێسەیی لێ کەوتەوە) و بە گشتیی بە دەسپێکردنی نوێخوازیی (ڕێنسانس)[٧٧] دەستی پێ کرد و ڕێگای کامڵبوونی بڕی.

لە ڕابردوودا پڕۆتستانەکان و کاتۆلیکەکان، نەک تەنها لە ڕووی خواناسییەوە بەڵکوو لە سەر زۆرێک لە ڕێسا چارەنووسسازەکانی ژیان ناکۆکییان لەگەڵ یەکدیدا هەبوو و جیاواز بیریان دەکردەوە. ڕەفتار و هەڵسوکەوتی ناشیرینی چینی ئەریستۆکرات[٧٨] و دەوڵەمەندی کۆمەڵگا، بۆ چینی مامناوەندیی[٧٩] کۆمەڵگا تەحەمول نەدەکرا و ئازاریان دەبینی. بێجگە

---

٧٥ - لێرەدا مەبەست لە گرووپ، دەستە و گرووپە ئایینییەکانە. و. ک.

٧٦ - The Reformation؛ بزاڤی ئایینیی سەدەی شانزەهەمی ئایینیی بۆ چاکسازییکردن لە کڵێسەدا.

٧٧ - Renaissance؛ قۆناغی دەسپێکردنەوەی چالاکیی لە لقە جۆراوجۆرەکاندا.

٧٨ - Aristocrat؛ لایەنگرانی حکوومەتی دەوڵەمەندان.

٧٩ - Bourgeoisie؛ چینی کاسپکار و دوکاندار.

لەوەش، بوونی کەسانێک کە هیچ بایەخێکیان بە پرسە ئایینییەکان نەدەدا[٨٠] و ڕەچاوکردنی دابونەریت و ڕێوڕەسمە ئایینییەکانیان[٨١] بە پاڵپشتیکەری سەردەمانێک دەزانی کە ئایا هەبێت یان نەبێت[٨٢]، زیاتر پەرەی بەم دووبەرەکیی و جیاییە دەدا.

ئێستا ئێمە پێمان ناوەتە سەردەمێکەوە کە لە سەرانسەری کیشوەری ئەورووپادا نەک تەنها لە دنیای سیاسەتدا بەڵکوو لە هەموو ڕەهەندەکانی ژیاندا دووبەرەکیی و جیاییەکی قووڵ کەوتۆتە نێوان سۆسیالیستەکان و لایەنگرانی سەرمایەدارییەوە. بیروڕاکانی هەر دوو لا، بە هیچ شێوەیەک یەک ناگرنەوە و دژی یەکدین. لە وڵاتە ئینگلیزیی زمانەکاندا جیاوازیی بیروباوەڕ هێندە زۆرە کە بە ڕاستیی ناتوانین لەم دەرفەتە کورتەدا باسی لێ بکەین.

هەندێک کەس ستایشی هونەر دەکەن و هەندێکی تر هونەری نوێ بە دەرەنجامی کردەوەگەلی ناشایست و فریودەرانەی شەیتان دەزانن. هەندێک فیداکاریی لە پێناوی بەرزبوونەوەی ئیمپراتۆرییەتی "بەریتانیا"دا بە کارێکی مەزن و پڕ لە شانازیی دەزانن و ژمارەیەکیش وەک گەمژەییەکی تەواو چاوی لێ دەکەن. لایەنگرانی دابونەریتە کۆنەکان، زیناکاریی (=سێکسی ناڕەوا) بە هەر شێوەیەک بێت بە جینایەتێک لە قەڵەم دەدەن بە هیچ شێوەیەک لێخۆشبوونی نییە؛ لە کاتێکدا گرووپەکانی دیکە ئەگەرچی بە ڕاشکاوانەش داکۆکیی لێ نەکەن بەڵام پاساوی بۆ دێننەوە و پاڵپشتیی لێ دەکەن. لە ناو کاتۆلیکاندا تەڵاق (جیابوونەوە) کارێکی ڕێپێنەدراوە، بەڵام لە ناو گرووپەکانی دیکەدا وەک سووکناییبەخش و چارەسەرکەری کێشە و گرفتەکانی ژیانی ژن و مێردایەتیی چاوی لێ دەکرێت. هەر لە بەر خاتری ئەم کێشە و گرفت و جیاوازییانەیە کە ڕەنگە مرۆڤێک لە کۆمەڵگایەکدا خۆی وەک کەسێکی بەدبەخت ببینێتەوە، لە کاتێکدا هەمان ئەو مرۆڤە بە هەمان ئەو ڕەفتارەوە، لای گرووپەکانی دیکە بە مرۆڤێکی ئاسایی لە قەڵەم بدرێت.

---

٨٠ - Tatiludinarian؛ جودابیر - بیر ئازاد - بیر سەربەست (لە پرسە ئایینییەکاندا).

٨١ - Free thinker ؛ کەسێک کە خاوەنی بیری سەربەست و ئازادە و کاری بە کاری ئایینەوە نییە .

٨٢ - مەبەست ڕۆژی پەسلان و باوەڕمەندیی بەو ڕۆژەیە. و. ک.

دەرنجامی ئەم جیاوازییانە لە کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکاندا هەستکردن بە بەدبەختییە، ئەویش لە ئاستێکی زۆر بەرز و نیگەرانکەردا و، کاریگەریی ئەم هەستەش بە تایبەتیی لە سەر گەنجەکان زیاترە.

ئەم جیاوازییەش بەم شێوەیە دەور دەبینێت کە ژن یان پیاوێکی گەنج فێری باوەڕە باوەکانی ناو کۆمەڵگا دەبێت و پاش ملدان بەم باوەڕانە، لەوە تێ دەگات کە هەمان ئەو باوەڕانە لە لایەن کۆمەڵگاکەی خۆیەوە دانیان پێدا نانرێت و ڕەت دەکرێنەوە. لە ڕوانگەی گەنجەکانەوە ئەو شوێنەی کە تێیدا دەژین، دەتوانێت نموونەیەک بێت لەو دنیا گەورەیە و دیارە بارودۆخی ناوچەکەی خۆی چۆنە، بارودۆخی دنیاش ئاوایە. بۆ نموونە گەنجێک ئەوەی پێ قبووڵ ناکرێت کە دەتوانێت لە شوێنێکی ئەم دنیایەدا بیروڕایەک دەرببڕێت کە لە ناوچەکەی خۆیدا تەنانەت ئاماژەپێکردنیشی بە تاوانێکی گەورە لە قەڵەم دەدرێت. گەنجێکی وڵاتە سەرمایەدارییەکان کە چالاکیی سۆسیالیستیی تیایاندا بە چالاکییەکی ڕێپێنەدراوی سیاسیی لە قەڵەم دەدرێت، خەفەت بەوەوە دەخوات کە چۆن لە وڵاتانی سۆسیالیستییدا گەنجەکان دەتوانن ئازادانە لەو بوارەدا ڕای خۆیان دەرببڕن و بە کارێکی سادە و ئاسایی دەژمێردرێت [بەڵام ئەم ناتوانێت].

هەر لە بەر ئەوەشە کە خەڵک هەندێ جار بە هۆی بێئاگایی و بێخەبەریی لە بارودۆخی دنیا، ناچارن زۆر نەهامەتیی و چەرمەسەریی تەحەمول بکەن.

ئەو بەخۆنامۆبوونەش کە دەرەنجامی بێئاگایی و تەنیاییە، نەک تەنها سەرچاوەی ڕەنج و ئازارە، بەڵکوو بەشێکی زۆری وزەی مرۆڤەکان بۆ پاراستنی سەربەخۆیی فکریی لە شوێنە ناسازگارەکاندا بە فیڕۆ دەدات کە ٩٩%ی جارەکان، جۆرێک ترس و تۆقاندنی لێ دەکەوێتەوە و ڕێ لە گەییشتنی مرۆڤ بە ئەنجامێکی لەبار و لۆژیکیی دەگرێت لە کارەکانیدا.

خۆشکانی برۆنتێ، پێش چاپکردنی کتێبەکانیان هەرگیز تووشی کەسانی هاوفکری خۆیان و کەسانێک کە ڕۆحییاتیان لێک بچێت، نەبووبوون. ئەم دۆخە کاریگەرییەکی هێندە خراپی لەسەر ئیمیلی دانەنا چوونکە بوێر و چاونەترس بوو، بەڵام کاری لە شارلۆت کرد

چوونکە سەرەڕای ئەوەی کە نووسەرێکی بەتوانا و لێهاتوو بوو، بەڵام هێشتا تا ڕادەیەک کاریگەریی ئاکار و هەڵسوکەوتی مامۆستاکەی ماڵەوەی بە سەرەوە مابووەوە.

"بلەیک"یش وەکوو ئیمیلی برۆنتێ لەوپەڕی گۆشەگیریی فکرییدا ژیابوو بەڵام هاوشێوەی ئەو، بە یارمەتیی هزر و ئاوەزە بەهێزەکەیەوە توانیبووی کاریگەرییە خراپەکانی گۆشەگیریی فکریی لە ناو بەرێت. هەمیشە لەو باوەڕەدا بوو کە لە سەر حەق بووە و ڕەخنەکاران سەبارەت بە بەرهەمەکانی بە هەڵەدا چوونە. دەتوانین لەم دێڕانەی خوارەوە بزانین کە بیروڕای سەبارەت بە ڕای گشتیی چی بووە:

«تەنها یەک کەسم دەناسی
کە تووشی شڵەژانی نەدەکردم
زیرەکێکی تورکی بە ڕەچەڵەک "کەلیمیی"یە
مادام ئاوایە، ئێوە چی دەڵێن ئەی هاوڕێ ئازیزە مەسیحییەکانم؟».

زۆر کەمن ئەوانەی کە هێز و توانایەکی ڕۆحیی لە جۆری ئەوەی "ئیمیلی برۆنتێ"یان هەبێت. لای زۆربەی تاکەکانی کۆمەڵگا، بوونی ژینگەیەکی سازگار لەگەڵ بیر و ئەندێشەکانیان مەرجی سەرەکیی بەختەوەرییە و، دیارە زۆر کەسیش لە ژیانی ئاوادا دەژین. هەموو کەسێک هەر لە سەرەتای تەمەنی مێرمنداڵییەوە بە گوێرەی جۆری بیرکردنەوەی، ڕوو لە هەندێک بیر و باوەڕ دەکات و بە شێوەیەکی غەریزیی خۆی لەگەڵ باوەڕ و دابونەریتەکانی کۆمەڵگاکەیدا دەگونجێنێت. بەڵام ئەو ژمارە کەمەی کە لە ڕاستییدا شایستەیی هونەریی و فکرییان هەیە، ئەم جۆرە ڕەزامەندییە بەس نییە.

بۆ نموونە کەسێک کە لە گوندێکی بچووکدا لە دایک بووە، هەر لە سەرەتای مێرمنداڵییەوە ئەگەر بیهەوێت گەشە بە فکری خۆی بدات، خۆی لە شوێنێنکی دەورەدراو بە هۆکارگەلی پڕ لە ڕق و دوژمنکاریی دەبینێتەوە. ئەگەر بیهەوێت کتێبگەلی باش و گرینگ بخوێنێتەوە منداڵەکانی دیکە سووکایەتیی پێ دەکەن و مامۆستاکانیشی پێی دەڵێن ئەو کتێبانە بیر و هۆشی تێک دەدەن. ئەگەر حەزی لە هونەر بێت، منداڵەکانی دیکە وەک کەسێکی بێ ئەخلاق چاوی لێ دەکەن و گەورەکانیش وەک کەسێکی نائاسایی و

ناسروشتیی سەیری دەکەن. ئەگەر حەز لە کار و پیشەیەک بکات کە هەر چەند باش و بەڕێزیش بێت بەڵام لە ناو خەڵکی کۆمەڵگاکەیدا باو نەبێت، پێی دەڵێن بەرزەفڕە و دەبێ هەمان ئەو کارە بکات کە باوکی دەیکات؛ واتە کارێک کە بۆ باوکی شیاو و شایستەیە، بۆ ئەویش بە هەمان شێوەیە. ئەگەر بیهەوێت ڕەخنە لە بیر و باوەڕە ئایینییەکانی دایک و باوکی یان پێوەندییە سیاسییەکان بگرێت، بە ئەگەرێکی زۆرەوە کێشە و دەردەسەریی زۆری بۆ خۆی تاشیوە.

لە بەر ئەم هۆکارانەیە کە زۆربەی ئە پیاو و ژنە گەنجانەی کە خاوەن بەهرە و لێهاتوویییەکی لە ڕادەبەدەرن، قۆناغی گەنجێتیی و باڵقیی بە قۆناغی ناکامییە گەورەکان دەژمێرن، لە کاتێکدا ڕەنگە لای گەنجە ئاساییەکان ئەم قۆناغە قۆناغی شادیی و کەیف و خۆشییەکان بێت. بەڵام ئەم تاقمە بە دوای هەندێ کار و سەرقاڵیی جدیترەوەن کە نە دەتوانن لە ناو گەورەکاندا بیدۆزنە، نە لە ناو ئەو کەسە هاوچەرخانەیان کە بە هەڵکەوت لەو کۆمەڵگایەی ئەواندا لە دایک بوونە.

ئەم جۆرە گەنجانە کاتێک دەچنە زانکۆ، لەوانەیە تووشیان بە تووشی کەسانێکی هاوفکر و هاوسەلیقەی خۆیان ببێت و چەند ساڵێک لەگەڵیاندا ژیانێکی بەختەوەرانە بەرنە سەر و، ئەگەریش بەخت یاریان بێت دوای تەواوکردنی خوێندن، بە کارێکەوە سەرقاڵ ببن کە بتوانن لەگەڵ کەسانی هاوفکری خۆیاندا پێوەندییان هەبێت. کەسێکی ڕۆشنبیر کە لە شارێکی گەورەی وەک لەندەن یان "نیۆیۆرک"دا دەژیت، زۆربەی کات دەتوانێت دەرفەتگەلی لەباری فکریی بۆ خۆی بڕەخسێنێت و ناچار نەبێت بە ڕیاکاریی و مەحافزەکارییەوە هەڵسوکەوت بکات.

بەڵام ئەگەر هەر ئەم گەنجە بە هۆی کار و پیشەکەیەوە ناچار بێت لە شار یان دەڤەرێکی بچووکدا بژیت، ناچارە [تەنانەت] ڕێز لە کەسانی ئاسایی بگرێت و ویست و داخوازەکانی خۆی لە پێناوی ڕێزگرتن لە خەڵکی تر پشتگوێ بخات. بۆ نموونە هەندێک جار ئەوە بۆ دکتۆر یان پارێزەرێک ڕوو دەدات کە بە درێژایی تەمەنی، لە بەر خاتری ئەو کەسانەی کە ڕۆژانە سەروکاری لەگەڵیاندا هەیە، حەز و ویستەکانی خۆی بشارێتەوە. ئەم پرسە بە تایبەت لە "ئەمریکا"دا بە هۆی بەرین و بەرفراوانبوونییەوە بە زۆریی ڕوو دەدات.

لە شوێنە جۆراوجۆرەکاندا واتە باکوور، باشوور، ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، مرۆڤ بەرەوڕووی کەسانێکی تەنیا و نامۆ دەبێتەوە کە تەنها لە ڕێگەی کتێبەوە لەوە ئاگادارن کە هەندێ شوێن لە سەر ئەم گۆی زەوییەدا هەن کە تیایاندا هەستی نزیکایەتیی [واتە ئامۆشۆ و نزیکایەتیی کۆمەڵایەتیی] شتێکی بێواتایە و هیچ شانسێک بۆ ژیان لەو شوێنانەدا بوونی نییە.

خەڵکی ئەم ناوچانە بە دەگمەن کەسانێک دەبینن کە بتوانن قسەیان لەگەڵدا بکەن و بیروڕایان لەگەڵدا بگۆڕنەوە. بەختەوەریی ڕاستەقینە لە وەها بارودۆخێکدا بۆ کەسانێک کە هێندەی بلەیک و ئیمیلی برۆنتێ، کراوە و کۆمەڵایەتیی نەبن مەحاڵە. دەبێ بۆ کەمکردنەوە یان لەناوبردنی حکوومەتی زاڵمانەی ڕای گشتیی، ڕێگەچارەیەک بدۆزرێتەوە تا «کەمینەی ڕۆشنبیر»ی کۆمەڵگا بتوانن پێوەندیی بە یەکترییەوە بکەن. زۆربەی جار شەرمنیی لە ڕادەبەدەر، کێشەکە ئاڵۆزتر دەکات. ڕای گشتیی هەمیشە ستەمی زیاتر لەو کەسانە دەکات کە ترسنۆکن، وەک لەوانەی کە خەمسارد و کەمتەرخەمن. سەگ کاتێک بزانێت لێی دەترسن بە دەنگی بەرزتر پەلامار دەدات و ئامادەییەکی زیاتریشی بۆ هێرشکردن دەبێت، بەڵام کاتێک گوێی پێی نەدرێت دۆخەکە پێچەوانە دەبێتەوە. ئەم تایبەتمەندییە کەم تا زۆر لە ناو تاکەکانی مرۆڤیشدا هەیە. ئەگەر وای نیشان بدەن کە لێیان دەترسن، خۆتان وەک نێچیرێکی ئامادە خستۆتە بەردەستیان، بەڵام ئەگەر خەمسارد و کەمتەرخەم بن ئەوان گومان لە هێز و دەسەڵاتی خۆیان دەکەن و هێندەی بۆیان بکرێت خۆیان تووشی کێشە و دەردەسەریی ناکەن و وازتان لێ دێنن. ئەڵبەتە مەبەستی من لێرەدا ئەوە نییە کە پڕوپاگەندە بۆ شەڕ و شەڕخوازیی بکەم. ئەگەر لە "کالیفۆرنیا"دا لایەنگری بیر و باوەڕەگەلێکن کە لە "ڕووسیا"دا باون یان بە پێچەوانەوە، دەبێ خۆتان ئامادەی تەحەمولکردنی دەرەنجامەکانیشی بکەن. مەبەستی من لەم نموونە زێدەڕۆیانانە نییە [کە باسم کردن]، بەڵکوو مەبەستم لەوانەیە کە بە شێوەیەکی نەرمونیانتر لە ڕێسا تەقلیدییەکانی تێ دەپەڕێنن؛ وەکوو ڕەچاوکردنی شێوەی دروستی جلوبەرگ لەبەرکردن، یان وابەستەیی بە فلان کڵێسە، یان خۆبواردن لە خوێندنەوەی ئەو کتێبانەی کە فکر بە ئاراستەیەکی دیاریکراودا دەبەن. هەڵەیەکی لەم جۆرە ئەگەر تێکەڵ بە ڕووکراوەیی و خەمساردیی - ئەڵبەتە نەک بە کەمتەرخەمییەوە - وە لە هەمان کاتدا ڕەزامەندیی بێت، تەنانەت لە وشکترین و دۆگمترین کۆمەڵگاکانیشدا قابیلی تەحەمولکردنە و

ورده ورده دۆخەکە بەو ئاراستەیەدا دەبات کە کەسی ئەنجامدەر وەک شێتێک نیشان دەدات کە بۆی هەیە هەموو کارێک ئەنجام بدات. ئەڵبەتە ئەم پرسە زیاتر بەندە بە سروشتی هاوڕێیانەی تاکەکانەوە و کەسانێکیش کە لایەنگری ترادیسیۆن و دابونەریتە کۆنەکانن، بە هەموو لادانێک لە عورف و عادات تووڕە دەبن، چوونکە ئەم جۆرە هەڵانە بە ڕەخنە لە دژی خۆیانی لە قەڵەم دەدەن. ئەوان بە مەرجێک چاوپۆشیی لە پشتگوێخستنی دابونەریتەکان دەکەن کە تاک بتوانێت بە ڕووکراوەیی و ڕەزامەندییەوە بیسەلمێنێت کە مەبەستی ڕەخنەگرتن نەبووە. بەڵام هەڵاتن لە ڕەخنە بۆ کەسانێک کە باوەڕەکانیان ڕێیان پێ نادەن لەگەڵ خەڵکدا بن و هاوخەمییان لەگەڵدا بکەن، مەحاڵە. نەبوونی دڵسۆزیی و هاوفکریی ئازاریان دەدات و دەبێتە هۆی ئەوە کە ڕەفتارێکی توندوتیژ و دوژمنکارانەیان هەبێت.

کەسانێک کە خۆیان لەگەڵ بنەما و دابونەریتی کۆمەڵگاکەیاندا ناگونجێنن، بە شێوەیەکی گشتیی کەسانێکی تووڕە و ڕقاویی و ناسازگارن. هەر ئەم کەسانە ئەگەر بکەونە شوێنێکەوە کە خاوەن باوەڕگەلی سەرسووڕهێنەر و ناهەماهەنگ نەبن، کەسایەتییان بە تەواوتیی دەگۆڕن و ڕەنگە لە کەسێکی گۆشەگیر و دوورەپەرێزەوە ببن بە کەسێکی شاد و چالاک و لە جیاتیی گۆشەگیریی و دوورەپەرێزیی، خۆیان بگونجێنن و لە جیاتیی ئەوەش کە بە ناو خۆیاندا ڕۆ بچن، ببنە کەسانێکی کۆمەڵایەتیی و تێکەڵ بە خەڵکی تر ببن.

لە بارودۆخێکی ئاوادا لاوەکان دەبێ کارێک هەڵبژێرن کە بتوانن خۆیان تێکەڵ بە هاوکارەکانیان بکەن و بتوانن پێکەوە بە ئاسانیی هەڵبکەن؛ تەنانەت ئەگەر داهاتی کەمتریشیان دەس بکەوێت. لەم جۆرە کاتانەدا ئەگەری ئەوەی هەیە کە گەنجەکان تووشی هەڵە ببن چوونکە زانیارییان لە سەر بارودۆخی جیهان سنوورداره و بە ئاسانیی ئەو تەسەورەیان لە لا دروست دەبێت ئەو باوەڕە دەمارگیرانانەی کە ئەوان پێیان ڕاهاتوون لە هەموو دنیادا بوونیان هەیە. لەم ڕووەوە دەبێ کەسانی بە تەمەن ڕێنیشاندەری لاوەکان بن چوونکە ئەوان ئەزموون و شارەزاییەکیان بە دەست هێناوە کە بۆ سروشتی مرۆڤ پێویستە و، لاوان دەبێ تەمەنێکی زۆر بۆ بەدەستهێنانیان تەرخان بکەن.

لەم سەردەمەدا کە دۆزینەوەی ڕاستییەکان لە ڕێگەی دەروونشیکارییەوە بۆتە شتێکی گشتگیر، ئەم بۆچوونەش کە هۆکاری هەڵنەکردنی لاوان لەگەڵ کۆمەڵگادا دەگەڕێتەوە بۆ

کێشەگەلی ڕۆحیی، زیاتر خۆی لە ڕاستیی دەدات. بەڵام بە ڕای من ئەمە بۆچوونێکی هەڵەیە. بۆ نموونە دایک و باوکی لاوێک باوەڕیان بە «تیۆریی تەکامول»[٨٣] نییە. ئەم لاوە ئەگەر «تیۆریی تەکامول»ی قبووڵ نەکرد، نابێ بە دژایەتیکردن و ناکۆکیی لێک بدرێتەوە؛ ئەو بە هۆی باوەڕە کۆنەکەی دایک و باوکییەوە، هەماهەنگیی خۆی لەگەڵ خەڵکانی دەوروبەریدا تێک دەدات. دیارە ناهەماهەنگیی لەگەڵ کۆمەڵگادا شتێکی ناخۆشە بەڵام هەمیشە ئەوەندە ناخۆشیش نییە کە نابێ بە هیچ شێوەیەک توخنی بکەوین. لە لایەکی دیکەوە ناهەماهەنگیی لەگەڵ کۆمەڵگای دەمارگیر، زاڵم، یان نەزان و نالۆژیکییدا، نەک تەنها زیانبەخش نییە بەڵکوو شایستەیی و لێهاتوویی ئەو کەسە دەگەیێنێت. بە چاوخشاندنێک بە ژیانی بیرمەندانێکی وەک گالیلە[٨٤] و کۆپلێر[٨٥] بۆمان دەردەکەوێت کە هەندێ بیرۆکەی مەترسیداریان خراوەتە پاڵ؛ هێشتاکەش کەسە زۆر ڕۆشنبیرەکانی سەردەمی ئێمە بەرەوڕووی

---

٨٣ - بە پێی ئەم تیۆرە، گیانەوەر و ڕەوەک لە سەر بنەمای کامڵبوونی هێدی هێدی، درێژەی هەمان ڕەگەزی پێش خۆیانن، نەک ئەوەی کە سەر لەنوێ بخولقێنرێن.

٨٤ - Galileo Galilen؛ ١٥٦٤ – ١٦٤٢؛ بیرکاریزان و ئەستێرەناس و فیزیکزانی گەورەی ئیتالیایی کە ڕای گەیاند زەویی دەجووڵێتەوە. یەکەم داهێنانی دووربینێک بوو کە سی جار نزیکی دەکردەوە [واتە زوومی دەکرد]. گالیلە ئەنجامی بینینەکانی خۆی سەبارەت بە مانگ کە دژی بۆچوونەکانی "ئەرەستۆ"ش بوون، لە نامیلکەیەکدا بە ناوی **پەیکی ئاسمانیی** لە ساڵی ١٦١٠دا بڵاو کردەوە کە بەرەوڕووی دژایەتییەکی زۆر لە لایەن کۆمەڵگای ئەو سەردەمەوە بووەوە. گالیلە ساڵی ١٦٣٢ کتێبێکی بە زمانی ئیتالیایی بڵاو کردەوە کە تیایدا یەک کەس داکۆکییان لە بەتلیمووس و دوو کەس داکۆکییان لە کۆپرنیک دەکرد. پاشان بانگێشتی ڕۆمیان کرد و لە لایەن کڵێسەی «ضاتیکان»ەوە ناچار کرا نکووڵیی لە جووڵەی زەویی بکات و تۆبەنامەش بنووسێت. دوای دادگاییەکردنەکەی کە زۆر بە ئارامیی و لێبووردنیشەوە تێ پەڕی، لە ماڵی یەکێک لە هاوڕێکانیدا بە ناوی "قەشە پیکۆلۆمینی"دا کەوتە ژێر چاودێرییەوە و لە بەر ئەوەش کە نەیدەتوانی لێکۆڵینەوە لە سەر ئاسمان بکات، خۆی بە کاری "میکانیک"ەوە سەرقاڵ کرد و هەندێ سەرکەوتنی زۆر گەورەشی بە دەست هێنا. گالیلە لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا بینایی خۆی لە دەست دا.

٨٥ - Kepler ؛ یۆهانس کۆپلێر ئەستێرەناسی بەناوبانگی ئەڵمانیی کە ساڵی ١٦٠٩ لە پڕێکدا بە یارمەتیی هێزێکی غەیبییەوە بۆی دەرکەوت کە هەسارەی مریخ لە سەر ئاراستەیەکی بازنەییدا ناسووڕێتەوە بەڵکوو ئاراستەیەکی هێلکەیی هەیە و بە دۆزینەوەی ئاراستەی هێلکەیی ئەم هەسارەیە، سێ یاسای زۆر گرینگی بۆ سووڕانەوە و جووڵانەوەی هەسارەکان دارشت. کۆپلێر سەلماندی کە ئاراستەی هەسارەکان بە دەوری هەتاودا ئاراستەیەکی هێلکەییە و هەموو هەسارەیەک خێرایی سووڕانەوەی بە دەوری خۆیدا بەردەوام تووشی گۆڕان دەبێت [واتە کەم و زیاد دەبێت]. هەروەها یەکەم کەس بوو کە بناغەی تلیسکۆپی ئەستێرەناسیی دارشت و یاساکانی شکانەوە=(ئینکسار)ی ڕووناکیی و ڕەنگی ڕووناکیی دۆزییەوە.

ئەم جۆرە کێشانەن. ئەوە شتێکی جوان نییە کە بۆچوونەکانی ناو کۆمەڵگا هێندە بەهێز بکرێن کە نەیارانی کۆمەڵگا بتۆقێن و ترس دایانبگرێت. باشترین کار ئەوەیە کە هێندەی بۆمان بکرێت ڕێگایەک بدۆزینەوە بۆ کەمکردنەوەی ئەم دژایەتیی و نەیارییە.

لەم سەردەمەی ئێمەدا ئەم کێشەیە لە قۆناغی لاوێتییەوە دێتە ئاراوە. ئەگەر کەسێک هەر لە سەرەتای ژیانییەوە بە ڕێگای ڕاست و دروستدا بڕوات، ناچار نابێت ئەو هەموو ڕەنج و ئازار و ئەشکەنجە کۆمەڵایەتییانە تەحەمول بکات.

کەسێکی لاو تا کاتێک لە کوورەی ئەزموونندا نەتوێتەوە [و خۆی بە ئەزموونی جۆراوجۆر تەیار نەکات]، بە ناچاریی دەبێ دەسدرێژیی فکریی خەڵکی نەزان تەحەمول بکات. بۆ نموونە لاوێک کە وەکوو پێویست خوێندنەوەی لە سەر پرسە سیاسییەکانی کۆمەڵگاکەی خۆی نەکردووە و ئەزموونی بە دەست نەهێناوە، ناتوانێت لە هەمبەر چەنەبازیی و هەڵەوەڕیی خەڵکی نەزاندا بیروڕاکانی خۆی بە تەواویی و بە دروستیی دەرببڕێت و بۆیە ناچارە بیر و باوەڕە گەمژانەکانیان تەحەمول بکات. ئەم لاوە ئەگەر بیهەوێت کەڵک لە زانیارییە کەمەکانی خۆی وەربگرێت، زۆر عەسەبیی دەبێت و بە ناچار لەو جۆرە بەرەوڕووبوونانەوەدا تووشی شکست دەبێت.

کەسانێک هەن کە پاش کۆتاییهێنان بە حکوومەتی چەوسێنەرانەی جەهل و نەزانین، هێندە شەکەت و هیلاک بوونە کە هێزی سروشتیی ژیانیان بە تەواوەتیی تواوەتەوە. ئەڵبەتە کەسانێکیش هەن کە باوەڕیان وایە کۆنتاکت (=پێکادان) نابێتە هۆی شاردنەوەی بلیمەتیی و لێهاتوویی و، هەروەها زەجر و ئەشکەنجەش هێزی داهێنان کەم ناکاتەوە. بەڵام هەر چۆنێک بێت، ئەم کۆنتاکتە بەو ئەزموونە کەمانەی قۆناغی لاوێتییەوە کارێکی سەختە.

بۆچوونێکی باو هەیە کە دەڵێت هیچ جینایەتێک بە بێ سزا نامێنێتەوە و ئەم بۆچوونە سەرەڕای دروستبوونیشی تەنها جینایەتە دۆزراوەکان دەگرێتەوە و جینایەتە نەدۆزراوەکان بێ سزا دەمێننەوە. بۆ سەلماندنی ئەم قسەیەش دەتوانین بڵێین کە زۆرێک لە کەسانی لێهاتوو و بلیمەت، چەندین قۆناغی سەخت و دژواریان تێ پەڕاندووە و نەیارەکانیان بە هۆی سەرکەوتنەکانی ئەوانەوە سزایان بینیوە، بەڵام نکوولیی لە بوونی ئەو بلیمەتانەش ناکرێت کە

لە قۆناغی لاوێتییدا چەندین چەرمەسەریی و دژوارییان بینیوە و تیادا چوونە و نەیارەکانیشیان هیچ سزایەکیان نەبینیوە.

بە هەر حاڵ نابێ ئەمە وەک ڕێسایەکی [گشتیی] لێ بێت کە مرۆڤ دەبێ بۆ بەختەوەربوون، تاڵیی لەناوچوونی وزە و تواناکانی خۆی تاقیی بکاتەوە. چوونکە ئەزموون دەری خستووە کە سەرکەوتن هەمیشە بە دژواریی دەستەبەر بووە و ئەگەر لە ڕێگایەکی دروست و لۆژیکییدا بە دوای سەرکەوتنەوە نەبین، لاوی کەم ئەزموونی ئەمڕۆ، توانای پەڕینەوە لە ڕێڕەوە سەخت و ئەستەمەکانی بەختەوەریی نابێت.

دەبێ بەساڵاچووەکان ڕێز لە حەز و داواکارییەکانی لاوان بگرن و لەگەڵ ئەوەشدا نابێ چاوەڕێ بکەن حەتمەن دەبێ لاوان ڕێز لە داواکارییەکانی ئەوان بگرن. چوونکە لە ئێستادا ئەوە ژیانی لاوەکانە کە گرینگە نەک ژیانی ئەو بەساڵاچووانەی کە ڕێگای خۆیان بڕیوە و لە کۆتاییەکانی ڕێگەدان و چاوەڕێی مەرگ دەکەن.

تاکەکان پاش گەییشتنیان بە تەمەنی ئەقڵ، لە هەڵبژاردنی ڕێگای ژیانیاندا ئازادن و بە هیچ شێوەیەک نابێ بەساڵاچووەکان بیروڕا و ئەو ڕێگایەیان بە سەردا بسەپێنن کە خۆیان پیایدا ڕۆشتوون. لێرەدا لاوەکان بۆیان هەیە هەڵەش بکەن و لەو ڕووەشەوە ئازادن و، کارێکی ئاقڵانە نییە ئەگەر بەرەی لاو سەبارەت بە پرسە گرینگەکانی ژیان، مل بۆ ویست و داواکاریی چینی بەساڵاچوو کەچ بکات.

وای دابنێن ئێوە گەنجێکن کە زۆر حەزتان لە کاری شانۆ و بەئەکتەربوونی تیاترە. دایک و باوکە پیرەکانتان بەشداریی ئێوەیان لە دنیای شانۆدا پێ ناخۆشە و دژایەتیتان دەکەن. ئەوان هۆی زۆریان هەیە بۆ دژایەتیکردنی ئێوە و ڕەنگە ڕاستیش بکەن، بەڵام ئایا دۆخی هونەری بەرز و باڵای تیاتر ئەوەندە خراپ و نالەبارە کە لاوێک بە تەنها لە بەر بیرکردنەوەی نادروستی دایک و باوکی وازی لێ بهێنێت؟ گونجاوترین وەڵام بۆ ئەم پرسیارە ئەوەیە کە ئەگەر ئەو لاوێک لە بەهرە و توانایەکای خۆی دڵنیایە، دەبێ لە سەر داواکەی سوور بێت و بە کردەوە توانایەکانی خۆی بە دایک و باوکی بسەلمێنێت.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بە خاڵێک بکەم کە ئەویش هەڵسەنگاندنی کەسانی پسپۆڕ و شارەزایە. ئێوە نابێ دژایەتیکردنی دایک و باوکە پیرەکانتان لەگەڵ هەڵسەنگاندنی ئەو کەسە

شارەزا و پسپۆڕانەدا بەراورد بکەن کە پێیان وایە ئێوە بەهرە و توانای کارێکتان نییە. لەم جۆرە کاتانەدا ملدان بە ڕا و بۆچوونی شارەزایان نەک تەنها باش و گونجاوە بەڵکوو دەتوانێت زۆر سوودبەخشیش بێت، چوونکە ڕێ لە بە فیرۆدانی کاتتان دەگرن.

نموونەیەکی دیکەی ترس لە ڕای گشتیی، بە فیرۆدانی داهات و پاشەکەوتی تاکەکانە کە دیارە هیچ سوودێکیشی لێ ناکەوێتەوە. کەسانێک هەن کە بۆ ڕاکێشانی سەرنجی ڕای گشتیی، گەلێک خەرج و مەسرەفی بێهوودە و ناپێویست دەکەن. بۆ نموونە ئێوە پێتان وایە ئەگەر ئۆتۆمبیلێکی گرانبەها و ئاخر مۆدێلتان هەبێت، لە لایەن خەڵکەوە زیاتر ڕێزتان لێ دەگیردرێت؟ کە وەک دیارە بۆ کڕینی ئەو ڕێزگرتنەش پارەیەکی زۆر لە داهات و پاشەکەوتەکان خەرج دەکەن. کاتێک ئەم خەرجکردنە بە دڵ و حەزی خۆتان نەبێت و تەنها لە بەر خاتری ترس لە ڕای گشتیی بێت، ئەوا خەرجێکی بێهوودەتان کردووە.

گومان لەوەدا نییە ڕوخسار و جلوبەرگی جوان و ڕازاوە و ئۆتۆمبیلی گرانبەها و میوانداریکردنی پڕ خەرج و کتێبخانەی گەورە و پڕ لە کتێب، ڕێز و حورمەت بۆ خاوەنەکانیان دەستەبەر دەکەن، بەڵام ئەمە نابێ ببێتە هۆی جیاوازیی ئەم کەسانە لەو کەسە ئاساییانەی کە لەو شتانە بێبەشن.

ئەگەرچی دژایەتیکردنی ڕای گشتیی لە هەندێ کاتدا ڕێپێدراوە، بەڵام کەس بۆی نییە تەنها بە هۆی گاڵتەپێکردن و ناکۆکبوون لەگەڵ بارودۆخی گشتییدا دژایەتیی ڕای گشتیی بکات. بۆ دژایەتیکردنی ڕای گشتیی، دەبێ خۆمان بە چەکی زانست و ئەزموون تەیار بکەین، چوونکە ئەگەر وا نەبێت خۆمان دەبینە جێی گاڵتە و ڕابواردن [ی خەڵک].

بە هەر حاڵ ترس لە ڕای گشتیی وەکوو زۆربەی ترسەکانی دیکە، نادادپەروەرانە و زاڵمانەیە و ڕێ لە گەشەکردن و پێشکەوتن دەگرێت. کاتێک تووشی ترس لە ڕای گشتیی دەبین، تەنانەت گەییشتن بە ئازادیی بیرکردنەوە و ئازادیی ڕۆحییش بۆمان ئەستەم دەبێت. چوونکە یەکێک لە هۆکارەکانی بەدەستهێنانی بەختەوەریی ئەوەیە کە ڕێگای ژیان دەبێ لە پاڵنەرە بەهێزەکانی قوڵایی بوونمانەوە سەرچاوە بگرێت و بە ویست و خواستی ئەو کەسانە نەبێت کە بە ڕێکەوت لە سەر ڕێگاماندا قوت دەبنەوە. بە دڵنیاییەوە لە چاو ڕابردوو، ترس لە دراوسێکان کەمتر بۆتەوە بەڵام ترسێکی تازە جێی گرتۆتەوە؛ ترس لەوەی کە ڕۆژنامەکان

چی دەڵێن و ئەمەش ڕێک هێندەی «جنۆکەگیریی/ڕاوە جنۆکە« چاخەکانی ناوەڕاست تۆقێنەر و ترسێنەرە. کاتێک ڕۆژنامەکان دەیانەوێت لە کەسانی بێتاوان قەڵغانێک دروست بکەن و قوربانییان بکەن، ڕەنگە دەرەنجامێکی زۆر مەترسیداری لێ بکەوێتەوە. بەختەوەرانە زۆر کەس بە هۆی نەناسراوییەوە تووشی ئەم چارەنووسە نگریسە نابن بەڵام لە بەر ئەوەی کە پڕوپاگەندە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەهێزتر و کارامەتر دەبێت، ئەگەری ئازار و ئەشکەنجەی کۆمەڵایەتییش ڕوو لە زیادبوونە.

هەر چەند پرەنسیپی «ئازادیی چاپەمەنیی» شتێکی زۆر بە نرخ و بایەخدارە، بەڵام من پێم وایە دەبێ لەم کارەدا بنەما و ڕێسایەکی ئاقڵانەتر دابڕێژرێت بە تایبەت لە بواری تۆمەت و بوختان هەڵبەستندا و هەر کردەوەیەک کە ژیانی کەسانی بێتاوان سەخت و دژوار بکات ڕێگەی پێ بگیردرێت - تەنانەت ئەگەریش بە هەڵکەوت هەندێ شتیان لە بارەیەوە وتبێت. چوونکە بڵاوکردنەوەی هەموو بابەتێک بە تایبەت بڵاوکردنەوەی بابەتێک کە ڕق و کینەی لەگەڵدا بێت، دەبێتە هۆی ئەوە کە زۆرینەی خەڵک متمانەیان بە ڕۆژنامەکان نەمێنێت. بە هەر حاڵ تاقە ڕێگەی ڕێگرتن لەم کارەساتە ئەوەیە کە ڕادەی تەحەمول و دانبەخۆداگرتنی کۆمەڵگا زیاتر بکرێت. باشترین ڕێگاش بۆ زیاترکردنی ڕادەی تەحەمول، زیادبوونی ژمارەی تاکە بەختەوەرە ڕاستەقینەکانە، چوونکە ئەوان بە دوای عەزیەت و ئازاردانی هاوڕەگەزەکانیانەوە نین.

١٠

## ئایا دەتوانین بەختەوەر بین؟

تا ئێرە بارودۆخی تاکی بەدبەختمان تاوتوێ کرد و ئێستاش تایبەتمەندییەکانی تاکی بەختەوەر دەخەینە بەر شرۆڤە و لێکدانەوە کە بابەتێکی خۆشتر و دڵبزوێنتریشە. بە پێی قسە و نووسینەکانی هەندێک لە هاوڕێکانم بەم دەرەنجامە گەییشتوومە کە بەدەستهێنانی بەختەوەریی لەم سەردەمەی ئێستادا مەحاڵە. ئەم بۆچوونە بە خوێندنەوەیەکی کۆمەڵناسانە و سەفەر بۆ وڵاتانی دیکە و تەنانەت وتوویژ لەگەڵ مرۆڤە ئاساییەکاندا - بۆ نموونە باخەوانەکەی خۆم - دەسەلمێنرێت.

لە یەکێک لە بەشەکانی بەشی یەکەمدا لێکدانەوەیەکم لە سەر هۆکارەکانی بەدبەختیی هاوڕێ نووسەر و ئەدیبەکانی خۆمم خستە ڕوو و، لەم بەشەشدا بە تەمام بارودۆخی ئەو تاکە بەختەوەرانە تاوتوێ بکەم کە بە درێژایی ژیانم هەڵسوکەوتم لەگەڵیاندا هەبووە.

بە گشتیی بەختەوەریی دوو جۆرە کە ئەڵبەتە لە نێوانی ئەو دوو جۆرەشدا هەندێ جۆری بچووکتریش هەن. ڕەنگە بتوانین ئەم دوو جۆرە بەختەوەرییە لە ژێر ناوی **سادە** و **ناسادە**، یان **جەستەیی** و **ڕۆحیی**، یان بەختەوەریی هەڵقوڵاوی **دڵ** و **مێشک** پۆلینبەندیی بکەین. لەم پۆلێنکردنەشدا ئەو مافە بۆ خۆم قایل دەبم کامیان هەڵبژێرم؛ بۆیە باس لەوەیان دەکەم کە بە تەمام لەم بەشەدا مشتومڕی لە سەر بکەم. بەڵام لەم وتارەدا بە تەمای سەلماندنی هیچکام لە جۆرەکانی بەختەوەریی نیم و تەنها دەمەوێ هەندێ بابەت ڕوون بکەمەوە تا بگەین بەو بابەتە سەرەکەییەی کە دەمانەوێ قسەی لە سەر بکەین.

سادەترین دەربڕینێک کە دەتوانین سەبارەت بەم دوو جۆرە بەختەوەرییە بە دەستەوەی بدەین ئەوەیە کە بەدەستهێنانی یەکێکیان بۆ هەموو خەڵک زۆر ئاسانە و ئەوی تریان تەنها بۆ کەسانێک دەستەبەر دەبێت کە بە [خۆ تەیارکردن بە] پاشەکەوتێکی زۆری زانست و زانیارییەوە بە دوایەوەن.

لە قۆناغی منداڵییدا کە بایەخێکی هێندەم بە جیاکردنەوەی بەختەوەریی و بەدبەختیی نەدەدا، پیاوێکم دەناسی کە لەوپەڕی بەختەوەرییدا دەژیا و کاریشی بیر کەندن [بیری ئاو] بوو. باڵابەرز و قۆز، ماسوولکەگەلی ڕێکوپێک و بە گشتیی بە بەر چاوی منەوە لە قارەمانی ناو ئەفسانەکان دەچوو. هیچ خوێندەوارییەکی نەبوو و کاتێک لە ساڵی ١٨٨٥دا بۆ هەڵبژاردنەکانی پەرلەمان، بۆ یەکەم جار [وەکوو هاووڵاتییەک] مافی دەنگدانی بە دەست هێنا، بۆ یەکەم جار بەوەی زانیی کە شتێک بە ناوی پەرلەمان بوونی هەیە. ئەو پێشتر نەیدەزانی یاسای سروشت یان تەکامولی مرۆڤ چییە و، هەروەها ئەوە کە پرسی موڵکایەتیی گشتیی چ دەورێکی لە ئاسوودەیی و خۆشگوزەرانیی خەڵکدا هەیە، هیچ گرینگییەکی بە لایەوە نەبوو و هیچ پێوەندییەکی فکرییشی نەبوو لەگەڵ ئەو گرووپە ئایینییانەی کە حەفتەمین ڕۆژی حەفتەیان بۆ پشوو و ئیسراحەت تەرخان دەکرد و هەروەها ئەو دروشمانەی ڕۆشنبیران کە بۆ دابینکردنی بەختەوەریی مرۆڤایەتیی دیانخەنە ڕوو و، هیچ دەورێکیان لە بەختەوەریی ئەودا نەدەبینی. بناغەی بەختەوەرییەکەی لە سەر هێزی جەستەیی یان ڕەزامەندیی لە کارەکەی و زاڵبوون بە سەر گرفت و کێشە گەورەکانی ژیاندا ڕاوەستابوو. بەختەوەریی باخەوانەکەی منیش لەم جۆرەیە؛ ئەو بەردەوام سەرقاڵی شەڕ و ململانێ لەگەڵ کەروێشکەکانە و بە شێوەیەکی ئەوتۆ باسی ئاژەڵان دەکات کە وەک بڵێی "سکاتلەند یارد"ە کە "بۆلشڤیکەکان" بە مەترسیدار دەزانێت. ئەو کەروێشکەکان بە سەرچاوەی خراپکاریی و گەندەڵیی و کاولکاریی دەزانێت و پێی وایە تەنها بە فڕ و فێڵ دەتوانێت بەرەنگاری ئەم گیانەوەرە دڵڕەقە ببێتەوە. وەک چۆن قارەمانێکی «ڤۆلهالا»[٨٦] بە درێژایی ڕۆژ بە دوای بەرازێکی وەحشییدا ڕای دەکرد و دەمەو ئێوارە دەیکوشت، بەڵام ڕۆژی دواتر بە شێوەیەکی

---

٨٦ - Volhalla، بە پێی باوەڕی خەڵکی سکاندیناڤی، کۆشکێکە تەرخان کراوە بۆ پێشوازیکردنی ڕۆحی ئەو قارەمانانەی کە لە جەنگدا کوژراون.

پەرجووئاسا بەرازەکە زیندوو دەبووەوە، باخەوانەکەی منیش هەموو ڕۆژێک دوژمنەکەی خۆی دەکوژێت و هیچ سەریشی لەوە ناسووڕمێت کە ڕۆژی دواتر دیسانەوە زیندوو دەبێتەوە و دەردەکەوێتەوە و ناشترسێت. هەر چەند تەمەنی لە حەفتای تێ پەڕاندووە بەڵام بە درێژایی ڕۆژ کار دەکات و بۆ گەییشتن بە شوێنی کارەکەی، هەموو ڕۆژێک زیاتر لە **٢٥** کیلۆمەتر بە پاسکیل (دووتایە) مەودایەکی خراپ و پڕ لە هەوراز و نشێو دەبڕێت. بەڵام ئەو چێژ و خۆشییەی کە لە کوشتنی کەروێشکەکان بە دەستی دێنێت زۆر زۆرە و کۆتایی نایە.

ڕەنگە ئێوە بڵێن کە بەدەستهێنانی چێژی سادە و ساکاری لەو جۆرە، شیاو و شایستەی کەسانی گەورەی وەک ئێمە نییە. ململانێ لەگەڵ بوونەوەرگەلی بچووک و کەمبایەخی وەک کەروێشک چ چێژ و خۆشییەکی هەیە؟ بە ڕای من ئەمە بۆچوونێکی زۆر سست و لاوازە. کەروێشک زۆر گەورەترە لە میکرۆبی **تای زەرد** کە کەسانێکی گەورە و بەرجستە هەست بە بەختەوەرییەکی پڕ لە شانازیی دەکەن کاتێک لە ناوی دەبەن و بنبڕی دەکەن.

ئەو چێژەی کە باخەوانەکەم وەری دەگرێت، دەتوانرێت بۆ هەموو کەسێک تەنانەت مرۆڤە بەرز و گەورەکانیش دەستەبەر ببێت. ئەو بۆچوونە جیاوازانەی کە سەبارەت بەم پرسە لە ئارادان، تەنها پێوەندییان بە جۆری ئەو چالاکییانەوە هەیە کە بەختەوەریی دەستەبەر دەکەن. بوونی کێشە و ئاریشە یەکێک لە پێویستییەکانی بەختەوەریین؛ چوونکە ئەوە سەرکەوتن بە سەر ئەو کێشانەیە کە چێژی بەختەوەریی زیاتر دەکات، چوونکە پێش سەرکەوتن بە سەر کێشەکاندا گومانی ناسەرکەوتن و شکستهێنان دەخولقێنێت و کاتێک سەرکەوتن ڕووی دا، هەڵسەنگاندنێکی بێلایەنانە لە سەر هێزەکانمان ئەنجام دەدرێت کە خۆی یەکێکە لە سەرچاوەکانی بەختەوەریی.

کەسێک کە بایەخی ئەوتۆ بۆ بوونی خۆی قایل نابێت، هەمیشە بە سەرکەوتنەکانی شاگەشکە دەبێت و بە پێچەوانەوە کەسێک کە زیاتر لە ڕادەی پێویست بایەخ بە خۆی دەدات، بە هەمان ڕادە شکستەکانی تووشی سەرسووڕمانی دەکەن. سەرسووڕمانی جۆری یەکەم شتێکی باش و گونجاوە و ئەوەی دووهەم نارەزایی و نادڵکاویی لێ دەکەوێتەوە. کەواتە ئاقڵانەترین کار ئەوەیە کە هەر لەخۆڕا خۆبەزلزان و لەخۆبایی نەبین. دیارە نابێ ئەوەندەش

خۆمان وەک کەسێکی لاواز و بێهێز چاو لێ بکەین کە لە ئەنجامدانی کارە باش و گونجاوەکاندا دابمێنین.

ئەمڕۆ لە کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکاندا ئەو کەسە خوێندەوارانەی کە خوێندنی زانکۆیان تەواو کردووە، بەختەوەرترن. زۆرێک لەم کەسە بەرجستانە، سۆز و عاتیفەگەلی سادەیان هەیە و هەر هێندە چێژ لە کارەکەیان وەردەگرن کە چێژ لە نانخواردن و تەنانەت هاوسەرگیریی وەردەگرن. هونەرمەندان و نووسەران و ئەدیبان لەو باوەڕەدان کە هەمیشە لە پرسی هاوسەرگیرییدا تووشی شکست و ناکامیی دەبن. بەڵام کەسانی خوێندەواری ژیر و ئاگا، زۆربەی کات ژیانێکی خێزانیی باش و لەباریان هەیە. هۆی جیاوازیی ڕوانگەی ئەم دوو گرووپە ئەوەیە کە بەشێکی زۆری زیرەکیی و هۆش و ئەقڵیان بۆ کارە سەرەکییەکەیان تەرخان دەکەن واتە ئەو شتەی کە چێژی لێ دەبینن و، خۆیان لەو کاروبارانە هەڵناقورتێنن کە پێوەندییان بەوانە نییە. ئەوان لە کاری خۆیاندا بەختەوەرن، چوونکە زانست لەم سەردەمەی ئێمەدا هۆکارێکی پێشڕەو و بەهێزە و هیچ کەس و کۆمەڵگایەکیش ناتوانیت حاشای لێ بکات. کەسانی خوێندەوار هیچ پێویستییەکان بە ئیحساساتی ئاڵۆز و تێکچنراو نییە، چوونکە هیچ لەمپەرێک ڕێی لە ئیحساسە سادە و ساکارەکانیان نەگرتووە. ئاڵۆزیی ئیحساسەکان لە بنی ناهەمواری ڕووبارێک دەچێت کە بە هۆی لەمپەر و بەرزیی و نزمییەکانەوە ڕەوتی نەرم و نیانی ئاو تێک دەدەن و دەیشکێنن. تا کاتێک هێزی ژیان تووشی ڕێگرییەک نەبێت، هیچ شەپۆل و بەرزیی و نزمییەک لە ڕەوتی ئاوەکەدا نایەتە ئاراوە. ئەو کەسانەش کە وەکوو پێویست وردبین نین، بە سەختیی دەتوانن دەرک بە هێزی ئەو لەمپەر و ڕێگرانە بکەن.

کەسی خوێندەوار هەموو هەلومەرجەکانی گەییشتن بە بەختەوەریی تێدا ئامادەیە. ئەو بوارەی کاری تێدا دەکات بە تەواوەتیی هەموو بەهرە و تواناکانی خستۆتە گەڕ و دیارە دەرەنجامی باشیشی دەست دەکەوێت کە نەک تەنها بۆ خۆی، بەڵکوو بۆ کەسانی دیکەش شایەنی ستایش دەبێت تەنانەت ئەگەر دەرکیشی پێ نەکەن؛ هەر بۆیە دەتوانێت بەختەوەرتر لە هونەرمەندانیش بێت. کاتێک تاکەکانی کۆمەڵگا توانای تێگەییشتنی تابلۆیەکی شێوەکاریی یان پارچە شێعرێکیان نەبێت، دەڵێن تابلۆ یان شێعرێکی ناشیرین و بێواتایە، بەڵام

کاتێک نەتوانن لە تیۆریی ڕێژەییبوون (ڕێژەییگەری)ی ئەنشتاین تێ بگەن، پێیان وایە ئاستی خوێندنەکەیان تەواو و بە قەدەر پێویست نەبووە.

کەواتە ئەنشتاین وەک کەسایەتییەکی گەورە شانازیی پێوە دەکرێت بەڵام باشترین شێوەکارەکان ناچارن لە ناو ژووره تەنگ و بچووکەکاندا لە برساندا بمرن و کەواتە ئێمەش بەو دەرەنجامە دەگەین کە ئەنشتاین بەختەوەر و، شێوەکارەکان نابەختەوەرن. تەنها ژمارەیەکی کەمی خەڵک دەتوانن بەرگەی هەوراز و نشێو و کێشەکانی ژیان بگرن؛ هەمان ئەو کێشانەی کە بە مەبەستی بەرەنگاربوونەوەیان دەبێ بەرەوڕووی خەڵکانێکی زۆر ببنەوە؛ ئەگینا دەبێ خۆیان لە ناو گرووپێکی بچووکدا قەتیس بکەن و دنیای ساردی دەرەوە فەرامۆش بکەن. کەسی بیرمەند پێویستی بەوە نییە کەس بە شان و باڵیدا هەڵبدات، چوونکە بێجگە لە هاوکارەکانی نەبێت ئەوانی تر هەموو ستایشی دەکەن. بەڵام بە پێچەوانەوە هونەرمەند پێگەیەکی نالەباری هەیە کە یان سووکایەتیی پێ دەکرێت، یان دەبێ پلەخواربوونی خۆی تەحەمول بکات کە تەحەمولکردنی جۆری بەدبەختییەکەش بەندە بە هێز و توانایەوە. ئەگەر ئەو بۆ تەحەمولکردنی سووکایەتیی و بەرەنگاربوونەوەی ئەو سووکایەتییە کەڵک لە هێز و توانای وەربگرێت، دەسبەجێ دەکەوێتە بەر ڕق و نەفرەت [ی خەڵکەوە]. دیارە دۆخی هونەرمەندان هەمیشە و لە هەموو شوێنێکدا وا نەبووە. هەندێ جار هونەرمەندە شایستەکان لە سەردەمی لاوێتییدا ڕێزی زۆریان لێ گیراوە. بۆ نموونە "ژوولیۆسی دووهەم"ی ئیمپراتۆری ڕۆم ڕەفتاری لەگەڵ "مایکڵ ئانژ"دا[٨٧] زۆر خراپ بوو، بەڵام هەرگیز بیری لەوە نەدەکردەوە کە ئەو نەتوانێت تابلۆیەکی جوان بخولقێنێت کە سەرنجی هەموو خەڵکی جیهان بەرەو لای خۆی ڕابکێشێت. ئەمڕۆ کەسانێکی ملیۆنێر هەن بەبێ گوێدانە پێگەی هونەریی هونەرمەندان، ڕەنگە پاش مردنیان پارەیەکی زۆر بۆ زیندوو هێشتنەوەیان خەرج بکەن و هەرگیزیش بیر لەوە ناکەنەوە کە هونەری ئەم هونەرمەندانە دەبێ هێندەی خودی خۆیان بەها و بایەخی هەبێت. ڕەنگە هەر ئەم بەڵگانە بەس بن بۆ ئەوەی کە بیسەلمێنین هونەرمەندان تا ڕادەیەکی زۆر بەدبەختتر و ناکامتر لە بیرمەندانن.

---

٨٧ - Michael Anjelo؛ ١٥٦٤ – ١٤٧٥؛ لە بوارەکانی شێوەکاریی و پەیکەرسازیی و تەلارسازی(میعماری)دا مامۆستا و شارەزایەکی بێوێنە بوو.

بە باوەڕی من، دەبێ دان بەوەدا بنێین زۆربەی لاوە ڕۆشنبیرەکانی وڵاتە ڕۆژئاواییەکان تووشی ئەم ناکامییەن کە هیچ شوێنێکی گونجاو و لەباریان نییە بەهرە و تواناییەکانیان تێدا بخەنە گەڕ و بەهرەیان لێ وەربگرن. بەڵام ئەمەش لە هەموو شوێنێک و بۆ هەموو کەس وا نییە، چوونکە لە وڵاتە ڕۆژهەڵاتییەکاندا دۆخەکە بەم شێوەیە نییە. ئەمڕۆ بەرەی لاوی وڵاتی ڕووسیا بە بەختەوەرییەکی زیاترەوە سەرقاڵی ژیانی ڕۆژانەیانن. لەوێدا بە هۆی "لاوان"ەوە خەریکە دنیایەکی نوێ دەخولقێت و هەمووان باوەڕی تەواویان بە کارەکانی خۆیان هەیە. بەساڵاچووانی ئەو وڵاتە [پێشتر] یان لە سێدارە دراون یان دوور خراونەتەوە و ژمارەیەکی کەمی خەڵکیش لە برسان مردوون، هەر بۆیە لاوان لە داڕزین و گەندەڵیی بە دوورن و هیچ وەچەیەک بوونی نییە کە بتوانێت هاوشێوەی ئەوەی کە لە وڵاتە ڕۆژئاواییەکاندا ئەنجام دەدرێت لاوان ناچار بە ئاژاوەگێڕیی و بێگارییکردن بکات یان بە لانی کەمەوە لە سەر دوورێیانێکی هەڵبژاردندا بیانهێڵنەوە [بە واتایەکی تر، دوورێیانێکیان بخەنە بەر دەست و ناچاریان بکەن لەوەی کە یەکێکیان هەڵبژێرن]. ڕەنگە لە ڕوانگەی سەفسەتەکارێکی ڕۆژئاواییەوە بیروباوەڕی تاکێکی ڕووسیی وشک و ڕەق بێت، بەڵام گرینگ نییە با وا بڵێت. ئایا دەبێ لە دژی بوەستینەوە؟ ئەو لاوە داهێنەری دنیایەکی نوێیە کە لە سەر بنەمای حەز و داخوازەکانی خۆی بنیات نراوە و بێگومان کاتێک وەها دنیایەک هاتە ئاراوە، چینی مامناوەندیی ڕووسیا لەو خەڵکانەی سەردەمی پێش شۆڕشیش بەختەوەرتر دەکات. پێناچێت لەم سەردەمەدا ڕۆشنبیرە سۆفستاییەکانی دنیای ڕۆژئاوا بتوانن بەختەوەر بن و، دەبێ ئەوەش قبووڵ بکەین کە سەبارەت بەم پرسانە هیچ زۆرەملێیەک لە ئارادا نییە. بە ئەنجامدانی تاقیکردنەوەیەکی کردەیی (پراکتیکی)[٨٨]، ڕاستیی بیر و باوەڕی گەنجانی ڕووسیی دەسەلمێنرێت، ئەڵبەتە ئەمە لە کاتێکدا ڕاستیی لە خۆ دەگرێت کە نەمانەوێت بە هۆی کرچوکاڵییەوە تاوانباری بکەین و بابەتەکە بە پێی بنەما تیۆرییەکانەوە بخەینە بەر ڕاڤە و لێکۆڵینەوەوە.

٨٨ - Pragmatic test؛ تاقیکاریی کردەیی پیرس، جیمز و دیوی. پیرس لەو باوەڕەدایە کە بۆ لێکۆڵینەوە و دۆزینەوەی چەمکی فکریی پرسێک، دەبێ تەنها خوێندنەوە لە سەر ئەو شتانە بکرێت کە دەرەنجامی تاقیکردنەوە کردەییەکانن و کۆی دەرەنجامە کردەییەکانی هەر چەمکێک، بۆچوونی ئێمە لە سەر ئەو چەمکە پێک دێنێت.

دەبێ دان بەوەدا بنێین کە لە هیندستان و چین و ژاپۆندا هەلومەرجی سیاسیی ئەو وڵاتانە پێوەندییەکی تەواوی بە بەختەوەریی بەرەی لاو و ڕۆشنبیرەوە هەیە و ئەو جۆرە لەمپەرانەی کە لە وڵاتانی ڕۆژئاوادا هەن لەو وڵاتانەدا بوونیان نییە. لەوێدا هەندێ کار و چالاکیی برەویان هەیە کە بە لای بەرەی "لاو"ەوە زۆر گرینگن و کاریگەرییەکی زۆریشی لە سەر بەختەوەرییاندا هەیە. ئەوان بەو شێوەیە بیر دەکەنەوە کە دەورێکی گرینگیان لە ژیانی نیشتمانیی [وڵاتەکەیاندا] هەیە و بە دوای ئامانجگەلێکەوەن کە سەرەڕای هەموو کێشە و گرفتەکانیش دەتوانن پراکتیزەیان بکەن.

ڕەشبینیی باوی ناو خەڵک و ژنانی ڕۆشنبیری ڕۆژئاوا، لە دوو هۆکاری تەمەڵیی و بێهێزییەوە سەرچاوە دەگرێت. ئامادە نەبوونیان لەو کار و بارانەی کە دەتوانن دەوریان تێدا ببینن و کاریگەرییان هەبێت، ئەم هەستە لای تاکەکان دروست دەکات کە هەرگیز کارێکی ئەوتۆیان ئەنجام نەداوە [و لە ڕاستییدا هیچ کارێکی بایەخداریان ئەنجام نەداوە]. بە هۆی حەز کردنیان لە ئاسوودەیی و تەمەڵییەوەیە کە هەوڵی کەمکردنەوەی سەختیی و کێشەکانیان دەدەن. لە ڕۆژهەڵاتدا ئەکادیمییەکان [بە خوێندکار و مامۆستاوە] هەوڵ دەدەن بە سەر ڕای گشتییدا زاڵ ببن، لە کاتێکدا ئەم زاڵبوونە لە ڕۆژئاوادا نابینرێت. دیارە گومان لەوەدا نییە کە «بەڕۆژئاواییبوون» سەرچاوەی داهاتێکی زۆرە و هەر ئەم پرسە ئەگەر بایەخیشی پێ نەدرێت یان کاریگەرێتییەکەی لێ بسەنرێتەوە، دیسانەوە تاکەکان دابەش دەکات بە سەر گرووپگەلی چاکسازیخواز (ڕیفۆمخواز) یان بە پێچەوانەوە شۆڕشگێڕ و یاخیی. بەختەوەریی ئەم گرووپانەش بەندە بە کاری بەکۆمەڵەوە، یان بە واتایەکی دیکە جموجۆڵی بەکۆمەڵ، بەڵام لەم هەلومەرجەدا تەنانەت ئەگەر تاک لەم پێناوەشدا لە ناو بچێت، زیاتر لە ڕەشبینەکانی ڕۆژئاوا لە حەقیقەتی بەختەوەریی بەهرەمەند بووە. هێشتاکەش ئەو لاوە چینییەم لە بیر نەکردووە کە لە پۆلێکدا وانەمان دەخوێند: زۆر حەزی لەوە بوو پاش گەڕانەوەی بۆ وڵاتەکەی خۆی، قوتابخانەیەک لە دژی فێرکارییە کۆنەپەرستانەکانی ئەم شوێنە نالەبارە بکاتەوە. هەر چەند ئەگەری دۆڕاندنی لەم کارەدا زۆر بوو بەڵام چوونکە ئەو ئامانجە بەختەوەریی لێ دەکەوتەوە، هەستی ئێرەیی منی دەورووژاند.

مەبەستم ئەوە نییە بڵێم بەدەستهێنانی زێدەڕۆیانەی بەختەوەریی، تەنها بۆ ئەو کەسە کەم و دەگمەنانە لە تواناداپە کە خاوەنی بەهرە و توانایی و حەزێکی لە ڕادەبەدەر بن کە دیارە ژمارەشیان ئەوەندە زۆر نییە. تەنها بیرمەندان و سیاسەتوانە گەورەکان نین کە لە کارەکانیاندا سەرکەوتن بە دەست دێنن و بەهرە لە چێژە ڕۆحییەکان وەردەگرن و دەتوانن لە ڕێڕەوی بەختەوەرییدا بە دوای ئامانجەکانیاندا بڕۆن. کەسانێکیش کە بتوانن لە ڕێگەی خۆ تەیارکردن و [جێبەجێکردنی] ئەرک و ڕاسپاردەکانەوە، خۆیان لەگەڵ سیستمی کۆمەڵایەتییدا بگونجێنن؛ ئەگەر چاوەڕێی چەپڵە و مەدح و ستایشی خەڵک نەکەن، بە ئاسانیی سوود و چێژی کار و چالاکییەکانیان وەردەگرن.

پیاوێکم دەناسی کە هەر لە سەرەتای لاوییەوە هەر دوو قاچەکەی لە دەست دابوو و سەرەڕای ئەوەش بە درێژایی ژیانی، بە ڕاستیی کەسێکی بەختەوەر بوو. ئەو بە نووسینی کتێبێک سەبارەت بە نەخۆشییەکانی "گوڵەباخ" لە پێنج بەرگدا، ئەم ڕاستییەی بە تەواوەتیی سەلماند. جیا لەوەش لەگەڵ چەند کەسێکی شارەزای سەدەف (گوێچکەماسیی) دا ناسیاوییم پەیدا کرد کە چاوپێکەوتنیان هەمیشە ئەو باوەڕەی لە بوونمدا بەهێز دەکرد کە بە ڕاستیی دڵخۆشن بە لێکۆڵینەوە لە سەر گوێچکەماسیی و چێژ لەو کارەیان دەبینن. هەروەها کەسێک دەناسم کە سەردەمانێک باشترین ئاوازدانەری جیهان بوو و هەمیشە لە لایەن ئەو خەڵکانەوە کە خۆیان بەتوانا بوون لە بواری مۆسیقا و ئاوازدا، ڕێزی زۆری لێ دەگیرا و خۆشیان دەویست. ئەم هونەرمەندە بەختەوەرە نەک بە هۆی ستایش و پیاهەڵدانەکانی ئەو خەڵکەی کە وردبینانە و شێلگیرانە ڕێز لە بەرهەمە هونەرییەکان دەگرن دڵی خۆش دەبوو، بەڵکوو وەکوو ئەو سەماکارە بەرجستانەی کە چێژ لە پرۆڤەکانیان دەبینن، چێژی لە کارەکەی خۆی دەبینی. دیسانەوە کەسانێکیشم دەناسی کە لە هەندێ کاری ورد و ناسکی وەک ناسینی خەتی "نەستووریی" و "بزماریی"، کە ئەمڕۆ تا ڕادەیەکی زۆر لە بیر کراوە و کەڵکی نەماوە، ئەوپەڕی هەوڵ و تەقەلایان دا و هەر چەند زانیارییەکی تەواوم لە سەر ژیانیان دەست نەکەوت، بەڵام دڵنیام دڵیان بە هەموو دۆزینەوەیەکی تازە خۆش بووە و کارەکانیان سووکناییان پێ بەخشیون.

دەنگۆی ئەوە هەیە لە چاخی "ماشێن"دا پسپۆڕانی کار و پیشە دەستییەکان وەکوو ڕابردوو بەختەوەر نین. من بە هیچ شێوەیەک لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا نیم. ئەمڕۆ کرێکارانی لێهاتوو و شارەزا، لە بوارگەلێکدا کار دەکەن کە لە چاخەکانی ناوەڕاستدا لە لایەن پسپۆڕانی پیشەسازییەوە، دانی خێریان پێدا نەدەنرا. بەڵام ئەو پیشەکار(سەنعەتکار)انەی کە بە وردبینییەوە کارەکانیان ئەنجام دەدەن، هێشتا دەورێکی گرینگ و بەرچاویان لە «ئابووریی ماشێنیی»دا هەیە. ئەوان کەسانێکن کە ماشێن و ئامێرگەلی هەستیار دروست دەکەن. هەندێکیان داڕێژەر (=دیزاینەر)ن و هەندێکی تریشیان پسپۆڕییان لە بواری فڕۆکە و لێخوڕین[ی ئۆتۆمبیل]دا هەیە و ژمارەیەکی زۆری تریش بە خستنەڕووی بیروڕاگەلی باش و بەسوود و کەڵکوەرگرتن لە توانا و شارەزایی خۆیان، گەشە بە پیشەسازیی دەدەن و بەرەو پێشەوەی دەبەن. بە ڕای من جووتیاران و گوندنشینانی کۆمەڵگا بچووکەکان، هێندەی شۆفێر، یان ئەندازیارێکی ماشێن (مەکینە) بەختەوەر نین. ڕاستە جووتیارێک بە پێی پێویست لە کێڵگەکەیدا چەند کاری جۆراوجۆر ئەنجام دەدات و بۆ نموونە زەوی دەکێڵێت، تۆ دەچێنێت، دروێنە دەکات و خەرمانەکەی دەکوتێت، بەڵام بەردەوام لە بەردەم مەترسیی ئەو بەڵا سروشتییانەدایە کە خۆی هیچ دەورێکی تێیاندا نییە. کەسێک کە کار بە دەزگا و ئامێرە میکانیکییە تازەکان دەکات بە گوێرەی هێز و توانیەکانی خۆی لەوە بەئاگایە کە مرۆڤ بە سەر هۆکارە سرووشتییەکاندا زاڵە و نابێتە کۆیلەیان. ئەڵبەتە بێگومان ئەم کارە بۆ زۆربەی ئەو کەسانەی کە تەنها کاری ماشێنیی دەکەن هێندە سەرنجڕاکێش و دڵخۆشکەر نییە، چوونکە زۆربەی ئەو کارە میکانیکییانە بەردەوام دووپاتە دەبنەوە و کارێکیش کە بە ماشێن ئەنجام دەدرێت، کەمتر سەرنجڕاکێشە. دوا ئامانجی بەرهەمهێنانی ماشێنیی، کە لە ڕاستییدا هێشتا نەگەیشتووینەتە دوا قۆناغەکانی، شێوازێکە کە هەندێ کاری نائاسایی پێ ئەنجام بدەین، چوونکە مرۆڤ حەزی لە ئەنجامدانی کاری فرەچەشن و جۆراوجۆرە.

پێش قۆناغی کشتوکاڵ و ئەو سەردەمانەی کە دابینکردنی پێداویستییەکان، پەرێشانیی و خەمۆکیی لێ دەکەوتەوە، مرۆڤ بە هەڵبژاردنی ژیانی کشتوکاڵیی بڕیاری دا بۆ کەمکردنەوەی مەترسیی وشکەساڵیی و برسێتیی، خۆی ڕادەستی ڕۆتین و شەکەتیی بکات. کاتێک مرۆڤەکان لە ڕێگەی ڕاوکردنەوە خواردنی خۆیان دابین دەکرد، کارکردنیان بە لاوە

زۆر خۆش و دڵبزوێن بوو و ئێمەش دەتوانین بە چاوخشاندنێک لە ژیانی ئەو دەوڵەمەندانەی کە هێشتا کار و پیشەی باوباپیرانیان - واتە کشتوکاڵ - وەک سەرگەرمیی و بۆ کەیفخۆشیی ئەنجام دەدەن، ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەکەوێت. بە دەسپێکردنی قۆناغی کشتوکاڵ، مرۆڤ پێی نایە قۆناغی درێژخایەنی پەستیی، ناجوامێریی، زەبوونیی، بەدبەختیی و شێتییەوە کە تەنها لە سایەی قۆناغی "ماشێن"ەوە دەتوانین لەم نەهامەتییانە ڕزگارمان بێت. ئەڵبەتە بۆ کەسانی هەستیار و دڵناسک، باسکردنی کاریگەریی پێوەندیی نێوان مرۆڤ و خاک و زەویی، شتێکی سەرنجڕاکێشە. بەڵام تەنها حەزی بەردەوامی هەموو لاوێکی گوندنشین ئەوەیە کارێک لە شاردا بدۆزێتەوە تا بتوانێت لە کۆتوبەندی کۆیلایەتیی "با" و "هەوا" و "شەوەزەنگ"ی زستانان ڕزگاری بێت و پەنا بەرێتە بەر شوێنە ئارام و سووکناییبەخش و مرۆییەکانی کارخانە و سینەما. هاودەمیی و هاوقسەبوون لەگەڵ دیتران و هاوکاریکردنی یەکتریی، یەکێکە لە هۆکارەکانی بەختەوەریی تاکەکان و ئەم جۆرە هۆکارانەش لە ژیانی پیشەسازییدا ئاسانتر لە ژیانی کشتوکاڵیی دەستەبەر دەبن.

باوەڕمەندیی بە ئامانجێکی فکریی بۆ زۆربەی تاکەکانی مرۆڤ بە بەختەوەریی لە قەڵەم دەدرێت. دیارە مەبەستم تەنها کەسانی شۆڕشگێر و سۆسیالیستەکان و ناسیۆنالیستەکانی وڵاتانی داگیرکراو و... نییە، مەبەستەکەی من تەنانەت ئەوانەش دەگرێتەوە کە بیر و باوەڕگەلی سادە و ئاساییان هەیە. کەسانێک دەناسم کە لەو باوەڕەدا بوون بەریتانییەکان یەکێک لە ١٠ خێڵە ونبووەکەی سەردەمی دابەزینی **تەورات** بوون و هەر بۆیەشە لەم ڕووەوە هەمیشە خۆشحاڵیی خۆیان دەردەبڕی، لە کاتێکدا ژمارەی ئەو کەسانەی کە پێیان وا بوو بەریتانییەکان بە ڕەچەڵەک سەر بە دوو خێڵی "ئەفریم" و "ماناسێ" بوون، هێندە زۆر بوو هەر نەبێتەوە. من پێشنیار دەکەم خوێنەر دەبێ ئەم جۆرە باوەڕانە قبووڵ بکات چوونکە نامەوێ داکۆکیی لە بەدەستهێنانی ئەو جۆرە بەختەوەرییانە بکەین کە لە سەر بنەمای باوەڕگەلی نادروست ڕاوەستاون و هەر بۆیەشە پێداگریی لە سەر ئەوە ناکەم خوێنەر ئەوە باوەڕ بکات کە تاکەکانی مرۆڤ، تەنها بە گرتنەبەر و شوێنکەوتنی شێوازی ژیانی سەرەتایی، بەختەوەر دەبن. هەر چەند من بە پێی زانیاریی و خوێندنەوەکانم پێم وایە باوەڕێکی لەو جۆرە، مسۆگەری بەختەوەرییەکی ڕاستەقینە دەکات بەڵام بە ئاسانیی دەتوانین لەوە تێ بگەین کە

هەندێ ئامانجیش هەن هەرگیز خەونئاسا و سەرسووڕهێنەر نین و کەسانێک کە ڕاستگۆیانە باوەڕیان بەم جۆرە ئامانجانە هەیە، لە ڕاستییدا بە قەدەر پێویست بواریان بۆ کات ڕابواردن و کەیفخۆشیی خۆیان ڕەخساندووە. یەکێک لە کاریگەرییەکانی ئەم تێگەییشتنە دروستە، لانیکەم ئەوەیە کە پێمان وا بێت ژیان شتێکی پووچ و بێمانا نییە.

دڵخۆشبوون بە کارێکیش کە زەوقمان لە سەری بێت، تا ڕادەیەکی زۆر لە گیرۆدەییەکی خەست بەرانبەر بە ئامانجێکی دیاریکراو دەچێت. یەکێک لە گەورەترین بیرکاریزانەکانی هاوچەرخ، تەمەنی خۆی بە ڕێژەیەکی یەکسان بۆ بیرکاریی و کۆکردنەوەی پوولی پۆست (تەمر) تەرخان کردبوو و پێم وایە کارەکەی دووهەمیان [واتە کۆکردنەوەی پوولی پۆست] هۆکارێکی سووکناییبەخش و هێورکەرەوە بووە بۆ ئەو کاتانەی کە نەیتوانیوە لە کارە سەرەکییەکەیدا [واتە بیرکاریی] پێشکەوتن بە دەست بێنێت. کێشەی سەلماندنی پرسە ژمارەییەکان، تاقە خەم و خەفەتێک نییە کە تەنها کۆکردنەوەی پوولی پۆست چارەسەری بکات و پوولەکانیش تاقە شتانێک نین کە بتوانرێت کۆ بکرێنەوە. بۆ چەند چرکەیەک بیر لە [وڵاتی] چینی کۆن، قوتووەکانی داودەرمان، دراوە ئاسنینەکانی ڕۆم، دەسخەتی بزماریی، بەردی چەخماخ و کەرەسەکانی تری ژیانی سەرەتایی بکەنەوە تا بزانن چ دەرەتانێکی بەرفراوان بۆ بیرکردنەوە و چوونەناو دالغەوە لە ئارادایە.

بێگومان ئێمە پلەوپایەیەکی هێندە بەرزمان هەیە کە ناتوانین خۆمان بەم چێژە سادانەوە سەرقاڵ بکەین و ڕەنگە هەمووومان بە منداڵیی ئەم کارانەمان تاقیی کردبێتەوە، بەڵام پێمان وایە شایستەی کەسێکی باڵق و گەورە نین. بەڵام ئەمە بۆچوونێکی تەواو هەڵەیە چوونکە دەبێ بایەخ بە هەموو ئەو چێژ و خۆشییانە بدرێت کە زیان بە کەسانی دیکە ناگەینن. من خۆم ڕووبارەکانم زۆر خۆش دەوێ.

من چێژ لەوە دەبینم لە "ڤۆلگا"وە[٨٩] بچمە خوارەوە، یان لە "یانگ تێس"ەوە[٩٠] سەر بکەوم و بە داخەوەم بۆ ئەوەی کە ئامازۆن[٩١] و "ئۆرینۆکۆ"م[٩٢] نەبینیوە و، هەرگیزیش شەرم لەم هەستە

٨٩ - Volga؛ ڕووبارێکە لە وڵاتی "یەکێتی سۆڤییەت"دا کە دەڕژێتە دەریای "خەزەر" (قەزوین)ەوە.
٩٠ - Yangtes؛ ڕووبارێک لە وڵاتی "چین"دا کە لە دەریای زەردەوە سەرچاوە دەگرێت.
٩١ - Amazon؛ ڕووبارێکی گەورە و پڕئاو لە "ئەمریکای باشوور"دا کە تاڤگەکانی بەناوبانگن.

سادە و ساکارانە ناکەم. دەتوانن بەبێ هیچ دەمارگیرییەک، سەرنجی چێژ و خۆشیی تەماشاچییەکی یاریی بەیسباڵ بدەن. ئەو بە حەز و تاسەیەکی زۆرەوە چاو لە ڕۆژنامەکانیش دەکات و هێشتا ڕادیۆ بە لایەوە خۆشترین و ورووژێنەرترین ئامێرە.

هەرگیز ئەو ڕۆژە لە بیر ناکەم کە بۆ یەکەم جار نووسەرێکم بینی. پیاوێک کە من بە هۆی کتێبەکانییەوە پێم وا بوو ژیانێکی سەرتاپا خەم و خەفەت و خەمۆکیی تێ دەپەڕێنێت، بە ڕێکەوت لە چرکەساتێکدا کە ئەنجامی پێشبڕکێی یاری بەیسباڵ لە ڕادیۆوە ڕاگەیەنرا، لە تەنیشمدا بوو. ئەم نووسەرە، من و ئەدەبیات و هەموو خەمەکانی لی بیر کرد و کاتێک ئەو تیپەی خۆشی دەویست سەرکەوتنی بە دەست هێنا و بردییەوە، هەموو بوون و ناخی بوو بە شادی و خۆشیی. پاش ئەو بەسەرهاتە هەر کاتێک بەرهەمێکی ئەو نووسەرە دەخوێنمەوە، چیدی لە بەدبەختیی و نەهامەتییەکانی قارەمانانی ناو چیرۆکەکانی هەست بە خەم و خەمۆکیی ناکەم.

پێویستە ئەمەش بڵێم کە زۆربەی کات کارە سەرگەرمیی و کەیفخۆشییەکان سەرچاوەی سەرەکیی بەختەوەریی نین و تەنها بە ئامرازگەلێک دێنە ئەژمار بۆ هەڵاتن لە بارودۆخێک کە بەرەوڕووبوونەوەیان خەم و خەفەت و سەرکوێرییان لێ دەکەوێتەوە. لە ڕاستییدا بەختەوەریی ڕاستەقینە زیاتر بەندە بە حەزی مرۆڤ بەرانبەر بە کەسانی چواردەور و شتومەکەکانی دنیای دەوروبەریەوە. حەزێکی هاوڕێیانە بەرانبەر بە تاکەکان خۆی جۆرێکە لە میهرەبانیی. مەبەستم لەو حەزە نییە کە لە تەماحکاریی و قازانجخوازییەوە سەرچاوە دەگرێت و هەمیشە بە دوای دەسکەوتێکدا دەگەڕێت. وەها حەزلێکردنێک کە بەختەوەریی لێ بکەوێتەوە، دەبێتە هۆی ئەوە کە تاک بەردەوام بیر لە حاڵ و باڵ و تایبەتمەندییەکانی هزری دیتران بکاتەوە و لەوانەشە هەوڵی سوودمەندکردنی ئەو کۆمەڵگایانەی کە پێوەندییان پێیەوە هەیە، ببێتە دوا ئامانجی ئەو. دیارە ئەمەش لە کاتێکدا قابیلی دەستەبەربوونە کە تاک هەست بە دەسەڵاتداریی و سەرۆکایەتیی نەکات و چاوەڕێی پیاهەڵدان و ستایشی کەس نەکات. لەو کاتانەدا کە ڕەفتاری تاک لەگەڵ دیتراندا بە ڕاستییەکی ئاوا کۆتایی دێت، نواندنی سۆز و خۆشەویستیی دوولایەنە دەبێتە هۆی بەختەوەریی.

---

٩٢ - Orinoco؛ ڕووبارێکە لە نێوان بەرازیل و "کۆلۆمبیا"دا.

ئەم سنووری پێوەندییە ئەگەر پانتاییەکی کەم یان زۆر بگرێتەوە، بە هەر حاڵ لە پێناوی حەز و بەرژەوەندییەکاندا ڕێگایەکی بڕیوە کە هەرگیز ئەمەگنەناسیی و ڕەفتاری نەشیاوی دیتران ناتوانێت هاوسەنگییە ئاقڵانە ڕۆحییەکەی تێک بدات و بە دەگمەن ئەگەری ئەوە لە ئارادایە بە ڕەنج و ئازار کۆتایی پێ بێت.

دەرکەوتنی ئەم جۆرە دیاردانە هەندێ کەس تا ئاستی تەقینەوە تووڕە دەکات، لە کاتێکدا ئەمە بۆ خەڵکی میهرەبان مایەی شادیی و کەیفخۆشییە. تاکی میهرەبان بەبێ هیچ یارمەتییەکیش بە هەندێ ئەنجام و دەسکەوتی وا دەگات کە کەسانی تر تەنانەت بە هەوڵ و تێکۆشانێکی زۆر و شێلگیرانەش چاوەڕێی بەدیهاتنیان ناکەن. تاکی بەختەوەر هەمیشە هاودەمێکی ڕووخۆشە و، تەواو ڕوون و ئاشکراشە کە بۆچی بەختەوەرییەکەی بەردەوام ڕوو لە زیادبوونە. ئەڵبەتە ئەم جۆرە ڕەفتارانە دەبێ هەمیشە دوور لە ڕیاکاریی و خۆدەرخستن بن و ڕاستگۆیانەش بن و لە هەستی بەرپرسیارێتیی و لەخۆبوردووییەوە سەرچاوە بگرن. هەستی بەرپرسیارێتیی لە کاردا زۆر گرینگە بەڵام لە پێوەندییە دۆستانەکاندا شتێکی جاڕسکەر و ئازاردەرە و زۆربەی خەڵک شەیدای ئەوەن خۆشیان بوێن؛ ئەڵبەتە خۆشویستنێک کە بە ترس و لە بەر پێویستیی نەبێت.

توانای خۆشویستنی تاکەکانی دیکە، گەورەترین کۆڵەکەی بەختەوەرییە.

من لەم ڕستە دواییانەدا ئاماژەم بە خۆشویستنی شتومەکەکان کرد. ڕەنگە ئەم ڕستەیە نائاسایی بێتە بەر چاو. ڕەنگە هەندێ کەس پێیان وابێت حەزکردن لە شتومەکەکان و خۆشویستنیان شتێکی مەحاڵە، بەڵام دەتوانین حەزی زەویناسێک بەرانبەر بە تاشە بەردەکان، یان حەزی شوێنەوارناسێک بەرانبەر بە شوێنەوارە وێرانەکان بە بەڵگەی ئەم ڕاستییە بزانین کە کارەکەیان لە حەزێکی دۆستانە دەچێت؛ تەنانەت دەبێ بڵێین ئەم حەزە بە واتا ڕەهاکەیەتی کە لە بناغە و بنەڕەتی چۆنیەتیی و شێوازی هەڵسوکەوتمان لەگەڵ تاکەکان و کۆمەڵگاکانی چواردەوریشمانی تێ پەڕاندووە. دیارە دەبێ ئەوەش بزانین کە هەندێ جار خەسڵەتە مرۆییەکان، وا لە مرۆڤ دەکەن حەز لە هۆکارە زیانبەخشەکان بکات. ڕەنگە تاکێک بە هۆی بێزهاتنەوەی لە تاڵی جاڵجاڵۆکە وای لێ بکات حەز لە توێژینەوە لە سەر جاڵجاڵۆکە بکات تاکوو بتوانێت شوێنی ژیانی خۆی لە جێیەکدا سەقامگیر بکات کە هێندەی بکرێت لەو گیانەوەرە دوور بێت. بەڵام ئەم جۆرە حەزە هەرگیز ناگاتە ئاستی ئەو ڕەزامەندیی و دڵخۆشییەی کە

زەویناسێک لە تاشە بەردەکانەوە بە دەستی دێنێت. هەر چەند شتومەکەکان گرینگییەکی تایبەتیان لە ژیانی ئێمەدا هەیە، بەڵام هەرگیز حەزلێکردنیان ناگاتە ئاستی ڕەفتاری دۆستانەمان لەگەڵ هاوڕەگەزەکانماندا. دیارە پانتایی هێز و تواناکانی مرۆڤ سنووردارە. ئەگەر بەختەوەریی ئێمە بە تەنها خۆمان بگرێتەوە [و تەنها بیر لە خۆمان بکەینەوە] دیارە چاوەڕەوانیی زیاترمان لە ژیان دەبێت و زیاتر لەوەمان دەوێت کە پێی بەخشیوین و کەواتە بەم دەرەنجامە دەگەین کە فرەخوازیی، یەکێک لە هۆکارە کاریگەرەکانی کەمبوونەوەی هەستکردن بە بەختەوەرییە. کەسێک کە بتوانێت خەمەکانی بە حەزلێکردنێکی ڕاستگۆیانە بەرانبەر بە هۆکارێکی دڵخۆشکەر لە بیر بکات، لە کاتی سەرقاڵبوون بەو کار و هۆکارەی کە حەزی لێیەتی، سووکنایی و هەروەها هاوسەنگییەکی ئەوتۆی ڕۆحیی بە دەست دێنێت کە لە هێرشی کێشە و گرفتەکان ناترسێت و هەست بە نزیکایەتیی لەگەڵ کارەکەیدا دەکات چوونکە ڕاستییەکی تاقیی کردۆتەوە.

نهێنیی بەختەوەریی لەوەدایە کە لێگەڕێین حەز و وابەستەییەکانمان بە قەدەر پێویست زیاتر ببن و پەرچەکردارییەکانیش لە هەمبەر شتومەک و ئەو کەسانەی کە خۆشمان دەوێن، دۆستانەتر بن وەک لەوەی دوژمنانە بن!

لە بەشەکانی دواتردا درێژە بەم لێکۆڵینەوە سەرەتاییەی سەبارەت بە داگیرکردنی بەختەوەریی دەدەم و ڕوونکردنەوەی زیاتری لە سەر دەکەم و سەبارەت بە هەڵاتن لە هۆکارەکانی بەدبەختیی لە ڕوانگەی دەروونناسییەوە چەند پێشنیارێک دەخەمە ڕوو.

١١

## حەز و ویست

لەم بەشەدا بە تەمام مشتومڕ لە سەر حەز و ویست بکەم، چوونکە لەو باوەڕەدام حەز و ویست بەرچاوترین و شازترین هۆکارە لە ناو هۆکارەکانی بەختەوەرییدا.

باشترین نموونەیەک کە بۆ ناسینی حەز و ویست دەتوانم بیخەمە ڕوو، ئەو حەز و ویستەیە کە مرۆڤ ڕاکێشی سەر سفرەی نانخواردن دەکات. ئەگەر بە وردیی لەم جۆرە ویستە بکۆڵینەوە بۆمان دەردەکەوێت کە سەرجەم تایبەتمەندییەکانی «ویست/مەیل»ی لە ناو خۆیدا کۆ کردۆتەوە.

با تۆزێک مشتومڕ لە سەر ئەو حەزە بکەین کە مرۆڤ ڕاکێشی سەر سفرەی خواردن دەکات. کەسانێک هەن کە هیچ خۆشیی و ڕەزامەندییەک بەرانبەر بە خواردن دەرنابڕن و لەوانەیە خواردن بە لایانەوە ناخۆش بێت. ئەمانە کەسانێکن کە هەمیشە خۆشترین و بەتامترین جۆری خواردنیان بۆ ئامادە کراوە و هەرگیز هەستیان بە برسێتیی نەکردووە. ئەمانە ئەگەر ئازاری برسێتییان چەشتبایە، ئێستا لە مانای حەزی خواردن تێ دەگەییشتن. ئەمانە خواردن بە شتێکی ناخۆش دەزانن و ئەمەش دەرەنجامی شێوازی هەڵسوکەوتی کۆمەڵگاکەیانە لە بەرانبەر خواردندا. دەبێ بەم کەسانە بڵێین کە خواردن شت [یان کار]ێکە دەبێ حەتمەن ئەنجام بدرێت و نابێ بە لالووتیی و نابەدڵییەوە بەرەوڕووی ببینەوە.

دیارە ناتوانین بڵێین هەموو تاکەکانی کۆمەڵگا بەم شێوەیە حەزیان لە خواردن نییە، چوونکە کەسانێک هەن بە ناچاریی و نەک بە ویستی خۆیان ئەو تەسەورەیان لە سەر خواردن لە لا دروست دەبێت. بۆ نموونە کەسانی پیر و پەککەوتە کە پزیشک ڕێی خواردنی چەند

خواردنێکی دیاریکراویان پێ دەدات، یان ڕێگەی خواردنی هەندێ شتیان پێ نادات و تەنها دەتوانن چەند خواردنێکی کەم بخۆن کە وزەیان بۆ دابین بکات و دیارە ئەم جۆرە کەسانە هەستێکی ناخۆشیان بەرانبەر بە خواردن لە لا دروست دەبێت.

بێجگە لەو نموونانەی سەرەوە کە باسمان کردن، تاکەکان بە گشتیی بە چەند شێوازێک بەرەوڕووی خواردن دەبنەوە کە هەوڵ دەدەین بە کورتیی ئاماژەیەکیان پێ بکەین.

**١)** کەسانی زۆرخۆر و نەوسن کە بە حەز و تاسەیەکی ئێجگار زۆرەوە لە سەر سفرە دادەنیشن و هەڵپەهەڵپ دەست بە خواردن دەکەن، بەڵام پاش ئەوەی کە بە تەواوەتیی تێر بوون و زگیان ئاخنی، تازە بۆیان دەردەکەوێت کە ئەو خواردنە نەبووە کە حەزیان لێیەتی، یان ئەگەریش هەر ئەو خواردنە بێت [کە حەزیان لێیەتی] بە دڵی ئەوان لێ نەنراوە.

**٢)** کەسانی زۆرخۆر و نەوسن کە بەوپەڕی حەز و تاسەوە لە سەر سفرە دادەنیشن و بەبێ گوێدانە ئەوەی کە چی دەخۆن و چی ناخۆن، ئەوەندە خواردن دەکەنە گەدەیانەوە کە جێی هەناسەدانیان بۆ نامێنێتەوە.

**٣)** کەسانێک کە بە مرخ و ئارەزوویەکی تەواوەوە لە سەر سفرە دادەنیشن و زۆر بەئەدەبانە دەست بۆ خواردنەکان ڕادەکێشن و چێژی زۆریش لە خواردنەکەیان دەبینن. ئەم کەسانە پاش ئەوەی کە بە قەدەر پێویست تێریان خوارد، واز لە خواردن دێنن چوونکە چێژی خواردنیان لە زۆرخۆریی پێ باشترە.

کەسانێکیش کە لە سەر سفرەی ژیاندا دانیشتوون، تا ڕادەیەکی زۆر لەو کەسانە دەچن کە خواردن دەخۆن. دیارە پێویست بە ڕوونکردنەوە ناکات دوایین گرووپ [واتە گرووپی ٣] کەسانێکن کە چێژ لە خواردن وەردەگرن و لە ژیان [ی ڕۆژانەشیاندا] بەرەوڕووی سفرەی ژیان دەبنەوە و کەڵکی لێ وەردەگرن.

شتێک کە زۆر سەرنجڕاکێشە ئەوەیە هەموو ئەو کەسانەی کە دەکەونە خانەی «لۆمە کراوەکان»ەوە، گاڵتە بەو کەسانە دەکەن کە مرخ و ئارەزووی باشیان هەیە و چێژ لە خواردن وەردەگرن و خۆیان بە سەرتر لەوان دەزانن. بە ڕای ئەوان چێژ وەرگرتن لە خواردن بە هۆی برسێتییەوە، پەستیی و ڕەزالەت و زەبوونیی ئەو کەسانە دەگەینێت.

ئەم بۆچوونە ڕێک وەک ئەوە وایە کە سوودمەندبوون لە ژیان بە شتێکی سووک و بێبایەخ بزانیت تەنها لە بەر ئەوەی کە دیمەنگەلی جوان و سەرنجڕاکێش و ئەزموونگەلی سەرسووڕهێنەری تێدایە. ئەم کەسانە لە لووتکەی بیرۆکە هیچ و پووچ و خەیاڵییەکانی خۆیانەوە تەماشای خوارەوە دەکەن و خەڵکی تر بە گەمژە و نەزان لە قەڵەم دەدەن و سووکایەتییان پێ دەکەن. من بە هیچ شێوەیەک لەگەڵ ئەم جۆرە بیر و بۆچوونەدا نیم. بە ڕای من خۆقەتیسکردن جۆرێکە لە نەخۆشیی کە لە ڕاستییدا هەندێک کات ناکرێت پێش بە ڕوودانی بگیردرێت بەڵام بە هەر حاڵ کاتێک کەسێک تووشی بوو، دەبێ بە زووترین کات چارەسەری بۆ بکرێت و نابێ بە نیشانەیەکی زانایی و شارەزایی لە قەڵەم بدرێت. بۆ نموونە کەسێک حەزی لە "شلیک"ە و کەسێکی تر حەزی لێ نییە. ئایا دەبێ کەسی دووهەم بە کەسێکی بەرز و باڵاتر لە قەڵەم بدەین؟ دیارە هیچ بەڵگەیەکی باوەڕپێکراومان بە دەستەوە نییە کە شلیک باشە یان خراپ. لە دیدی ئەو کەسەی کە حەزی لێیە باشە و لە دیدی ئەو کەسەشەوە کە حەزی لێ نییە باش نییە. بەڵام کەسێک کە حەزی لە "شلیک"ە، لە چێژ و خۆشییەک سوودمەندە کە کەسی دووهەم لێی بێبەشە. بەم هەڵسەنگاندنە سادەیەوە [بەو دەرەنجامە دەگەین کە] ژیانی کەسی یەکەم چێژبەخشتر و خۆشترە و باشتر دەتوانێت خۆی لەگەڵ بارودۆخی ئەو جیهانەدا بگونجێنێت کە هەر دووکیان تیایدا دەژین. ئەوەی کە لەم نموونە سادەیەدا بە شتێکی دروست دێتە بەر چاو، هەمان ئەو شتەیە کە سەبارەت بە پرسە گرینگەکانیش ڕاستیی لە خۆ دەگرێت. کەسێک کە چێژ لە تەماشاکردنی فووتباڵ دەبینێت، بە هەمان ڕێژە ژیانی لەو کەسە خۆشترە کە چێژی لێ نابینێت و کەسێکیش کە خوێندنەوەی کتێب خۆشحاڵی دەکات، زۆر لە پێشترە لەو کەسەی کە لەو ڕووەوە هیچ چێژێک نابینێت؛ ئەم کەسە تەنانەت زۆر لە پێشترە لەو کەسەی کە چێژ لە فووتباڵ دەبینێت، چوونکە دەرفەتی خوێندنەوە زیاترە و لە هەموو شوێنێکدا بۆ مرۆڤ دەڕەخسێت بەڵام فووتباڵ وا نییە. حەزکردن و سەرقاڵبوونی تاکەکان بە چەند کاروباری جۆراوجۆرەوە، هۆکارێکی یاریدەدەرە بۆ بەدەستهێنانی بەختەوەریی؛ چوونکە لەم حاڵەتەدا ناکامیی و ئنجا هەستکردن بە بەدبەختیی، بوونی نییە، چوونکە ئەگەر تەنانەت یەکێک لە کار [یان شت]ە حەزلێکراوەکان لە ناو بچێت، دەکرێت ڕوو لە یەکێکی دیکەیان بکرێت. ژیان کورتترە لەوەی کە مرۆڤ بتوانێت دڵ بە

هەموو شتێک خۆش بکات و خۆی پێیانەوە گرێ بدات، بەڵام وا باشترە هێندەی بۆمان بکرێت ڕێژەی ئەو شتانە زیاتر بکەین کە حەزمان لێیانە تا بە قەدەر پێویست ڕۆژەکانی ژیانمان بۆ پڕ بکەنەوە. کەم تا زۆر هەموو خەڵک تووشی نەخۆشی خودشەیداییین؛ بەڵام ئەم نەخۆشییە زیاتر لە کەسانێکدا کوشندەیە کە دنیا سەرەڕای ئەو هەموو دیمەن و خێر و بەرکەتەی پێی بەخشیوین نادیدە دەگرن و، زاق زاق تەماشای دەروونی پووچ و بەتاڵی خۆیان دەکەن. بە هەر حاڵ نابێ پێمان وا بێت کە هۆکارێکی باڵا و گرینگ دەوری لە بەدبەختیی ئەو کەسانەدا هەیە کە لە ناو خۆیاندان [واتە گۆشەگیرن].

سەردەمێک دوو ئامێر(مەکینە)ی دروستکردنی سۆسیس هەبوون کە گۆشتی بەرازیان دەگۆڕی بە "سۆسیس"ی زۆر بەتام و بەلەزەت. خاوەنی یەکێک لە ئامێرەکان بە حەز و ویستێکی لە ڕادەبەدەرەوە کاری دەکرد و ڕێژەیەکی زۆری "سۆسیس"ی باشی دروست دەکرد. بەڵام خاوەنی ئامێری دووهەم بیری لەوە دەکردەوە کە گۆشت شتێکی بێبایەخ و ناگرینگە. ئەو، ئامێرەکەی خۆی زۆر باشتر و سەرسووڕهێنەرتر لەوە دەزانی کە کاری دروستکردنی "سۆسیس"ی پێ ئەنجام بدات و هەر بۆیە وازی لە کڕینی گۆشت هێنا. دەستی کرد بە خوێندنەوەی دەروونی خۆی و دیارە بەو هۆیەشەوە لە دروستکردنی خواردنێکی سروشتیی بێبەش کرا. پاش ماوەیەک ئامێرەکەی هیچ کەڵک و فایدەیەکی نەما. سەرجەمی ئەم ئامێرە بەنرخە کە سەردەمانێک خواردنێکی خۆش و بەتامی دروست دەکرد، لە کار کەوت و خاوەنەکەشی دۆش دامابوو کە چی بکات و چی نەکات. ئامێری دووهەم ڕێک وەک کەسێکی لێ هات کە حەز و ڕەغبەتی خۆی لە دەست دابێت؛ لە کاتێکدا ئامێری یەکەم وەک کەسێکی لێ هاتبوو کە حەز و ڕەغبەتی خۆی پاراستبوو. مێشکی مرۆڤ ماشێنێکی سەرسووڕهێنەرە کە دەتوانێت چەندین کەرەسە و مەتریاڵی جۆراوجۆر پێکەوە تێکەڵ بکات و شتێکی باش و گونجاو و سەرسووڕهێنەریان لێ بەرهەم بێنێت. بەڵام هەر ئەم ماشێنە ئەگەر کەرەسە و مەتریاڵی لە دنیای دەرەوە پێ نەگات، تووشی ڕاوەستان و مەنگیی و ناکاراییی دەبێت و ڕێک وەکوو ئامێری دروستکردنی سۆسیس دەبێ کەرەسەی پێویست لە دەرەوە دابین بکات، چوونکە تەنها دوایین حەز و ویستێک کە بەرامبەر بە ڕووداوەکان دەردەبڕدرێت، وەکوو

شیکردنەوە و ڕاڤەکاریی لە مێشکدا دەمێنێتەوە. ئەگەر ڕووداوەکان لە لایەن هێزی خەیاڵ و هەستمانەوە گرینگییان پێ نەدرێت، هیچ سوودێکیشمان بە نسیب نابێت.

کەواتە کەسێک کە بەردەوام ئەسیری خودشەیداییە، بە گوێرەی پێوەرە کەسەکییەکانی خۆی، هیچ شتێک بەنرختر و گرینگتر لە خۆی نازانێت. بەڵام کەسێک کە زیاتر ئاوڕ لە دەرەوە دەدات، لەو چرکەساتە کەمانەیدا کە خوێندنەوە لە سەر دەروونی خۆی دەکات، بێگومان کۆمەڵێک بەشی جوان و ڕازاوە دەبینێت کە بە هۆی شیکاریی و پێکەوە گرێدانیانەوە دروست بوونە.

جۆرەکانی حەز و ویست هێندە زۆرن لە ژماردن نایەن. ئەگەر بە بیرتان بێتەوە شێرلۆک هۆڵمێس[٩٣] بە هەڵکەوت کڵاوێکی داکەوتوو لە سەر جادەی هەڵگرت. چەند چرکەیەک بە وردیی لێی ڕوانیی و وتی خاوەنی ئەم کڵاوە، پیاوێکی هەمیشە مەست (سەرخۆش)ە کە ژنەکەی چیدی وەک ڕابردوو خۆشی ناوێت. ژیان بۆ ئەو کەسانەی کە تەنانەت شتە ئاساییەکان ئەو هەموو دیمەن و دیاردە جوان و سەرنجڕاکێشانەیان پێشکەش دەکەن، هەرگیز وەڕسکەر نییە. بیر لەو دیمەنە جوانانە بکەنەوە کە ڕەنگە لە ماوەی پیاسەکردن لە گونددا سەرنجتان ڕابکێشن. ڕەنگە کەسێک حەزی لە پەلەوەرەکان بێت، ئەوی تر حەزی لە سروشتی سەوز و ئەوی دیکە جوغرافیا و ئەوی دیکەش کشتوکاڵ و...، هەر کام لەمانە کە سەرنجی کەسێک بەرەو لای خۆی ڕابکێشێت، خۆی لە خۆیدا جوان و دڵڕفێنە و شتەکانی دیکەش حەزێکی یەکسان دێننە ئاراوە. کەسێک کە حەزی لە هەر کامەیان بێت باشتر دەتوانێت خۆی لەگەڵ چواردەوریدا بگونجێنێت وەک لەو کەسەی کە وەها حەز و ئارەزوویەکی نییە. جۆری هەڵسوکەوتی تاکەکان لەگەڵ یەکدیدا بە ڕادەیەکی زۆر لێک دەچێت و [وەک دەڵێن کاڵای پڕ بە باڵای یەکترین].

کەسێک بە مەبەستی سەفەرێکی دوور و درێژ لە ناو شەمەندەفەردایە و هیچ لایەک لە هاوسەفەرەکانی ناکاتەوە [و تاقە وشەیەک چییە لەگەڵیاندا نادوێت]، بەڵام کەسی دانیشتوو لە تەنیشتیدا بە وردبینییەکی زۆرەوە چاو لە هەموو مسافرەکانی دیکە دەکات و لێکۆڵینەوە و

---

٩٣ - Sherlock Holmes؛ ناوی پۆلیس - شارەزایەکی ئەفسانەییە.

شیکاریی لە سەر کەسایەتییان دەکات و هەندێک بۆچوونی ژیرانەی لە سەر ژیانیان لە لا دروست دەبێت و تەنانەت ڕەنگە بە بیرکردنەوە لە نهێنیترین لایەنەکانی ژیانیشیان بە هەندێک دەرەنجامیش بگات. خەڵک چەند گومان و شێمانەکانیان پێکەوە جیاوازن، لە ڕووی ئیحساسیشەوە ئەوەندە جیاوازییان لەگەڵ یەکدیدا هەیە. هەندێ کەس زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی تر بە وەڕسکەر و جاڕسکەر دەزانن، کەچی کەسانێک هەن بە ئاسانیی دەبنە هاوڕێی کەسانێک کە بە ڕێکەوت تووشیان دەبن و زۆر هەست بە نزیکایەتیی دەکەن لەگەڵیاندا، مەگەر ئەوەی کە هۆیەکی تایبەتیان هەبێت بۆ دەربڕینی هەست و بۆچوونێکی جیاواز لەوە. با نموونەیەکی تر لە سەفەرکردن بێنینەوە: هەندێک کەس بۆ چەندین وڵات سەفەر دەکەن و هەمیشە لە باشترین هۆتێلەکاندا دادەنیشن و هەمان ئەو خواردنانەش دەخۆن کە لە ماڵی خۆیاندا دەیخۆن و لەگەڵ هەمان ئەو جۆرە مرۆڤە دەوڵەمەند یان کەمزان یان هەرچی و پەرچییانەدا هەستان و دانیشتن دەکەن کە لە وڵاتەکەی خۆیاندا لەگەڵیاندا دەبوون و لەگەڵ هەمان ئەو جۆرە کەسانەدا دەپەیڤن کە لە سەر سفرەی ماڵی خۆیاندا دەپەیڤن. ئەم کەسانە پاش گەڕانەوە بۆ وڵاتەکەی خۆیان، هەست بە ئارامش دەکەن و خۆشحاڵن لەوەی کە لە دەست سەفەرێکی پڕخەرجی وەڕسکەرەوە ڕزگاریان بووە.

بەڵام بە پێچەوانەوە کەسانێک هەن کاتێک بۆ هەر وڵاتێک سەفەر دەکەن، پرسان پرسان بە دوای دۆزینەوەی تایبەتمەندییە شاز و جیاوازەکانی خەڵکی ئەو وڵاتەدا دەگەڕێن تا لەگەڵ خەڵک و دابونەریتە مێژوویی و کۆمەڵایەتییەکانیدا ئاشنا بن؛ خواردنی ئەو وڵاتە دەخۆن و فێری دابونەریت و زمانەکەیان دەبن و بە کۆڵێک ئەزموون و بیرەوەریی جوانەوە دەگەڕێنەوە بۆ وڵاتەکەی خۆیان کە بەشی ئەوە دەکەن بە درێژاییی شەوانی زستان [بۆ ئەندامانی بنەماڵە و کەسانی دەوروبەر] بیانگێڕنەوە. لەم نموونانەدا کەسێک کە حەز و ڕەغبەتی بەرامبەر بە ژیان هەیە، بە سەرتر لە کەسێک دادەنرێت کە ژیان هیچ واتایەکی لە لای نییە و تەنانەت کارەساتە ناخۆشەکانیش بە لایەوە سوودبەخشن. من خۆم زۆر خۆشحاڵم لەوەی کە ڕۆژێکیان ڕێم کەوتە ناو کۆمەڵێک خەڵکی [وڵاتی] چین و جارێکیش بۆ گوندێکی سیسیل. دەبێ بڵێم کە لەو کاتانەدا بە ڕاستیی چەند کات و ساتێکی خۆش و دڵبزوێنم بە سەر برد.

کەسانی سەرشێت چێژ لە تێکشکانی پاپۆڕ و شۆڕش و یاخیگەریی و بوومەلەرزە و ئاگرکەوتنەوە و سووتانی شار و دارستان، یان کارەساتە ناخۆشەکان دەبینن، بە مەرجێک هیچ مەترسیی و زیانێک بەر خۆیان نەکەوێت. بۆ نموونە ئەمانە سەبارەت بە زەویلەرزە دەڵێن: «تازە ئێستە زانیم بوومەلەرزە چییە و چۆنە!» و لە بەر ئەوەی کە زانیارییان لە سەر پرسەکانی جیهان زیادی کردووە، هەست بە چێژ و خۆشییەکی زۆر دەکەن. دیارە ناتوانین بڵێین ئەم جۆرە کەسانە هەرگیز ناکەونە بەردەم مەترسییەوە، بەڵام بە هەر حاڵ ئەگەر تەندروستییان زیانی بەر بکەوێت، بە ئەگەرێکی زۆرەوە حەز و ڕەغبەتیان لە دەست دەدەن - هەر چەند ئەمەش شتێکی حەتمیی و لێبڕاوانە نییە.

کەسانێک دەناسم کە پاش ساڵانێکی زۆری ئازار و ئەشکەنجەی هێدی هێدی و بەردەوام، حەزی ژیانیان لە دەست داوە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا حەز و ڕەغبەتیان بەرامبەر بە هەندێ شت [لە ناخیاندا] پاراستووە. هەندێک نەخۆشیی، حەز و ڕەغبەت لە ناو دەبەن و هەندێکش ئەم کاریگەرییەیان نییە. ئایا بیرمەندانی [زانستی] «بیۆشیمی» دەتوانن ئەم جۆرە جۆربەجۆرانە لێک جیا بکەنەوە یان نا؟ ڕەنگە کاتێک زانستی «شیمی» (کیمیا) پێشکەوتنی زیاتر بە دەست بێنێت کە ئێمە بتوانین بە خواردنی حەبێک هەستی حەز و ڕەغبەت بەرانبەر بە هەموو شتێک لە خۆماندا بپارێزین. بەڵام تا هاتنی ئەو ڕۆژە، ناچارین پشت بە تێڕوانین و توێژینەوە چڕوپڕەکانی خۆمانەوە ببەستین و لەوە بکۆڵینەوە کە ئەو هۆکارانە چین کە هەندێ کەس وا لێ دەکەن حەز و ڕەغبەتیان لە هەموو شتێک هەبێت و هەندێکی تریش وا لێ دەکەن حەز و ڕەغبەتیان بەرامبەر بە هیچ شتێک نەبێت. حەز و ڕەغبەت هەندێ جار گشتیی و هەندێ جاریش تاکەکەسییە و ئەگەری ئەوە هەیە لە هەر دوو حاڵەتەکەدا سنووردار بێت.

خوێنەرانی چیرۆکی **بارمتە**[٩٤] ڕەنگە ئەوەیان لە یاد بێت کە یەکێک لە قارەمانەکانی چیرۆکەکە لە "لاون گرۆ"دا چی بەسەر هات. ئەو، هاوسەرە ئێجگار خۆشەویستەکەی لە دەست دابوو و پێی وابوو چیدی ژیان هیچ چێژ و خۆشییەکی نەماوە و بۆتە زەلکاوێکی بێکەڵک و بێفایدە. ئەو، بازرگانی چای بوو و لە بەر ئەوەی کە لە ژیاندا براوە بێت، بە

٩٤ - واتە کەسی بە بارمتە گیراو. و. ک.

یارمەتیی فەرهەنگۆکێکی [زمانی] چینیی دەستی کرد بە فێربوونی زمانی چینیی تا بتوانێت ئەو نووسینانە بخوێنێتەوە کە بە زانی چینیی لە سەر سندووقە چاکان نووسرابوون؛ بۆیە حەزێکی تازەی بەرانبەر بە ژیان لە لا دروست بوو و وای لێ هات بە حەز و تاسەیەکی زۆرەوە هەموو بابەتێکی پێوەندیدار بە وڵاتی "چین"ی دەخوێندەوە. من کەسانێک دەناسم کە بە تەواوەتیی حەزیان لە لێکۆڵینەوە لە بواری "عیرفان"دا کردووە و هەروەها کەسانێکیش کە زۆر حەزیان لە کۆکردنەوەی دەسخەت و نووسینە چاپکراوەکانی هۆبز[٩٥] هەبووە. شێمانەکردنی ئەمە لە توانای کەسدا نییە کە بزانێت تاکەکان حەزیان لە چییە. زۆربەی تاکەکان هەندێ حەز و ویستی گرینگیان هەیە کە ئەگەر بورووژێن، چیدی ژیان بە لایانەوە جاڕسکەر و وەڕسکەر نابێت، بەڵام سەرگەرمییە سنووردارەکان هێندەی حەز و ڕەغبەتێکی گشتیی نابنە هۆی بەختەوەریی. چوونکە ئەم حەزانە وردە وردە دەتوانن هەموو کاتەکانی تاکێک پڕ بکەنەوە و هەمیشە ئەو مەترسییە لە ئارادایە کە ڕەنگە زانیاریی تەواو لە سەر هەموو لایەنەکانی بابەتێکی تایبەت کە تاقە سەرگەرمیشی بووە بە دەست بێنێت و کارەکە کۆتایی پێ بێت.

ئەگەر بێتەوە بیرتان سەبارەت بە جۆرەکانی حەزی تاکەکان بەرانبەر بە خواردن، یەکێکیان نموونەی پیاوێکی زۆرخۆر و نەوسن بوو کە بۆ ئەوە نەدەبوو وەسف و ستایشی بکەین. ڕەنگە خوێنەر پێی وابێت ئەو کەسەی کە لە سەرەوە ئاماژمان پێکرد هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ ئەو کەسە نەوسن و زۆرخۆرەدا نییە. ئێستە کاتی ئەوە هاتووە جیاوازیی نێوان ئەم دوو کەسە باشتر ڕوون بکەینەوە:

پێشینان، میانەڕۆیی و هاوسەنگییان بە یەکێک لە مەرجە سەرەکییەکانی خواترسیی و پاکیی لە قەڵەم دەدا. بە هۆی گەشەسەندنی ڕۆمانتیزم[٩٦] و شۆڕشی "فەرەنسا"وە، کەسانێکی زۆر وازیان لەم باوەڕە هێنا و لە جیاتیدا ڕوویان کردە لایەنگریکردن لە هەست و ئیحساساتی

---

٩٥ - Hobbes؛ ١٦٧٩ – ١٥٨٨؛ باشترین و گەورەترین داکۆکیکاری بنەماڵەی ستیوارت بوو و فەلسەفەی سیاسیی سەردەمی هاوچەرخی دەست پێکرد. لە کتێبێکدا کە ساڵی ١٦٠١ بە ناوی **هوڤێتیگەریی نەتەوەیی، یان بابەتی فۆرم و شێوازی حکوومەت** نووسیوێتی، بنەمای حکوومەت یان سیاسەت و تیۆریی بنەمای دەوڵەت و سەرچاوەی کۆمەڵگا بە هۆی ئاڵوگۆڕکردنی بیروڕا و گرێبەستی لە پێش ئامادەکراوەوە خستۆتە بەر باس و لێکۆڵەنەوە.

٩٦ - Romantism؛ لایەنگریی لە تەسەور و خەیاڵ و لایەنگریی لە قوتابخانەی خیاڵاوییبوون و ئەفسانەسازیی.

توند و خەستوخۆڵی وەک سۆز، یان ڕق و کینەی لە ڕادەبەدەر. لەوانەش ئەو قارمانە "بایرۆنی"یانەن کە تەنانەت هەندێک هەستی وێرانکەر و دژە کۆمەڵایەتیشیان هەبوو. بەڵام دەبێ دان بەوەدا بنێین کە پێشینان بە ڕاستیی لە سەر حەق بوون. لە ناو ژیانێکی باش و گونجاودا دەبێ جیاوازیی لە نێوان چالاکییە جۆراوجۆرەکاندا هەبێت و نابێ لە هیچ کارێکدا هێندە شێلگیر و زێدەڕۆ بین کە نەتوانین چالاکییەکانی دیکە ئەنجام بدەین. زۆرخۆر و نەوسنەکان هەموو شتێکی دیکە لە پێناوی چێژی خواردندا لە دەست دەدەن و بەم هۆیەشەوە لە ڕێژەی بەختەوەرییان کەم دەبێتەوە.

شاژن ژۆرفین زۆر حەزی لە جلوبەرگ بوو. ناپلیۆن سەرەڕای هەموو ناڕەزاییەکانی، بە هەر حاڵ حەقدەسی بەرگدرووکانی دەدا. بەڵام ناپلیۆن سەرەنجام بە هاوسەرەکەی وت دەبێ دەست پێوە بگرێت و لەمە بە دواش تەنها ئەو خەرج و تێچوونانە دەگرێتە ئەستۆ کە گونجاو و بەجێ بن. کاتێک لیستی خەرجەکانی مانگی دواتر هات، ژۆرفین بۆ چەند چرکەیەک مات و گێژ بووبوو و نەیدەزانی ئەو هەموو پارەیە چۆن بدات. بەڵام دەسبەجێ بیرۆکەیەک بە مێشکیدا هات؛ چووە لای وەزیری جەنگ و داوای لێ کرد لە سەر بووجەی سەربازیی، خەرجەکانی ئەو بدات. وەزیری جەنگیش کە ئاگای لە دەسەڵات و توانای ژۆرفین هەبوو، نەیدەتوانی سەرپێچیی بکات و بۆیە پارەکەی پێ دا. لە ئەنجامی ئەو کارەشدا فەرەنسییەکان لە جەنگی "جێنوا"دا[٩٧] شکستیان خوارد. ئەم ڕووداوە لە هەندێک سەرچاوەدا نوسراوە و من ناتوانم بڵێم ڕاستە یان هەڵەیە. بەڵام ئەم ڕووداوە چ ڕاست بێت یانخود هەڵە بێت و [یان ترش و خوێیان پێ زیاد کردبێت]، پڕ بە پێستی بابەتەکەی ئێمەیە چوونکە ئەوە دەردەخات کە چۆن حەزی لە ڕادەبەدەر بەرانبەر بە جلوبەرگ لەوانەیە ژنێکی دەسەڵاتدار لە کاتی پێویستیدا بە لاڕێدا ببات. کەسانێک کە ئێجگار زۆر گیرۆدەی هەستی سێکسین، نموونەی بەرچاوی ئەم جۆرە حەز و ویستە زێدەڕۆیانەن. دیارە ئەمەش ڕێسایەکی گشتیی هەیە. دەبێ هاوسەنگییەک لە ناو هەموو حەز و ئارەزووە جۆراوجۆرەکانی ژیانماندا بێنینە ئاراوە؛ ئەگەر بڕیارە حەز و ئارەزوویەک ببێتە هۆی بەختەوەربوونمان، دەبێ لەگەڵ تەندروستیی یان سۆزی ئەو کەسانەی

٩٧ - Genoa؛ ناوی شارێکە لە "ئیتالیا"دا کە فەرانسییەکان شەڕیان تێدا کرد.

کە خۆشمان دەوێن بێتەوە و لەگەڵیاندا گونجاو بێت و هەروەها بە ئاراستەی ڕێزگرتن لە کۆمەڵگاکەمان بێت. دەتوانین هەندێک لە حەز و ویستە توندەکان بەبێ هیچ سنوور و ڕێگرییەک و بە شێوەیەکی ڕەوا و شایستە پراکتیزە بکەین، دیارە لە هەندێک کاتدا ئەم کارە لە توانادا نییە. بۆ نموونە کەسێک کە حەزی لە یاریی شەترەنجە، ئەگەر هاتو سەڵت و دەوڵەمەند بوو، پێویست ناکات حەزەکەی خۆی لە ئاست ئەم یارییەدا کەم و بەرتەسک بکاتەوە، بەڵام ئەگەر ژن و منداڵی هەبوو و لە ڕوویی داراییشەوە بارودۆخێکی ئەوەندە باشی نەبێت، ناچارە سنوور بۆ حەزەکەی دابنێت.

کەسانی مەشرووبخۆر[٩٨] و خوێڕیی و هەرچی و پەرچی، تەنانەت ئەگەر هیچ چەشنە پابەندییەکی کۆمەڵایەتیشیان نەبێت، دیسانەوە کارێکی ئاقڵانە نییە بە هۆی لەخۆباییبوونەوە زێدەڕۆیی بکەن چوونکە زێدەڕۆیی، تەندروستییان بەرەوڕووی مەترسیی دەکاتەوە و لە پێناوی چەند خولەک چێژ و خۆشییدا دەبێ چەندین کاتژمێر لە دۆزەخی ناخۆشییدا بژین. هەندێک کاروبار چوارچێوەی تایبەتی خۆیان هەیە کە ئەگەر نەمانەوێ حەزە کەسەکییەکان ببنە هۆی بەدبەختیی، دەبێ ئەم کاروبارانە ئەو شتە زیادییانەیان لێ لاببرێت کە بەدیهاتنیان مەحاڵە و تەنها لەو سنوورەدا دەر بکەون. لەم بارەوە دەتوانین ئاماژە بکەین بە تەندروستیی، سەربەستیی و زاڵبوون بە سەر هێزە جۆراوجۆرە مرۆییەکان و داهاتێک کە بە قەدەر پێویست پێداویستییەکانی تاک دابین بکات و هەروەها هەندێ ئەرکی گرینگی کۆمەڵایەتیی وەکوو ئەرکی پیاو لە بەرانبەر ژن و منداڵەکەی. کەسێک کە ئەم شتانە لە پێناوی یاریی شەترەنجدا قوربانیی دەکات، ڕێک هێندەی کەسی مەشرووبخۆر شیاوی لۆمە و سەرزەنشتکردنە. ئەگەر لەم ڕووەوە بە توندیی و لێبڕاوانە هەڵوێست وەرناگرم، لە بەر ئەوەیە کە وەها شتێک زۆر بە کەمیی ڕوو دەدات و تەنها کەسانێکیش دەتوانن لە کاتی تووشبوون بە یارییەکی فکرییدا زەرەرمەند نەبن کە بیر و هۆشێکی زۆر و دروەشاوەیان هەبێت و دەتوانن قەرەبووی ئەو زێدەڕۆییکردنەیان بکەنەوە.

٩٨ - مەبەست لەو کەسانەیە کە بە شێوەیەکی زێدەڕۆیانە دەخۆنەوە. و. ک.

هاوسەنگیی، هەموو ئەم پرسانە دەگرێتەوە. کەسێک کە حەزی لە یاریی شەترەنجە و بە درێژایی کار و دەوامەکانی، بیر لەوە دەکاتەوە هەرچی زووترە ئێوارە بێت و یاریی شەترەنج بکات، کەسێکی بەختەوەرە بەڵام کەسێک کە لە پێناوی شەترەنجدا واز لە کارەکەی دێنێت، بایەخ و بەهای «هاوسەنگیی» لە ناو بردووە. دەڵێن: «تۆلستۆی[٩٩] لە هەرەتی لاوێتییدا بە هۆی ئازایەتییەک کە لە گۆڕەپانی جەنگدا نواندبووی، بۆ وەرگرتنی خەڵاتی سەربازیی دەسنیشان کرا، بەڵام لە کاتی بەخشینی خەڵاتەکاندا ئەوەندە سەرگەرمی یاریی شەترەنج بوو کە هەلی وەرگرتنی خەڵاتەکەی لە دەست دا». ناتوانین لەم ڕووەوە لۆمەی تۆلستۆی بکەین چوونکە بەدەستنەهێنانی خەڵاتێکی شەرەفی سەربازیی بۆ کەسایەتییەکی وەک تۆلستۆی ئەوەندە گرینگ نییە، بەڵام ڕەنگە لە دیدی کەسانی ئاساییەوە وەها کارێک گەوجانە بێت.

سەبارەت بە کۆتایی و ڕێژەی ئەو بنەما و فێرکارییانەی کە لە سەرەوە ئاماژمان پێ کردن، دەبێ دان بەوەدا بنێین کە بەختکردنی هەندێ شت لەبەر خاتری هەندێ شتی سەرنجڕاکێشی دیکە، کارێکی ڕەوا نییە.

پیاوێک کە ژیانی لە پێناوی بەرگریی لە نیشتمانەکەیدا بەخت دەکات، تەنانەت ئەگەر ژن و منداڵەکانیشی بێکەس و بێ سەرپەرست بمێننەوە و لە ڕووی دابینکردنی بژێویی ژیانەوە تووشی کێشە و ئاریشە ببن، شیاوی لۆمەکردن نییە؛ پیاوێک کە سەرقاڵی تاقیکاریی زانستییە تا بە شتێکی تازە یان داهێنانێکی تازە بگات، ئەگەر بنەماڵەکەی بە هۆی کارەکەیەوە لە هەژاریی و برسێتیدا بژین، شیاوی لۆمەکردن نییە؛ بە مەرجێک هەوڵ و ماندووبوونەکانی لە پێناوی بەدەستهێنانی شتێکدا بێت کە ئەگەر سەری گرت، کارێکی بەنرخ و سوودبەخشی بە ئەنجام گەیاندبێت. بەڵام ئەگەر تەنانەت دۆزینەوە و داهێنانەکەی بە دەرەنجامێکی گونجاو و چاوەڕوانکراویش نەگەییشت، دیسانەوە بە ڕای من دادپەروەرانە نییە کە ڕای گشتیی، بە کەسێکی بێ بەهرە و بێ مێشکی لە قەڵەم بدات چوونکە هیچ کەسێک ناتوانێت پێشبینیی و گەرەنتیی سەرکەوتنی خۆی بکات. لە هەزارەی یەکەمی

٩٩ - Tolstoy، ١٩١٠ – ١٨٢٨؛ فەیلەسووف و نووسەری بەناوبانگی ڕووسیی کە لەو باوەڕەدا بوو ساماندارییی و دەوڵەمەندیی تاوان[ێکی گەورەیە]. هەندێک لە بەرهەمەکانی بریتین لە: **جەنگ و ئاشتیی**، **ئاناکارنینا**، **ڕابوون** و **منداڵیی**.

دەرکەوتنی حەزرەتی مەسیحدا پیاوێک کە لە پێناوی ژیانی خواپەرستانە و خواترسانەدا بنەماڵەکەی خۆی بە جێ بهێشتایە، شایستەی ڕێزلێگرتن و پیاهەڵدان بوو، بەڵام ئەمڕۆ خەڵک لەو باوەڕەدان کە سەرەتا دەبێ هەموو پێداویستییەکانی بنەماڵەکەی دابین بکات، ئنجا واز لە دنیا بێنێت [و گۆشەگیریی هەڵبژێرێت].

بە باوەڕی من، هەمیشە جیاوازییەکی قووڵی دەروونیی (=ڕۆحیی) هەیە لە نێوان کەسی زۆرخۆر و کەسێک کە ئارەزوویەکی ساغ و دروستی خواردنی هەیە. کەسێک کە یەکێک لە حەز و مەیلەکانی لە ڕادەبەدەر لە بوونیدا گەشە دەکات و حەزەکانی دیکەی دەکوژێت، بێگومان کێشەیەکی گەورەی لە ناخدا هەیە و دەیهەوێت بەو شێوەیە خۆی لێ بدزێتەوە. ئەم بۆچوونەش بە تەواوەتیی سەبارەت بەو کەسانەی کە لە خواردنەوەی مەشرووبدا زێدەڕۆیی دەکەن ڕاستیی لە خۆ دەگرێت. خەڵک بە مەبەستی لەبیرکردن (فەرامۆشکردن) مەشرووب دەخۆنەوە، چوونکە ئەگەر هیچ فکر و خەیاڵ و داڵغەیەکیان نەبوایە، هەرگیز سەرخۆشییان لە هۆشیاریی پێ خۆشتر نەدەبوو و تەندروستیی خۆیان نەدەخستە مەترسییەوە. ئەفسانەیەکی وڵاتی چین هەیە کە دەڵێت: «من شەراب لە بەر خاتری شەرابەکە خۆی ناخۆمەوە، بەڵکوو دەیخۆمەوە تا مەست و سەرخۆش ببم و خۆم لە بیر بکەم». ئەم بۆچوونە هەموو نموونەکانی تری زێدەڕۆیی [لە هەموو بوارێکدا] دەگرێتەوە. زۆرێک لە تاکەکان زێدەڕۆییکردنیان لەبەر خاتری ئەوە نییە کە تەنها خۆشیان ڕابوواردبێت و هیچی تر، بەڵکوو دەیانەوێ خۆیان لە گێژاوی ئەو خۆشییانەدا نوقم و فەرامۆش بکەن. هەر چۆنێک بێت، جیاوازیی زۆر هەیە لە نێوان فەرامۆشیی بە هۆی مەستیی و سەرخۆشی و فەرامۆشیی بە هۆی جۆری پەروەردە و فێرکارییەوە. قارەمانی چیرۆکی **بارمتە** خۆی فێری ئەلفوبێی زمانی چینیی کرد، تا بتوانێت [خەمی] مەرگی هاوسەرەکەی لە بیر بکات. لە ڕاستییدا پشتبەستنی ئەو بەو فەرامۆشییەوە، کارێکی ڕەوا بوو و هیچ زیانیشی بە دواوە نەبوو و لە هەمان کاتیشدا توانای دەرک و تێگەییشتنی خۆی زیاتر کرد؛ وە ناشتوانین هیچ بەڵگەیەکی پتەو و قایم بۆ ڕەتکردنەوەی ئەم [بە ئەنقەست] لەبیرکردنە بێنینەوە. بەڵام کەسانێک کە بە هۆی سەرخۆشیی و قومار یان هەر جۆرە خۆسەرقاڵکردنێکی بێسوودی دیکەوە هەوڵی فەرامۆشکردن دەدەن، دەبێ لۆمە و

سەرزەنشت بکرێن. دیارە دۆخێکی بەینابەینیش لە نێوان زێدەڕۆیی و حەزی هەوسارپچڕاودا هەیە.

سەبارەت بە کەسێک کە لە ئاسمانەوانیی یان کەشەوانییدا ژیانی خۆی دەخاتە مەترسییەوە تەنها لە بەر ئەوەی کە بە لایەوە ناخۆش و وەڕسکەرە، دەتوانین چی بڵێین؟ ئەگەر لە پێناوی بەرژەوەندیی گشتییدا گیانی بەخت بکات، دەبێ ستایشی بکەین، ئەگینا ئەویش هاوشێوەی کەسانی قومارباز و مەشرووبخۆر دەچێتە خانەی زێدەڕۆکانەوە. حەز و ڕەغبەتی ڕاستەقینە، لە ڕاستییدا لە جۆری خۆدزینەوە بە مەبەستی فەرامۆشکردنی بنەما سروشتییەکانی ژیان نییە؛ مەگەر ئەوەی کە بە هۆی کارەسات و ڕووداوی دڵتەزێنەوە لە ناو چووبێت. لاوەکان بە وردیی سەرنجی ئەو شتانە دەدەن کە دەیانبینن یان دەیانبیستن و دنیا بە لایانەوە پڕە لە شتی سەیر و سەرسووڕهێنەر. ئەوان بێوچان هەوڵی فێربوونی زانست و زانیاریی دەدەن. ئەڵبەتە مەبەستم لەو زانست و زانیارییە نییە کە لە خوێندنگەدا فێر دەبن، بەڵکوو زانستێکە گرێیان بدات بەو پرسانەی کە حەزیان لێیانە و پێوەندییەکی ڕاستەقینەیان لەگەڵ بێننە ئاراوە. ئاژەڵان تەنانەت دوای سەرکەوتنیش حەز و ڕەغبەتیان دەپارێزن؛ بە مەرجێک ساغ و تەندروست بن. پشیلەیەکی ناو ژوورێکی نامۆ، تا کاتێک هەموو کون و قوژبنەکانی ناو ژوورەکە نەگەڕێت و دڵنیا نەبێت لەوەی کە هیچ مشکێکی تێدا نییە، واز لە گەڕان و پشکنین ناهێنێت. حەزی سروشتیی بەرامبەر بە کاروبارەکانی جیهانی دەرەوە، لە بوونی تاکێکدا کە هەرگیز تووشی هیچ ڕێگر و لەمپەرێکی نائاسایی نەبووە، وەک خۆی دەمێنێتەوە و تا کاتێکیش ئەو هەستەی تێدا هەبێت، ژیانێکی باش و لەباری دەبێت؛ مەگەر ئەوەی کە بەبێ هیچ هۆیەک ئازادییەکەی سنووردار بکرێت. نەبوونی حەز و ویست لە کۆمەڵگا شارستانییەکاندا تا ڕادەیەکی زۆر، بەندە بەو چوارچێوە و سنوورەی کە بۆ ئازادیی تاک دیاریی کراوە و دیارە ئەم سنوورەش بۆ سیستمی ژیان زۆر پێویستە. ئاژەڵان تەنها لە کاتێکدا ڕاو دەکەن کە برسییان بێت و بەم شێوەیە وە دوای پاڵنەری سروشتییان دەکەون. کەسێک کە هەموو بەیانییەک لە کاتژمێرێکی دیاریکراودا دەچێت بۆ سەر کارەکەی، وە دوای پاڵنەرێک دەکەوێت کە ئەویش پێویستیی دابینکردنی بژێویی ژیانە، بەڵام ئەم پاڵنەرە لە تاکەکاندا هەمیشە ڕاستەوخۆ و بەبێ واسیتە کار ناکات، بەڵکوو بە یارمەتیی باوەڕ و

هێزی ئیرادە و بڕیار کار دەکات. لەو چرکەساتەدا کە تاک کاری خۆی دەست پێ دەکات، هەست بە برسێتیی ناکات چوونکە تازە نانی بەیانیی خواردووە، بەڵام دەزانێت کە ماوەیەکی دواتر برسیی دەبێت و کارکردنیش بە واتای هۆکارێکە بۆ تێرکردنی ئەو برسێتییەی بەڕێوەیە. پاڵنەرەکانی ئێمە زۆربەیان هیچ ڕێسا و چوارچێوەیەکیان نییە، لە کاتێکدا خوو و عادەتەکان لە کۆمەڵگا شارستانییەکاندا دەبێ نەزم و تەکووزییان هەبێت. لە ناو ئاژەڵە وەحشییەکاندا تەنانەت کردەوە بەکۆمەڵەکانیش کتوپڕیی و لە ناکاون، بەڵام کاتێک خێڵێک[ی مرۆیی] بە تەمای شەڕکردن دەبێت، تەپڵ و زوڕنای ئاگادارکردنەوە لە هەموو لایەکدا لێ دەدات تا ئەرک و کارە پێویستەکان جێبەجێ بکات. ئەمڕۆ ئەم جۆرە کارانە چیدی بەم جۆرە ئەنجام نادرێن. کاتێک شەمەندەفەرێک بڕیارە لە کاتژمێرێکی دیاریکراودا بکەوێتە ڕێ، هەرگیز ناکرێت بە دەنگ و هاوارێکی بەرز هەموو کۆڵبەر و شۆفێری شەمەندەفەر و سەرجەم کارمەند و فەرمانبەرەکانی دیکە ئاگادار بکرێنەوە. هەموو کەسێک دەبێ ئەرکی سەرشانی خۆی ئەنجام بدات؛ تەنها لە بەر ئەوەی کە ئەو کارانە دەبێ ئەنجام بدرێن. بە واتایەکی دیکە پاڵنەری ڕاستەوخۆیان نییە و هیچ پاڵنەرێکی کتوپڕیی پاڵیان پێوە نانێت بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانیان، بەڵکوو پاداش و حەقدەسی کارەکانیان پاڵنەری ئەوانە.

لە بەشێکی هەرە بەرفراوانی ژیانی کۆمەڵایەتیماندا کەموکوڕیی لەم چەشنە بەدیی دەکرێت. خەڵک پێکەوە قسە دەکەن نەک لە بەر ئەوەی کە حەزیان لێیە، بەڵکوو لە بەر ئەوەی کە سوود لە هەرەوەزیی و هاوکاریی یەکتریی وەربگرن. لە هەموو کاتێکدا ئەگەری ئەوە هەیە هەندێک ڕێگر لە بەردەم پاڵنەرە کتوپڕییەکانی کەسێکی شارستانییدا قوت ببنەوە. ئەگەر تاکێک ئاگای لە خۆی نەبێت و هەست بە کەیف و خۆشیی بکات نابێت لە ناو شەقامدا گۆرانیی بچڕێت یان سەما بکات و ئەگەریش ڕووداوێکی دڵتەزێن خەمباری کردبێت نابێ لە شۆستەکاندا دابنیشێت و بگریت و ڕێ لە ڕۆشتنی ڕێبواران بگرێت. لە قۆناغی منداڵییدا ئازادیی تاک لە خوێندنگەی سەرەتاییدا سنووردار دەکرێت و لە قۆناغی هەرزەکاریشدا کاتژمێرەکانی کارکردن ژیان سنووردار دەکەن. کۆی ئەم هۆکارانەیە کە چیدی هیچ مەیل و ڕەغبەتێک لە مرۆڤدا ناهێڵنەوە، چوونکە سنووردارکردنی بەردەوام، ڕق و بێزاریی و خەمۆکیی لێ دەکەوێتەوە؛ بەڵام سەرەڕای ئەمەش ژیانی کۆمەڵایەتیی، بەبێ بوونی ئەم سنووربەندییانە مەحاڵە. پاڵنەرە نائیرادییەکان تەنها ساکارترین جۆری هەرەوەزیی کۆمەڵایەتییان لێ

دەکەوێتەوە و دەورێکی ئەوتۆیان نییە لە جۆرە بەرز و باڵاکانیدا، کە دیارە زەروورەتی ڕێکخراوە نوێیە ئابوورییەکانیشن. بۆ ئەوەی تاکێک بتوانێت لەمپەرەکانی حەز و ڕەغبەت وە لاوە بنێت، دەبێ ساغ و تەندروست و خاوەنی وزەی پێویست بێت و، ئەگەر بەخت یاری بێت دەپەرژێتە سەر ئەو کارەش کە حەزی لێیەتی. ئامارەکان ئەوە دەردەخەن کە لەم سەد ساڵەی دواییدا باری تەندروستیی، پێشکەوتنی ئێجگار زۆری بە خۆوە بینیوە، بەڵام سەبارەت بە دەسنیشانکردنی ڕێژەی وزە کە کارێکی زۆر ئەستەمە، هیچم نەبیستووە و بەگومانم لەوەی کە هێزەی جەستەیی لە کاتی تەندروستییدا لەم سەردەمەدا بە قەد ئەوەی سەردەمانی پێشوو ببێت. ئەم پرسەش تا ڕادەیەکی زۆر پرسێکی کۆمەڵایەتییە و منیش بە تەما نیم لە کتێبەدا خۆمی پێوە سەرقاڵ بکەم.

بەڵام هەر چۆنێک بێت، ئەم پرسە هەم لایەنی کەسەکیی هەیە و هەمیش لایەنی ڕۆحیی، کە پێشتر لە بەشی «شەکەتیی»دا باسمان لێ کرد. هەندێک کەس سەرەڕای لەمپەر و ڕێگرەکانی ژیانی شارستانیی، دیسانەوە حەز و ڕەغبەتی خۆیان پاراستووە؛ خەڵکانی تریش دەتوانن ئەم کارە بکەن بە مەرجێک ڕێژەیەک لە وزەی خۆیان بۆ بەدیهێنانی ئەو حەز و ئارەزووانە بە فیڕۆ نەدەن کە تەنها لایەنی ڕۆحییان هەیە و هیچی تر. [بە واتایەکی دیکە، ڕێژەیەک لە وزەکانیان بۆ بەدیهێنانی حەز و ئارەزووە دڵخوازەکانیان تەرخان بکەن]. چوونکە حەز و ڕەغبەت پێویستی بە بڕە وزەیەکی زیاتر هەیە کە ئەم وزەیەش بۆ کارە پێویست و زەروورەکان زۆر پێویستە. ڕێکخستنی پلان و گەڵاڵەی ئەم بارودۆخەش پێویستی بە کارکردنی ئارام و لەسەرخۆی سیستمی ڕۆحییەوە هەیە. ئەڵبەتە لە بەشەکانی دواتردا سەبارەت بەو هۆکارانەی کە دەبنە هۆی وەها ئارامشێک، قسە دەکەین. ئەمڕۆ حەز و ڕەغبەت لە ناو ژناندا بە هۆی ئەو تەسەورە هەڵەیەی کە سەبارەت بە حورمەت و ڕێزگرتن لە لایان دروست بووە، بە تەواوەتیی نوقسانیی تێ کەوتووە و دیارە لە چاو ڕابردوودا زۆر کەمترە.

لە ڕابردوودا وا تەسەور دەکرا کە ژنان نابێ بە ئاشکرا و ڕاشکاوانە ئاوڕ لە پیاوان بدەنەوە، یان لەبەر چاوی خەڵکدا خۆشیی و جۆشوخرۆشەکانیان دەربڕن. کاتێک ژنان فێری ئەوە بوون کە ئاوڕ لە پیاوان نەدەنەوە و حەزی خۆشیان پێ نیشان نەدەن، دەرەنجامەکەی بوو بە ئەوە کە بێجگە لە چەند ڕەفتار و هەڵسوکەوتی دروست، حەزیان لە هیچ شتێکی تر نەبێت. فێربوونی ڕەفتاری تێکەڵ بە بێحەزیی و کەمتەرخەمیی لە ژیاندا، فێرکارییەکە کە دژایەتیی زۆری لەگەڵ حەز و ڕەغبەتدا هەیە و دەبێتە هۆی

شڵەژان و دڵەڕاوکێ و جۆرە خۆپەرستیی و خودشەیداییەکی نزم و ڕووکەشانە، کە یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی ئەو ژنە بەڕێزانەی کە پەروەردە و فێرکارییان بە قەدەر پێویست تەواو نەبووە. ئەم ژنانە بایەخێکی ئەوتۆ بە وەرزش کە جێی سەرنج و بایەخی زۆربەی پیاوانە، نادەن. ئەوان بایەخێکی ئەوتۆش بە سیاسەت نادەن و بە شێوەیەکی وشک و ڕەقوتەق هەڵسوکەوت لەگەڵ پیاوندا دەکەن کە ئەمەش دەبێتە هۆی پەراوێزبوونیان و، دیارە هەڵسوکەوتی پیاوانیش لەگەڵ ژناندا تێکەڵ بە ڕق و دوژمنکارییەکی شاراوە دەبێت. سەرچاوەی بیر و باوەڕێکی ئاوا لای ژنان دەتوانرێت لەوەوە سەرچاوەی گرتبێت کە ڕێز و بایەخی ئەوان لە ژنانی دیکە زیاترە. ئەوان شانازیی بەوەوە دەکەن کە هاوڕێیەتیی و هاتوچۆی دیتران ناکەن؛ بە واتایەکی دیکە گوێنەدان و سووک تەماشاکردنی مرۆڤەکانی دیکە، بە فەزیلەت و پاکیی و تەقوا لە قەڵەم دەدەن. دیارە نابێ لەم ڕووەوە لۆمەش بکرێن چوونکە ئەوان وە دوای فێرکاریی و ڕێساگەلێک دەکەون کە هەزاران ساڵ لە ناو ژناندا باو بووە. بەڵام هەر چۆنێک بێت دەبێ بەزەییمان بەم قوربانییانەدا بێتەوە، چوونکە ئەوان قوربانیی بارودۆخ و سیستمێکن کە لە کاتی خۆیدا دەرک بە کەموکوڕیی و نوقسانییە زاڵمانەکانی نەکراوە. لای ئەم جۆرە ژنانە، ڕەزالەت و زەبوونیی شتێکی باشە و، سەخاوەت و دڵاوایی و کەرامەت شتێکی خراپ و نەشیاوە. پێدەچێت مافی خۆیان بێت لە ناو بازنە کۆمەڵایەتییەکانی خۆیاندا هەر کارێکیان بۆ لەناوبردنی چێژ و خۆشیی پێ باش بێت ئەنجام بدەن و لە سیاسەتیشدا لایەنگری یاسا و ڕێسا بێمەرج و نادادپەروەرانەکانی خۆیان بن. بەختەوەرانە ئەمڕۆ ژمارەی ئەم جۆرە ژنانە لە چاو ڕابردوودا زۆر کەمتر بۆتەوە بەڵام هێشتا ژمارەیان زۆر زیاترە لەو ڕێژەی کە لە کۆمەڵگا ئازادەکاندا چاوەڕێی دەکەین.

ئەگەر کەسێک گومانی لە قسەکانی من هەیە، پێشنیاری پێ دەکەم بۆ دۆزینەوەی خانوو، سەردانی چەند شوێنێک بکات و داوای یارمەتیی لەم جۆرە ژنانە بکات؛ هیچ گومانم لەوەدا نییە کە تەسەوری هەڵەی «خۆ بە گەورەتر زانین» لە ناو ئەم ژنانەدا، هەموو حەز و مەیلەکانی ژیانتان تێدا دەکوژێت و بەو ئەنجامەش دەگەن کە بیر و هزر و ئیحساساتیان بە قەدەر پێویست گەشەی نەکردووە و بە هۆی خراپکارییەوە گێژ و مەنگ بوونە.

لە ڕاستییدا هیچ جیاوازییەک لە نێوان ژن و پیاودا نییە کە هەڵقوڵاوی دابونەریتە کۆنەکان بێت. ژنان حەز و ویست بە کلیلی بەختەوەریی و کامەرانیی دەزانن، وەک چۆن لای پیاوانیش بە هەمان شێوەیە.

## ١٢

### سۆز

یەکێک لە هۆکارە گرینگەکانی نەبوونی چێژە ڕۆحییەکان، ناهەماهەنگیی نێوان سۆز و عاتیفەکانی تاک و حەزەکانی کۆمەڵگایە و، بە پێچەوانەشەوە هەستی خۆشەویستبوون لای خەڵک زیاتر لە هۆکارەکانی دیکە حەز و ڕەغبەتی تاک دەورووژێنێت. ڕەنگە تاکێک لە بەر چەندین هۆی جۆراوجۆر وا هەست بکات کەس خۆشی ناوێت و ڕەنگە خۆی بە کەسێکی هێندە ئێسک قورس و ڕەزاگران بزانێت کە لە هەموو سوودەکانی هاوڕێیەتیی بێبەش کراوە و لەوانەشە ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە کە هەڵقوڵاوی بیری نەخۆشی خۆیەتی، لە بەر ئەوە ڕووی تێ کردبێت کە بە منداڵیی کەمتر لە منداڵەکانی دیکە گرینگیی پێ درابێت، یان ڕەنگە لە ڕاستییدا بێبەش بێت لە سۆزی خەڵکانی دیکە. بەڵام هۆکاری ئەمەی دواییان بە ئەگەرێکی زۆرەوە، نەبوونی «باوەڕبەخۆبوون»ە، کە سەرچاوەی ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ شکست و ناکامییەکانی ڕابردوو. کەسێک کە پێی وایە لە لایەن خەڵکی دیکەوە ڕێزی لێ ناگیردرێت، لەوانەیە هەندێک پەرچەکرداریی جۆراوجۆر بنوێنێت و بۆیە بە دەربڕینی سۆز و میهرەبانییەکی ئێجگار زۆرەوە هەوڵێکی زۆر دەدات بۆ ڕاکێشانی سۆز و میهرەبانیی خەڵک و بە دەگمەنیش سەرکەوتن بە دەست دێنێت چوونکە هۆی سۆز و میهرەبانییەکانی بە ئاسانیی لە لایەن کەسانی بەرامبەرەوە دەناسرێتەوە. سروشتی مرۆڤ وەهایە کە تەنها لە بارودۆخگەلی نائاساییدا بەرامبەر بە کەسانێک سۆز و میهرەبانیی دەنوێنێت کە پێویستی پێیانە. بۆیە کەسێک کە هەوڵ دەدات لە ڕێگای کردەوەگەلی مرۆڤدۆستانە و چاکەکارانەوە سۆز و میهرەبانیی خەڵکانی چواردەوری خۆی بە دەست بێنێت، بە بینینی ئەمەگنەناسیی هەمان ئەو

خەڵکە، خەمبار و بێهیوا دەبێت و هەرگیز ناتوانێت پاساو بۆ ئەوە بێنێتەوە و لەوە تێ بگات ئەو سۆز و میهرەبانییەی کە هەوڵی کڕینی دەدات، زۆر باشتر و گونجاوترە لەو شتەی کە بە تەما بووە نرخەکەی بدات، چوونکە ئەمە مامەڵەیەکی دەروونیی و سۆزاوییە. کەسانێک کە پێیان وایە کەس خۆشی ناوێن، ڕەنگە بە وروژاندنی قین و ڕقی خەڵک بیانەوێت تۆڵەی خۆیان بکەنەوە؛ وەک چۆن دین سویفت[١٠٠] دەیویست بە تێخی قەڵەم تۆڵە لە هەموو دنیا بکاتەوە. ئەمە پەرچەکردارییەکی قارەمانانەیە لە هەمبەر بەدبەختییەک کە هێز و توانای ڕۆحیی، یەکێک لە پێداویستییە هەرە گرینگەکانێتی بۆ ئەوەی تاکێک بتوانێت بەرەنگاری هەموو سەختیی و نەهامەتییەکانی ژیان ببێتەوە. تەنها ژمارەیەکی ئێجگار کەمی خەڵکیش دەتوانن بەو هیممەت و پلەبەرزییە بگەن. زۆرێک لە مرۆڤەکان بە ژن و پیاوەوە ئەگەر بزانن کەس خۆشی ناوێن، تووشی بێهیواییەکی تێکەڵ بە ترس و شەرمنیی دەبن و تەنها هەندێک جار بڵێسەگەلی کاتیی (=زووتێپەڕ)ی بەخێڵیی و ئێرەیی، هاوسەنگیی ئەم حاڵەتانە تێک دەدات.

بە گشتیی ئەم جۆرە کەسانە زۆربەی کات تووشی بشێویی و تێکچوونی باری دەروونیی دەبن و بە هۆی نەبوونی سۆز و هەروەها چەندین حاڵەتی دیکەوە تووشی حاڵەتی هەستکردن بە بێهیوایی دەبن و بە پێی غەریزە، حەز بە هەڵاتن لە هەموو بوونەوەرانی دنیا دەکەن. بۆیە کەسانێک کە خۆیان بە کۆیلەی عادەتێکی ڕووتینیی و پاتەکراو دەکەن، بە گشتیی لە دنیای ساردی دەرەوە دەترسێن و پێیان وایە ئەگەر درێژە بە هەمان ئەو ڕێگا هەمیشەیەی بدەن کە گرتوویانەتە بەر، هیچ کێشە و ڕووداوێکیان بۆ نایەتە پێشێ.

کەسانێک کە بەوپەڕی باوەڕبەخۆبوونەوە بەرەنگاری ژیان دەبنەوە، بەختەوەرتر لەو کەسانەن کە بە بێهیواییەوە پێشوازیی لە ژیان دەکەن. ئەڵبەتە ئەوانیش تا کاتێک هەست بە بەختەوەریی دەکەن کە نەکەونە گێژاوی بەدبەختیی و کێشە و ئاریشەکانەوە. زۆربەی کات پشتبەستن بە ئاسایش (ئەمنییەت)، خۆدوورخستنەوەی ڕاستەقینەیە لە ڕووداوە کوشندەکان، کەچی تاکی ترسنۆک ژیان و مانەوەی خۆی دەخاتە مەترسییەوە. ئەگەر بە ترس و لەرزەوە لە سەر تەختەیەکی باریکی ڕوو لە

١٠٠ - Swift، دین سویفت یەکێک لە نووسەرە ڕەشبینەکان بوو.

هەڵدێرێکدا بە ڕێگەدا بڕۆن، ئەگەری کەوتنەخوارەوەتان زۆر زیاترە لەو کاتەی کە چاونەترسانە و بوێرانە بە سەریدا دەڕۆن. بە پێی ئەو دەرەنجامەی لێرەوە دەستمان دەکەوێت دەتوانین بڵێین ئەم ڕێسایە دەکرێت سەبارەت بە کێشەکانی ژیانیش ڕاستیی لە خۆ بگرێت.

ئەڵبەتە ڕەنگە تاکی ئازا و چاونەترسیش لە پڕێکدا تووشی کێشە و گرفتاریی ببێت بەڵام ئەگەری ئەوەش زۆرە کە بەبێ هیچ زیان بەرکەوتنێک سەرکەوتن بە دەست بێنێت، لە کاتێکدا کەسی ترسنۆک تووشی خەم و خەفەت دەبێت. باوەڕبەخۆبوون چەندین جۆری هەیە. هەندێک کەس لە سەر بەرزایی شاخەکان و هەندێکی تر لە ناو زەریاکان و هەندێکی تریش لە ئاسمانە بێکۆتاییەکاندا هەست بەو ئاسایشە دەکەن. بەڵام گشتیترین و باوترین جۆری باوەڕبەخۆبوون کە بە درێژایی ژیان ئامادەیی هەیە، بەرز و باڵاترین حاڵەتێکی مرۆییە کە هەڵقوڵاوی سۆزێک بێت کە هەموومان پێویستمان پێیەتی و، ڕاهاتن بەم عادەتە و ڕاهاتنی فکر و هزر بەم هۆکارە بنەڕەتییە، سەرچاوەی هەندێک حەز و ڕەغبەتی سیستماتیکە کە لەم بەشەدا بە تەمام باسیان لێوە بکەم.

سۆزێک کە لە بوونمانەوە تیشک دەهاوێت، پاڵنەرێکە بۆ ڕاکێشانی هاوڕێ، یان باشتر بڵێم دۆزینەوەی هاوڕێ و متمانە، چوونکە لەم پرسە ڕێکوپێک و جوانەدا هەموو شتێک دوولایەنەیە. نواندنی سۆز بەرامبەر بە کەسانی وەک هونەرمەندان و وتەبێژان و سیاسەتمەداران کە لە کۆمەڵگادا زیاتر پەسن و پیاهەڵدانیان دەکرێت وایان لێ دەکات هەمیشە هەگبەیەک وشەی لە بابەتی پەسن و پیاهەڵدانی دڵخوازی خەڵکیان لە لا هەبێت. دیارە کۆمەڵگاکانیش بەش بە حاڵی خۆیان هەندێک پەرچەکرداریی مرۆییان لەگەڵدا دەنوێنن و لە شەوق و تاسەیەکی دوولایەنە سوودمەندیان دەکەن، وەک چۆن خۆشیان سوودمەند بوونە. منداڵێک کە سۆز و خرشەویستیی دایک و باوکی بە سەرەوەیە، وەک دیارەیەکی ئاسایی و سروشتیی لێی دەڕوانێت و هەر بۆیەش حەز ناکات تێڕامانی لە سەر بکات؛ ئەوپەڕی، ئەم هەستەی لە لا دروست دەبێت کە بە یاریی و شەوق و شادییەکی منداڵانەوە چێژ و خۆشیی دایک و باوکی مسۆگەر دەکات و بە گشتیی ئەوان بە سەرچاوەی بەختەوەریی دەزانێت؛ ڕێک بە پێچەوانەی ئەو منداڵانەی کە لە نیعمەتی ماڵ و بنەماڵە بێبەشن. زۆربەی ئەم منداڵانە ترس و دڵەڕاوکێ وازیان لێ ناهێنێت و بۆیە وەک کەسانێکی بێدەنگ و مەنگ و شەرمن گەورە دەبن و گەشە دەکەن و بە درێژایی گەورەبوونیشیان

بیر و هزریان لە ژێر ڕکێفی خەم و خەفەتەکانی ئەو قۆناغانەدا دەبێت و لە قۆناغەکانی دواتریشدا ئەو خەم و خەفەتانە وازیان لێ ناهێنن.

خوێندکارێکی ئارام و هێمن، لە ناو کتێبخانەیەکی ئارام و بەدوور لە شڵەژان و دڵەڕاوکێدا هەست بە ئاسایش دەکات و ئەگەر لێکچوونێکی تۆکمە و تەواوەتیی لە نێوان ئەو شوێنە و دنیای دەرەوەدا بەدیی بکات، لە هەموو هەلومەرجێکدا ئەو جۆرە شوێنانە بە شوێنێکی ئەمن و ئاسایش دەزانێت. دیارە ئەگەر وەها کەسێک سۆزێکی زیاتری بەرانبەر دەرببڕدرێت، لە کاتی بەرەوڕووبوونەوە لەگەڵ ڕووداوەکانی جیهاندا کەمتر دەترسێت و تووشی بێئۆقرەییەکانی هەڵقولاوی شڵەژان و دڵەڕاوکێ نابێت.

بە هەر حاڵ هیچ سۆزێک نابێتە هۆی هاندانی سەرشێتیی [لە تاکەکاندا]. سۆزێک کە دەردەبڕدرێت دەبێ بەهێز و بەتوانا بێت و، پشتی بە ترس و تۆقانەوە نەبەستبێت و ئامانجەکەشی شێوازێکی بەرزی ئاکارییانەی بە خۆوە گرتبێت، نەک ئەوەی کە پاراستنی تەندروستیی و متمانەی کەسی بەرانبەری لا مەبەست بێت؛ هەر چەندە کەمتەرخەمیکردن بەرامبەۆ بە ئاسایش کارێکی ڕەوا نییە.

دایک یان پەرستارێکی ترسنۆک کە بەردەوام منداڵ لەو کارەساتانە دەترسێنن کە لەوانەیە بێتە سەر ڕێگەیان و بە تەسەوری ئەوە کە هەموو سەگێگ دڕندەیە و هەموو گایەک زیان دەگەینێت، لە ڕاستییدا تۆوی ترس و تۆقان لە ناخی منداڵەکەدا دەچێنن و لە ڕاستییشدا ئەو منداڵە بەو شێوەیە بیر دەکاتەوە کە تەنها لە لای ئەوان ساغ و سلامەت دەبێت. ڕەنگە هەندێک لە دایکە دەسەڵاتخوازەکان، ئەم جۆرە هەڵسوکەوتانەی منداڵان بە بەڵگەیەک بۆ خۆشەویستبوونی خۆیان لای ئەوان لە قەڵەم دەدەن، بەڵام بە هەر حاڵ [پەیڕەوکردنی] ئەم شێوازە لە کاتی ڕوودانی کارەساتەکانی ژیاندا زیانێکی گەورە لە منداڵ دەگەینێت. خوویەکی دەروونیی کە هەر لە سەردەمی منداڵییەوە لە بوونی مرۆڤدا دادەڕێژێت و جێگیر دەبێت، هەندێک جار بە درێژایی ژیانی ئەو کەسە وازی لێ ناهێنێت و بەردەوام لەگەڵیدا دەبێت. زۆربەی ئەڤیندارەکان، خۆشەویستیی بە حەسارێکی قایم و پتەو دەزانن و پێیان وایە سەختیی و نەهامەتییەکانی ژیان ناتوانن هەرەسی پێ بهێنن.

زۆرێک لە پیاوان، ماڵەوە بە مەتەرێز و شوێنێک بۆ خۆشاردنەوە لە هەمبەر حەقیقەتدا دەزانن. وەها بیرکردنەوەیەک لە لایەن پیاوانەوە دەبێتە هۆی ئەوە کە ژنان خۆیان لە ڕیزی ئەو دایکانەدا دابنێن کە هەرگیز لە دنیای نەزانیندا تێر نابن. ئەم جۆرە بیرکردنەوەیەی پیاوان، نەک تەنها ژنان وا لێ دەکات حاڵەتی بەرەنگاریی بە خۆوە بگرن بەڵکوو تووشی سەرسووڕمانیشیان دەکات - بە گشتیی پێناسەکردنی سۆز کارێکی هێندە ئاسان نییە چوونکە پێدەچێت هەندێ توخمی نەناسراو دەوریان هەیە لە سڕینەوەی کاریگەرییە نەرێنییەکانی. هەر چەندە وەکوو مرۆڤێک باوەڕم بە بەرگریکردن لە سۆز هەیە و لە ئاستیدا کەمتەرخەم نیم، بەڵام پێم وایە بە چاوپۆشیکردن لە هاوسۆزیی و هاوخەمییە پڕبەدڵ و دۆستانەکان، ئەوە «سۆز»ە کە سیستمی کۆمەڵگایەکی بێهیوا دیاریی دەکات.

ئەو ترسە نەناسراوەی کە هەمیشە لە ئاست حاڵ و وەزعی دۆست و هاوڕێکانتاندا هەستی پێ دەکەن، هەڵقولاوی ئەو دڵەڕاوکێیانەیە کە وەک پەرچەکردارییەک دەری دەخەن و ڕوو لە زیادبوونیشە. بە پێی بیروڕا دەرخراوەکان، ئەم حاڵەتە شاردنەوەی مولکایەتییە و ڕەنگە یەکێک لەو بۆچوونانە بێت کە توێژینەوە لە سەر مەتەلۆکەی حەزی پیاوان لە ژنانی شەرمن و هێمن دەکات.

پێویستە ئەمەش بڵێم کە بەرگەگرتنی کارەساتەکان بەندە بە هێز و توانای تاکەکانەوە. کەسانێک کە تا ڕادەیەک گەییشتۆتە ئاستی کامڵبوون، ڕۆحێکی گەورەتریان هەیە بۆ بەرەنگاربوونەوەی کارەساتە تۆقێنەرەکان. لە کاتێکدا تاکی لاواز و شەرمن خوازیاری هیچ چەشنە گۆڕانێک لە بارودۆخی خۆیدا نییە. ئەو سۆزەی کە پێشکەشی تاکەکان دەکرێت، دوو کاریگەریی بەرچاوی هەیە. دەبێ ئەوەش بڵێم کە سەبارەت بە کاریگەریی [سۆز] لە سەر هەست (=ئیحساس)، پێشتر هەندێک قسەمان کرد بەڵام کە توێژینەوە لە سەر قۆناغەکانی تەمەن دەکەین بە تایبەت قۆناغی باڵقبوون، دەبینین کە پێشکەشکردنی سۆز گرینگییەکی یەکجار زۆری هەیە. لاوازیی ژن و پیاو لە بواری کردەوە سێکسییەکاندا گەندەڵیی و لەناوچوونی لێ دەکەوێتەوە و هەر دوو لایەنەکە بە هۆی بێبەشبوون لە گەورەترین چێژی ڕۆحیی، تووشی لەناوچوونی ڕۆحیی دەکات و شەوق و شادییان لێ دەستێنێتەوە و پەنابردنە بەر گۆشەگیرییان تێدا بەهێز دەکات. زۆربەی کاریگەرییە نەرێنییەکانی قۆناغی منداڵیی، لە پێوەندییە سێکسییەکانی قۆناغەکانی دواتردا بە شێوەیەک دەردەکەوێت کە تاکەکان لێی دەترسن. ئەم کێشەیە ڕەنگە لە ناو پیاواندا زۆر زیاتر خۆی نیشان بدات

چوونکە سروشتی ژنان وایە زیاتر گرینگیی بە تایبەتمەندییە دەروونییەکانی پیاوان دەدەن، بەڵام لە قەڵەمڕەوی ڕۆحیی پیاواندا ڕوخسار (دەموچاو) و جوانیی ژنان گرینگر و کاریگەرترە. دەبێ لێرەدا بە ڕاشکاوانە بڵێم ڕەفتاری بەرزی ژنان لە ڕووی تێکەڵاوبوون بە خواستی پیاوەوە، زۆر لە ڕەفتاری پیاو باشتر و گونجاوترە، چوونکە پێوەری هەڵسەنگاندن لەم دوو گرووپە جیاوازەدا، جیاوازیی زۆریان لەگەڵ یەکدیدا هەیە. سەرەڕای ئەمەش هێشتا دڵنیا نیم لەوەی کە بتوانرێت بە هۆی ڕوخساری جوانەوە، بەدەستهێنانی کەسایەتیی بەهێز دەستەبەر بکرێت بەڵام دەزانم کەسایەتیی لە ڕوانگەی ڕاڤەکارانەوە وشەیەکە کە باشتر و ڕێکوپێکتر دەرک و تێگەییشتنە دوورئەندێشانەکان نیشان دەدات.

تا ئێرە قسەم لە سەر ئەو خەم و خەفەتانەی تاکەکان کرد کە هەرگیز ناسڕێنەوە و لە ناو ناچن. لێرەدا دەمەوێ قسە لە سەر جۆرە سۆزێک بکەم کە لە لایەن مرۆڤەوە پێشکەش دەکرێت. دەرخستنی سۆز لەم حاڵەتەدا بە دوو شێواز ئەنجام دەدرێت کە یەکێکیان لە جوانیی و شکۆمەندیی ناکۆتای مەعریفەی ژیانەوە سەرچاوە دەگرێت و ئەویتریشیان دەربڕینی ترسێکی شاراوەیە. ئەوەی یەکەم بە لای منەوە شتێکی جوان و ڕێکوپێک و قابیلی ستایشکردنە و ئەوەی دووهەم، تەنها سووکنایی دەبەخشێت و هیچی تر. کاتێک لە هەوایەکی خۆش و سازگار و لە ناو پاپۆڕێکدا بە کەناری دەریایەکدا دەڕۆن، جوانییەکانی کەنارەکان ستایش دەکەن و چێژیان لێ دەبینن. ئەم حاڵەتە بە هۆی بینینی دیمەنە سروشتییەکانی کەنارەکەوە لای ئێوە دروست دەبێت و هیچ پێوەندییەکی بە پێداویستییە کەسەکییەکانتانەوە نییە. بەڵام ئەگەر پاپۆڕەکە تێک بشکێت و ڕوو لە نوقمبوون بکات و ئێوەش ناچار بن بە ناو شەپۆلەکاندا بەرەو کەنارەکان مەلە بکەن، لەو کاتەدا "کەنار"ەکە وەک شتێکی ڕزگارکەر لە قەڵەم دەدەن [و دەورێکی ڕزگارکەرانەی بۆ قایل دەبن] چوونکە بەدەستهێنانی تەندروستیی، گەورەترین ئامانجی مرۆڤە. جۆرە ڕەواکەی سۆز، جۆرە ئاسایشێکی ویژدانیی لە تاکدا دێنێتە ئاراوە چوونکە جیاوازیی نێوان بارودۆخی خۆی و خەڵکی دیکە نادیدە دەگرێت و جۆرەکەی تری، کە خۆی لە خۆیدا هیچ بایەخێکی لە ناو کۆمەڵگاکاندا نییە، زۆر سست و لەرزۆکە. بە هەر حاڵ لەو بابەتانەی کە قسەمان لە سەر کردن، بەم دەرەنجامە دەگەین کە جۆری یەکەمی سۆز، لە کاتێکدا دەردەکەوێت کە تاک بەرانبەر بە مەترسییەکانی دەروبەری خۆی کەمتەرخەمە و، جۆری دووهەمیش کاتێک دەردەکەوێت کە هەستی بێمتمانەیی تاک دەورووژێت. بە هەر حاڵ من نامەوێ پێشنیاری ئەوە بکەم کە ئەم جۆرە سۆزە، نابێ کاریگەریی و دەوری گرینگی لە ژیاندا هەبێت، بەڵام

له ڕاستییدا تێکەڵەیەکی هەر دوو جۆرەکەی سۆز، چارەسەری ڕاستەقینەی کاریگەرییەکانی نەبوونی ئاسایش و ترس و ورکە تەمومژاوییەکانە. بەڵام لە لایەکی دیکەشەوە دەبێ ئەوەمان لە بیر بێت کە سۆز بە یەکێک لە چالاکییە عاتیفییەکانی مرۆڤ و هەروەها یەکێک لە ئامانجە تایبەت و بەردەستەکانی سروشتی بوونەوەری زیندوو دێتە ئەژمار و نابێ سەرچاوەی ئەم نیعمەتە ترس بێت چوونکە ترس، گەندەڵیی و داڕزین و ناسەقامیی لێ دەکەوێتەوە. باشترین جۆری سۆزی دوولایەنە ئەوەیە کە لایەنێک بەوپەڕی ئارامش و ڕەزامەندییەوە دەرکی پێ بکات و لایەنەکەی تریش دەرک بە هەوڵ و تێکۆشانی لایەنی یەکەم بۆ بەخشینی ئەو سۆزە بکات [و لێی قبووڵ بکات]؛ کە لەم حاڵەتەدا هەموو دیمەن و لایەنەکانی ژیان، خۆش و دڵخواز و جوان دەبن. بەڵام جۆرێکی تر کە زیاتر لە ناو خەڵکدا باوە، سەرچاوەکەی دەگەڕێنەوە بۆ ئامانجگەلی خۆپەرستانە، چوونکە عاتیفە لە لایەن یەکێک لە لایەنەکانەوە وەک بابەتێکی نگریس و داڕزیو چاوی لێ دەکرێت و هەر بۆیە سەرجەم وزە و ئیرادە و تایبەتمەندییە مرۆییەکان بۆ هەندێ بەرژەوەندیی دیکە تەرخان دەکرێت. ئەم شێوازە لە بەر ئەوەی کە هەمیشە دەبێتە هۆی دۆڕانی یەکێک لە لایەنەکان، شێوازێکە کەسانی ملهۆڕ و خوێنمژ کەڵکی لێ وەردەگرن و لە ڕێگەیەوە هێز و وزەی قوربانییەکان (نێچیرەکانیان) هەڵدەمژن و بە گوێرەی ڕێسا بەرژەوەندیخواز و قازانخوازانەکانیان سست و لاواز و بێبەهایان دەکەن و تووشی بارودۆخێکی گەلێک نالەبار و دڵتەزێنیان دەکەن؛ ئەم کەسانە لە چارەسەرە ڕاستەقینەکان دوور کەوتوونەتەوە بەڵام هەرگیز ناتوانرێت نکووڵی لە بوونی سۆزێک بکرێت کە تیایدا خێر و بەرژەوەندیی دوولایەنە ڕەچاو کرابێت، چوونکە هەر هەنگاوێک لە خێر و بەرەکەتێک دەچێت کە بە سەر هەر دوو لایەندا دەبارێت.

ئەو دەسەڵاتخوازان(پلەوپایەخوازان)ەی کە هیچ سۆزێک لە بوونیاندا نییە، بوونەوەرگەلێکی ڕقاویین کە نەک تەنها قۆناغی لاوێتیی خۆیان لە ناو دەبەن، بەڵکوو هەندێک هۆکار بۆ ناهەماهەنگیی و ناهاوسەنگیی سەرجەم قۆناغەکانی ژیان دەدۆزنەوە کە دواجاریش دەبێتە هۆی گەییشتنیان بە هەستی چەوساوەیی. نەفسی مرۆڤ لە شوورەی قایمی زیندانێک دەچێت کە ئەگەر حەز بە ڕزگار بوون بکات، دەبێ بە جووڵەیەکی ڕاستگۆیانە و چاونەترسانە لێی بێتە دەرەوە، چوونکە بە تەنها وەرگرتنی سۆز بەس نییە، بەڵکوو دەبێ تا بکرێت زیاتر و زیاتر پێشکەش بکرێت و ئەگەر هەر دووی ئەمانە هەماهەنگ و هاوسەنگ بن، هەندێ دەرەنجامی زۆر بەرچاوی لێ دەکەوێتەوە.

بەربەستە ڕۆحیی یان کۆمەڵایەتییەکان کە لە سەر ڕێگای گشتاندنی سۆزی دوولایەنەدا قوت دەبنەوە، زەرەر و زیانی زۆریان بە دواوەیە و هەر بۆیەش سیستمی ئەو جیهانەی کە تیایدا دەژین، بەردەوام زیان لە دەرکەوتە ڕەتکراوەکان دەبینێت. تاکەکان خۆ لە پەسن و پیاهەڵدانی دیتران دەبوێرن چوونکە لە وەهمە ناخەکییەکانی خۆیان دەترسن و لەوە دەترسن کە ئەو کەسانەی سۆزیان پێشکەش دەکەن بە ڕاستیی شیاو و شایستەی وەرگرتنی ئەو سۆزە نەبن، یان ڕەخنەکانی کۆمەڵگا ئەستەمیی و دژوارییەکان زیاتر بکات. ئەڵبەتە ئەم تاکانە لەم جۆرە بارودۆخانەدا، پاپارێزیی و لەسەرخۆبوون بە یەکێک لە بنەڕەتییترین پلانەکانی ژیان دەژمێرن و یەکێک لە هۆکارە بنەڕەتییەکانی ڕق و کینە باوەکانی ناو کۆمەڵگا مرۆییەکانیش هەر ئەمەیە. لە پێوەندییە سێکسییەکاندا هیچ زنجیرێکی نەپچڕاو بوونی نییە کە بەرەو سۆزی ڕاستەقینە کۆتایی بێت و هەندێ جار بە ئاسانیی دەتوانین لەوە تێ بگەین کە (پێداگریی/ سووربوون) دەورێکی گرینگی تێدا دەبینێت لە ڕووی دەستێوەردانەوە، چوونکە نهێنییەکان لە کەمترین ئاستیاندا دەدرکێندرێن. کەواتە لە پێوەندییە سێکسییەکاندا ئەمە خوارترین و نزمترین حاڵەتگەلێکن کە بە مێشکی مرۆڤدا ختووره دەکەن.

بە هەر حاڵ مەبەستی من چەسپاندن یان ڕەتکردنەوەی شەپۆلە ناتەکووزەکانی ئەم دەریا گرژ و ئاڵۆزە نییە، بەڵکوو دەمەوێ بڵێم تەنها ئەو پێوەندییە سێکسییانە بەهای ڕاستەقینەیان هەیە کە هیچ بۆنە و بەرژەوەندییەک لە پشتیانەوە نەبێت. پێوەندییە سێکسییەکان کاتێک بەرز و باڵا دەبن و بەهای ڕاستەقینەیان دەبێت کە بوون و ناخی هەر دوو لا تێکەڵ بە یەکتر ببێت و لە شێوەی «بوون»ێکی تازەی پڕ لە جوانیی و سەرنجڕاکێشییدا دەربکەوێت، چوونکە لە ناو هەموو جۆرەکانی خۆپاراستندا، خۆپاراستن لە خۆشەویستییدا ڕووخێنەرترین هۆکاری بەختەوەریی ڕاستەقینەیە.

## ١٣

### بنەماڵە

لە ناو هەموو ئەو دابونەریتانەی کە لە ڕابردووەوە بۆمان ماوەتەوە، هیچکامیان بێسەروبەرتر و ناتەکووزتر و هەوسارپچڕاوتر لە دابونەریتەکانی «بنەماڵە» نین.

سۆز و میهرەبانیی دایک و باوک و منداڵان بەرامبەر بە یەکتر، یەکێک لە هۆکارە بەرچاوەکانی بەختەوەرییە. لە سەردەمی ئێمەدا پێوەندیی نێوان دایک و باوک و منداڵان گوزارشت لە جیایی و لێکدوورکەوتنەوەیەکی عاتیفیی دەکات و دەتوانین بڵێین کە نۆ لە دەی هەموو ئەم جۆرە پێوەندییانە، لانیکەم بەدبەختیی بۆ لایەکیان لێ دەکەوێتەوە. نەتوانینی بنەماڵە بۆ ڕێکخستنی ئەم بەختەوەرییە بنەڕەتییە - کە بە ئاسانییش دەستەبەر دەبێت - یەکێک لە هۆکارەکانی جۆرە ناڕەزاییەکی قووڵە کە لەم سەردەمەی ئێمەدا بۆتە شتێکی گشتگیر (درمی). ئەو تاکە ڕۆشنبیرانەی کە دەیانەوێت پێوەندییەکی بەختەوەرانەیان لەگەڵ منداڵەکانیاندا هەبێت و ژیانێکی پڕ لە بەختەوەرییان بۆ دابین بکەن، دەبێ بیر لە پلەی مەعنەویی دایک و باوکان بکەنەوە و زۆر ئاقڵانە و ژیرانە هەنگاو باوێن.

پرسی بنەماڵە هێندە گرینگە کە نە دەتوانین لەم دەرفەتە کورتەدا باسی لێوە بکەین و نە دەشکرێت بە وتارێک حەقی خۆی بدەینێ.

من بە ناچار لێرەدا تەنها ئاماژە بەو پرسە تایبەتە خێزانییانە دەکەم کە دەبنە هۆی بەختەوەریی و دەبێ ئەوەش بڵێم ئێمە ناتوانین هەموو ئەو پرسانە تاوتوێ بکەین کە چاککردنی بارودۆخی بنەماڵە بەندە پێیانەوە، چوونکە هەر کەسەو بە پێی هێز و توانای خۆی بەرەوڕووی ئەم پرسانە دەبێتەوە و ئەگەر هەموویان بە کەڵکوەرگرتن لە یەک ڕێسا بخەینە بەر باس و

مشتومڕ، ئەوا کۆمەڵگا پێویستی بە زۆر گۆڕانکاریی بنەڕەتیی دەبێت. ئەڵبەتە ئەم سنووردانانە کاری ئێمەش ئەستەمتر دەکات چوونکە هۆکارەکانی ناکامکردنی بنەماڵە لەم سەردەمەدا زۆرن کە دەتوانین ئاماژە بە هەندێ بابەتی گرینگتر بکەین و تاوتوێیان بکەین، لەوانە: بابەتی ڕۆحیی، ئابووریی، کۆمەڵایەتیی، فێرکاریی و سیاسیی.

لە ناو چینی دەوڵەمەندی کۆمەڵگادا ژنان لە بەر دوو هۆ پێیان وایە کە لەم سەردەمەی ئێمەدا ئەرک و بەرپرسیارێتیی باوکان زۆر قورسترە لە سەردەمانی پێشووتر. ئەو دوو هۆیەش کە ئەم تەسەورەی لە لا دروست کردوون، یەکێکیان توانای کارکردنی ژنانی بێ مێرد و ئەوی دیکەش کەمتەرخەمیی و نابەرپرسیارێتیی خزمەتکارانی ناو ماڵانە. لە ڕابردوودا ژنان بە هۆی ئەو بارودۆخە نالەبارەی کە بۆ قەیرە کچان لە ئارادا بوو، یان دەبوایە بە ناچاریی هاوسەرگیریی بکەن یان لە ماڵەوە بەبێ هیچ سەربەستییەکی ئابووریی بمێننەوە و بۆ دابینکردنی بژێویی ژیانیش سەرباری دایک و باوک یان برا خۆبەزلزانەکانیان بن. ئەو ژنە هیچ کار و پیشەیەکی نەبوو تا کاتە پڕ لە بێزارییەکانی تەنیایی پێ بەرێتە سەر و بە چوونەدەرەوە لە زیندانی ماڵەوە دەرک بە چێژی ئازادیی بکات و هەر بۆیەش هەستی بە بێبەشیی دەکرد. هەروەها بۆ تێرکردنی حەزە سێکسییەکانی، نە دەرفەتێکی دەست دەکەوت و نە بۆ خۆشی حەز و ڕەغبەتی لە سەر بوو، چوونکە لەو باوەڕەدا بوو کە دامرکاندنەوەی ئەو حەزانە، بە ڕێگایەکی بێجگە لە هاوسەرگیریی، کارێکی قێزەون و ناڕەوایە و ئەگەر سەرەڕای هەموو خۆپاراستنەکانیشی، نامووس(شەرەف)ی لە لایەن پیاوێکی فێڵبازەوە بکەوتایەتە بەردەم مەترسییەوە، بەرەوڕووی بارودۆخێکی نالەباری هاوشێوەی چیرۆکی **قەشەی ویک فیلد** دەبووەوە کە بەم جۆرە باس کراوە:

«تەنها سیحرێک کە دەتوانێت ئەو ژنە بشارێتەوە و ونی بکات و
نەنگ و ڕیسواییەکانی لێمان بشارێتەوە و
پەشیمانیی و تۆبەیەکی گەورە بە نسیبی ئەڤیندارەکەی بکات
مەرگە».

قەیرە کچی ئەمڕۆ، بە بوونی ئەم بارودۆخەی ئێستاوە چیدی ئارەزووی مەرگ ناکات. ئەگەر خوێندنی باڵای تەواو کردبێت، سەرەڕای هەموو کێشەکانیش دەتوانێت ژیانێکی پڕ لە

ئارامش و ئاسوودەیی بۆ خۆی دابین بکات و ئەگەریش سەربەخۆیی ئابووریی بە دەست هێنا، دەتوانێت بەرەوڕووی دەسەڵاتی ئابووریی دایک و باوکی بوەستێتەوە و لە ئەنجامدا هاوسەنگییەکی ڕێکوپێکیان تێدا بێنێتە ئاراوە کە کەمتر بیر لە دەستێوەردانی کاروبارە کەسەکییەکانی بکەنەوە و ئەگەریش دەست بە لۆمەکاریی بکەن، چاوقایمیی و بەرگریکردنی منداڵەکەیان بێ ئاکامیان دەکات. کچێکی قەیرە کە کار و پیشەیەکی هەبێت، بە مەرجێک خاوەن دەرک و تێگەییشتن و ئاوەز و تا ڕادەیەک جوانییش بێت، تا ئەو کاتەی کە خۆی ئارەزووی منداڵبوون نەکات دەتوانێت چێژ لە ژیانی ببینێت. بەڵام ئەگەر ڕۆژێک حەز لە منداڵبوون بکات ناچارە هاوسەرگیریی بکات و لەوانەشە کارەکەی لەو پێناوەدا لە دەست بدات. تازە لەم قۆناغەدایە کە ڕێژەیەک لە ئارامشەکەی لە دەست دەدات و ناچارە بە داهاتێکی کەم، بژێویی ژیانی دابین بکات و خەرجەکانی ماڵەوەش بگرێتە ئەستۆ. دیارە ئەو ژنانەی کە چێژی سەربەخۆیی و بێنیازییان چەشتووە، هێندە بۆیان ئاسان نییە خەرجە پێویستەکانیان بخەنە ئەستۆی کەسی دیکە. هەر لە بەر ئەوەشە کە ژنانی بەئەزموون لە بواری سەربەخۆیی ئابوورییدا زۆر دوودڵن سەبارەت بە هاوسەرگیریی و منداڵبوون. بەڵام ژنێک کە بوێرانە بڕیاری هاوسەرگیریی دەدات، بە بەراورد لەگەڵ ژنانی سەردەمانی پێشوو، لەوە تێ دەگات کە بەرەوڕووی کێشەیەکی تازە بۆتەوە واتە کەمبوونی یاریدەدەر و خزمەتکار؛ هەر بۆیە بە ناچاریی لە ماڵەوە دەبەسرێتەوە و مل دەداتە بەر هەزاران کاری گەورە و بچووکی وا کە لەگەڵ پێگە و پلەوپایەشیدا نایەتەوە. هەروەها ئەوەش دەزانێت کە ئەگەر خۆی ئەم کارانە ئەنجام نەدات، دەبێ پرتەوبۆڵە و لۆمە و ڕەفتاری نەشیاوی ئەو خزمەتکارانە تەحەمول بکات کە زۆربەرشیان کارەکانیان بە ڕێکوپێکیی ڕاناپەڕێنن.

ژنی وازهێناو لە سەربەخۆیی ئابووریی، ئەگەر سەبارەت بە پەروەردەی منداڵان زەحمەتی کۆکردنەوەی زانیاریی سوودبەخشی دابێتە بەر خۆی، دەزانێت کە سپاردنی منداڵان بە پەرستار یان تەنانەت سپاردنی سەرەتاییترین کارەکانیش بە دیتران، لەوانەیە دەردەسەریی و مەترسیی گەورەی بە دواوە بێت. ئەم کارە لە کاتێکدا دەکرێ ئەنجام بدرێت کە تاک بتوانێت پەرستارێکی پسپۆڕ و بەئەزموون دامەزرێنێت. بە هەر حاڵ ژنی بەرباسی ئێمە ئەگەر بە هۆی کاری زۆرەوە جوانیی و ئەقڵ و ئاوەزی خۆی لە دەست نەدات، دیارە بەختێکی باشی هەبووە.

جیا لەوەش زۆربەی کات بە هۆی ئەنجامدانی هەر ئەم ئەرکانەوە ئەم جۆرە ژنانە بەها و پێگەی خۆیان لە لای مێردەکانیان لە دەست دەدەن. شەو، کاتێک پیاو دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە و ژنیش دەست دەکات بە قسەکردن لە بارەی کاروبارە ڕۆژانەکان، دەبێتە هۆی هیلاکیی و وەڕەسیی مێردەکەی. لە لایەکی تریشەوە ئەگەر ژن هیچ نەڵێت و بێدەنگ بێت، بە کەسێکی بیرئالۆز لە قەڵەم دەدرێت و ئەو لەخۆبوردوویییەی کە ژنان بۆ بەدنیاهێنانی منداڵەکانیان ئەنجامیان داوە، هێندە مێشکیان بە خۆوە سەرقاڵ دەکات کە مێردەکانیان فەرامۆش دەکەن و لە هەمان کاتدا خۆشیان بە شایەنی پاداشێکی گەورە و مەزن دەزانن. ئەم چاوەڕوانییە لە بەردەمی مێردێکی شەکەت و ماندوودا دەبێتە هۆی ئەوە کە ژن بە کەسێکی هیچوپووچ و کەللەپووت لە قەڵەم بدرێت و ئەمەش مەترسیدارترین و نادادپەروەرانەترین حوکمە بۆ کەسێک کە پاش ئەنجامدانی ئەو هەموو ئەرک و زەحمەتە، چاوەڕێی پاداش دەکات. بە گشتیی ئەنجامدانی ئەم ئەرکانە، بناغەی پێوەندییە بنەڕەتییەکانی بنەماڵە سست و ناسەقامگیر دەکات و ئەگەر قەیرانی داواکردنی منداڵ تێپەڕێنرێت، ژنی بەرباسی ئێمە وەک خۆی شاد و بەکەیف دەمێنێتەوە.

ئەوەی باس کرا لە ڕاستییدا تەنها بەشێکی زۆر کەمی کێشە و گرفتە ئابوورییەکانە؛ چەندین کێشە و گرفتی دیکەش هەن کە ڕێک هێندەی ئەمانە گەورە و گرینگن کە دەتوانین بۆ نموونە ئاماژە بە کێشەی بێ خانوویی و دەستنەکەوتنی خانوو لە شارە گەورەکاندا بکەین بە هۆی زۆری حەشیمەتەوە. شارەکانی چاخەکانی ناوەڕاست وەک گوندەکانی ئەمڕۆ بچووک و سنووردار بوون. منداڵان هێشتا فەرامۆشیان نەکردبوو کە شێعرە منداڵانەکان بە دەنگی بەرز و بە قیرە و هاوارەوە بخوێننەوە و، گوێمان لە دەنگیان دەبوو کە بە کۆرس دەیانوتەوە:

«تاقە درەختێک لە سەر پردەکە
سێوی فراوان لە سەر گردەکە
منداڵە گچکەی شاری لەندەنن
بە بەرد و تەختە دیانتەکێنن
خۆ هەڵدەهاوێن دیوار بە دیوار

سەر **پردی** لەندەن بە قیڕە و هاوار»

ئەمڕۆ چیدی تاوەری سەر کڵێسەی «پرد» نەماوە و منیش ڕێک نازانم کەی حەسارەکانی نێوان سێنت پۆل و پردی لەندەن ڕووخاون و ئەمەش دەرخەری ئەوەیە کە چەندین سەدە بە سەر ئەو سەردەمانەدا تێ پەڕیوە کە منداڵانی لەندەن توانیویانە چێژ لەم شێعرانە وەربگرن. کاتێکی زۆر بە سەر ئەو سەردەمەدا تێ نەپەڕیوە کە ئەم وڵاتە بچووک بووە و بۆ ژیان خۆش و لەبار بووە. لەو سەردەمەدا شارەکان ئەوەندە گەورە نەبوون و ئیمکاناتیش وەکوو ئەمڕۆ، هێندە لە شارەکاندا چڕ نەبووبووە کە نەتوانرێت وازیان لێ بهێنرێت. هەموو خانوویەک بە باخێکی گەورە دەورە درابوو؛ شتێک کە ئەمڕۆ بە دەگمەن دەبینرێت.

ئەمڕۆ لە "بەریتانیا"دا ژمارەی شارنشینان زۆر لە ژمارەی گوندنشینان زیاترە. لە "ئەمریکا"دا ئەم جیاوازییە زۆر کەمترە بەڵام بە خێرایی ڕوو لە زیادبوونە. شارانێکی وەک لەندەن و نیۆیۆرک هێندە گەورە بووگن کە ماوەیەکی زۆری پێ دەچێت بتوانیت لێیان بچیتە دەرەوە. زۆربەی ئەوانەی لەم شارانەدا دەژین دەبێ دڵیان بەو ئاپارتمان(شووقە)ە بچووکانەیان خۆش بێت کە تەنانەت بستێکیشیان بە سەر زەوییەوە نییە و، ئەوانەش کە داهاتی کەمتریان هەیە دەبێ بە بچووکترین خانوو قەناعەت بکەن. دیارە ئەگەر منداڵیشیان هەبێت ژیانی ناو جۆرە خانووانە زۆر ئەستەمتر دەبێت. لە ئاپارتمانەکاندا ژووری تایبەتی یاریی منداڵان و ژووری تایبەت بە دایک و باوکان بۆ ڕزگاربوون لە دەنگ و هەرای منداڵان، بوونی نییە. کەسانێک کە فەرمانبەری دەوڵەتن وایان پێ باشە لە دەرەوەی شاردا بژین کە دیارە منداڵانیش ئەمەیان زۆر پێ خۆشترە، بەڵام دابینکردنی چێژ و خۆشیی منداڵان، تا ڕادەیەکی زۆر پیاوی ماڵەوە شەکەت دەکات و لە ڕۆڵی ئاسایی ئەو وەک باوکی بنەماڵە کەم دەبێتەوە.

بە هەر حاڵ من نامەوێ قسە لە سەر ئەم کێشە گەورە ئابوورییانە بکەم چوونکە پێوەندییەکی ئەوتۆیان بەم بابەتەی ئێمەوە نییە، واتە هەوڵدان بۆ داگیرکردنی بەختەوەریی. کاتێک ئێمە بتوانین کێشە ڕۆحییەکانی نێوان دایک و باوک و منداڵانی ئەم سەردەمەی خۆمان چارەسەر بکەین، هەنگاوێکی گەورەمان بۆ بەدەستهێنانی بەختەوەریی هاوێشتووە. بەڵام پێویستە بڵێم ئەم کێشانە لە ڕاستییدا بەشێک لەو گرفتارییانەن کە بە هۆی دیمۆکراسییەوە سەریان هەڵداوە.

لە ڕابردوویەکی نە هێندە دووردا هەموو کاروبارێک بە پێی بڕیار و ویستی سەرۆکەکان ئەنجام دەدرا، واتە ئەوانەی هەموو بڕیارێکی تاکەکانیان بە دەستەوە بوو. ئەوان بە گشتیی کۆیلەکانی خۆیان خۆش دەویست چوونکە هۆی ئاسایش و ئاسوودەییان بوون. بەڵام کۆیلەکان ڕقیان لە سەرۆکەکانیان بوو - هەر چەند ئەمە دژی بنەماکانی دیمۆکراسیی بوو و نەدەتوانرا بگشتێنرێت و وەک شتێکی ڕەها سەیر بکرێت - سەرۆکەکان ئاگایان لە ڕقی کۆیلەکان بەرامبەر ئەوان نەبوو و بە هەر حاڵ هەستیان بە بەختەوەریی دەکرد. بە پەسەندکرانی بنەماکانی دیمۆکراسیی، ئەم باوەڕەش گۆڕدرا. ئەو کۆیلانەی کە لە ڕابردوودا ڕازیی و گوێڕایەڵ بوون، دەستیان بە دەربڕینی ناڕەزایی کرد و ئەو سەرۆکانەش کە هیچ گومانیان لە باڵادەستیی و مەزنایەتیی خۆیان نەبوو، کەوتنە ڕاڕایی و دوودڵییەوە.

سەرهەڵدانی ئەم دژایەتییە، ناکامیی و بەدبەختیی لێ کەوتەوە. من دژی بنەماکانی حکوومەتی دیمۆکراسیی نیم چوونکە ئەو کێشە و گرفتانەی کە باسیان لێوە دەکەین لە ناو هەموو گۆڕانکارییە گەورەکاندا دێنە ئاراوە، بەڵام نابێ ئەم ڕاستییەش فەرامۆش بکەین کە تا کاتێک ئەم قۆناغەی گۆڕانکاریی خەریکی بڕینی ڕێگای پێشکەوتن و پێشڤەچوونە، دنیا هەرگیز ڕووی ئاسایش و ئاسوودەیی بە خۆیەوە نابینێت.

دەتوانین بە گشتیی گۆڕان و وەرگۆڕانی پێوەندیی نێوان دایک و باوک و منداڵان، بە نموونەیەکی بەرچاوی گەشەسەندنی دیمۆکراسیی لە قەڵەم بدەین. ئەو ملکەچیی و گوێڕایەڵییە بێسێودوویەی کە لە ڕابردوودا لە منداڵان چاوەڕێ دەکرا، ئەمڕۆ چیدی وەک شتێکی شایستە چاوی لێ ناکرێت و دیارە دەبێ هەر واش بێت.

زانستی دەروونناسیی و پارادەروونناسیی (سایکۆلۆژیی و پاراسایکۆلۆژیی)، ترسیان خستۆتە دڵی دایک و باوکە خوێندەوارەکانەوە کە نەکات بەبێ ئەوە بە خۆیان بزانن کەمتەرخەمیی بکەن لە ئاست منداڵەکانیان و سۆزیان پێ نەبەخشن. ئەگەر ئەوان دایک و باوکی خۆیان ماچ بکەن ڕەنگە «گرێی ئۆدیپ»یان تێدا دروست بکات و ئەگەریش نەکەن ڕەنگە ئاگری ڕق و ئێرەییان تێدا هەڵگیرسێنن و ئەگەر بە زەبر و زۆر داوای ئەنجامدانی کارێک لە منداڵەکانیان بکەن ڕەنگە هەستی یاخیبوونیان تێدا بورووژێنێت و ئەگەر ئەمەش نەکەن ڕەنگە هەندێ خووی نادروستیان لە لا دروست ببێت.

کاتێک دایک و باوکان دەبینن منداڵەکانیان پەنجەی خۆیان دەمژن، بۆ ترساندنیان پەنا دەبەنە بەر هەموو کارێک، بەڵام تووشی سەرسووڕمان دەبن کاتێک دەبینن هیچیان پێ ناکرێت.

ئەو پلەوپایە و دەسەڵاتەی کە لە ڕابردوودا بۆ دایک و باوک قایل دەبوون، ئەمڕۆ گۆڕاوە بە پلەوپایەیەکی سست و لەرزۆک و ناسەقامگیر و پڕ لە گومانکاریگەلی ویژدانیی.

چێژ و خۆشییە سادە و ساکارەکانی ڕابردوو لە ناو چووگن و ئەمڕۆ بە هۆی ئازادیی نوێی ژنانی «بێ مێرد»ەوە، هەموو دایکێک ناچارە لەبەر خاتری پلەوپایەی لەخۆبوردووانەی دایکایەتیی، لەخۆبوردوویییەکی زیاتر لە خۆی نیشان بدات. لە وەها بارودۆخێکدا دایکانی بەویژدان چاوەڕێی شتی کەمتر لە منداڵەکانیان دەکەن بەڵام ئەو دایکانەی کە بە قەدەر پێویست هزر تەندروست و ڕۆشنبیر نین، چاوەڕوانیی زیاتریان هەیە. دایکانی ئاقڵ و لۆژیکیی، حەزەکانیان کۆنترۆڵ دەکەن و بە پارێزەوە هەڵسوکەوت دەکەن و بە پێچەوانەوە ئەو دایکانەی کە بەتاڵن لە ئاوەزی دەروونیی، چاوەڕێی ئەوە لە منداڵەکانیان دەکەن کە چێژ و خۆشییە لەکیسچووەکانی ڕابردوویان بۆ قەرەبوو بکەنەوە.

لە حاڵەتی یەکەمدا حەزەکانی منداڵ، پڕن لە بێهیوایی و لە حاڵەتی دووهەمدا بە هۆی ئەندێشەیەکی کاریگەر و بەهێزەوە دەورووژێت. لە هیچکام لەم حاڵەتانەدا ئەو بەختەوەرییە سادە و سروشتییەی کە بنەماڵە بتوانێت بە باشترین شێواز دابینی بکات، قابیلی دابینکردن نییە.

بە ڕەچاوکردنی ئەم هەموو کێشە و گرفتانە، ئایا دیسان جێی سەرسووڕمانە کە ڕێژەی زاوزێ ڕووی لە کەمبوونەوە ناوە؟ کەمبوونی ڕێژەی زاوزێ لە هەندێ کۆمەڵگادا هێندە کەم بۆتەوە کە ئەگەری ئەوە هەیە ژمارەی دانیشتووانیان زۆر کەم ببێتەوە. ئەڵبەتە ئەم پرسە ماوەیەکی زۆرە لە ناو چینی دەوڵەمەندی کۆمەڵگا و هەروەها وڵاتە پێشکەوتووەکاندا هاتۆتە ئاراوە. لە ئێستادا هیچ ئامارێکی دروستمان سەبارەت بە ڕێژەی زاوزێی چینی دەوڵەمەند بە دەستەوە نییە بەڵام بە یارمەتیی کتێبی جیەن ئایلین[١٠١] دەتوانین ئاماژە بە دوو حەقیقەت

١٠١ - Jean Aylin؛ یان "ژۆجین ئایلین". ئایلین ئەم پرسەی هێندەی پێوەندیی بە بارودۆخی چینی کارمەندەوە هەبێت و کاریگەریی لەسەر هەبێت، بە تێڕوانین و وردبینییەکی ئێجگار زۆرەوە لە کتێبی "**پەراوێزبوون و دوورکەوتنەوە لە پلەوپایەی دایکایەتیی و باوکایەتیی**"دا تاوتوێ کردووە.

بکەین. لە ساڵی ١٩١٩ تا ١٩٢٢ لە "ستۆکهۆڵم"دا ڕێژەی دووگیانیی (ئاوسبوون) لە ناو ئەو ژنانەیدا کە لە بوارێکدا پسپۆڕییان هەبوو، یەک لە سێی ژنانی تر بوو و، چوار هەزار خوێندکاری "ڤاڵسلی" ئەمریکا لە ساڵی ١٨٨٦ تا ١٩١٣ لە سەریەک سێ هەزار منداڵیان هەبووە؛ لە کاتێکدا ئەگەر تەنانەت لە هەندێ بارودۆخیشدا بیانویستایە ڕێ لە زیادبوونی حەشیمەت بگرن، هەر لەو ماوەیەدا دەبوایە هەشت هەزار منداڵ لە دایک بوونایە و هیچکامیشیان نەمردنایە. بێگومان ئەم تایبەتمەندییە باڵانە تایبەت بە ڕەگەزی "سپی"ن چوونکە پیاوان و ژنان بە هۆی بەرزبوونەوەی ئاستی زانیارییانەوە، بارودۆخەکە بۆ زاوزێ و وەچەخستنەوە بە نەگونجاو دەزانن چوونکە بە پێی ئامۆژگارییەکانی ئەم شارستانییەتە، نازایی و لە ئاکامدا وەستاندنی زاوزێ، کارێکی ئاسانە. شارستانییەتی سپی پێستەکان، سەرچاوەی زۆربوونی ڕێژەی زاوزێ و وەچەخستنەوە دەگەڕێنێتەوە بۆ ناشارستانیبوونی کۆمەڵگاکان و ئەم جیاوازییانەش هەمیشە لە ناو کۆمەڵگاکاندا هەبووە. لە سەردەمی هاوچەرخدا ژمارەی کەسانی ژیر و ئاقڵی نەتەوەکانی ڕۆژئاوا کەم دەبێتەوە و دەبێ بە کۆچکردنی کەسانی ئاگا و وریا لە وڵاتە ناشارستانییەکانەوە ئەم کەموکوڕییە قەرەبوو بکرێتەوە. بەڵام کێشەکە لەوەدایە کە ئەم کۆچبەرانە بە فێربوون و وەرگرتنی تەواوەتیی بناغەکانی شارستانییەتی وڵاتی نوێ، خۆ لە وەچەخستنەوە دەدزنەوە و کەواتە کەمبوونی ڕێژەی حەشیمەت وەکوو خۆی دەمێنێتەوە. شارستانییەتێک کە ئەم جۆرە تایبەتمەندییە باڵایەی هەبێت ناجێگیر و ناسەقامگیر دەبێت، مەگەر ئەوەی کە بیر لە چارەسەرێک بۆ پاراستنی پێگە و پلەوپایەی دایک و باوک بکرێتەوە.

خاوەنڕا پلەبەرزەکان کە خاوەنی مەعریفەی ئاکاریین، بەبێ پشتبەستن بە پرسە ئایینییەکانەوە لە سەرجەم وڵاتە ڕۆژئاواییەکاندا هەوڵیان داوە ئەم مەبەستە لە ڕێگەی ئامۆژگاریی و عاتیفییەوە بپێکن. ئەوان لە لایەکەوە دەڵێن ئەرکی سەرشانی هەموو ژن و مێردێکە تا هەر کاتێک ویست و ئیرادەی خوای گەورەی لە سەر بێت دەبێ منداڵیان ببێت. بەڵام ئەوان هیچ قسەیەک سەبارەت بەم منداڵانە کە پێویستیان بە تەندروستیی و بەختەوەریی هەیە، ناکەن. لە لایەکی ترەوە پیاوان لافی پیرۆزێتیی پلەی دایک لێ دەدەن و وای نیشان دەدەن کە بنەماڵەیەکی قەرەباڵغ (لە ڕووی ژمارەوە) هەر چەند منداڵی نەخۆش و خاوەن

پێداویستی تایبەتیشی تێدا بێت، دیسانەوە مایەی بەختەوەرییە. دەوڵەتیش لەم ڕووەوە هاوڕایە لەگەڵیاندا و بە چەک و تەقەمەنیی بۆ کاتی جەنگیان دەشوبهێنێت و بە پێویستیان دەزانێت. نابێ ئەم چەکە باشە ڕووخێنەرانە بەبێ کوشتن[ی دوژمنان] ئەم جیهانە گرژ و ئاڵۆزە بەجێ بێڵن. خاڵی سەرنجڕاکێش لێرەدا ئەوەیە کە هەموو بنەماڵەیەک تەنانەت بە کەمترین ئاگایی و زانیاریشەوە، تەنانەت ئەگەر ئەو هۆکارانە سەبارەت بە خەڵکی تر قبووڵ بکات، کە نۆرەی خۆی هات، ئامادە نییە قبووڵیان بکات.

فەلسەفەی ڕۆحیی ئەم کەسانە سەبارەت بە زیادکردنی وەچە، زۆر هەڵەیە. ڕەنگە ئەم جۆرە کەسانە بە تۆقاندنی خەڵک لە ئاگری دۆزەخ سەرکەوتن بە دەست بێنن بەڵام ئەمڕۆکە ژمارەیەکی زۆر کەمی خەڵک قسەکانیان بە هەند وەردەگرن و ئەم گوێلێگرتنەش ڕەنگە تەنها لە کاتێکدا ڕوو بدات کە قسەکانیان هەڕەشەی لەگەڵدا بێت بەڵام ئەویش ماوەیەک دواتر کاریگەریی خۆی لە دەست دەدات.

بەڵام بە گشتیی بیانووەکانی ئەم پرسە زۆر بێبەزەییانەن. ڕەنگە خەڵک گوێ نەدەن بەوەی کە خەڵکی تر بکەونە بەر گوللەی تۆپ و تفەنگ، بەڵام هەرگیز حەز ناکەن زیان بەر منداڵەکانی خۆیان بکەوێت و ڕەنگە هەر لە بەر ئەمەش بێت کە دەوڵەت هەوڵ دەدات چینی هەژار و نەدار لە نەزانیی و بێئاگاییدا بمێنێتەوە. بە پێی ئامارەکان لە وڵاتە هەژارەکانی لای ڕۆژئاوا نەبێت، لە هیچ وڵاتێکی دیکەدا ئەم هەوڵ و تەقەلایانە سەرکەوتوو نەبوونە. ژمارەیەکی ئێجگار کەمی پیاوان و ژنان وەک ئەرکێک چاو لە منداڵبوون دەکەن و جێبەجێشی دەکەن. ئەوان بیر لەوە ناکەنەوە کە ئایا وەها ئەرکێک لە ناو بیر و هزر و ویژدانی کۆمەڵگاشدا هەیە یان نا. پیاوان و ژنان لە بەر ئەوە منداڵیان دەبێت کە پێیان وایە بوونی منداڵ، ڕادەی بەختەوەرییان زیاتر دەکات، یان ڕەنگە لە بەر ئەوەش بێت کە بە ڕاستیی نازانن چۆن ڕێ لە منداڵبوون بگرن.

ئەم هۆکارەی دوایی، هێشتا گەورەترین هۆکاری زاوزێ و منداڵبوونە، بەڵام دیارە هێندە درێژە ناکێشێت. بە هەر حاڵ ئەگەر بڕیارە ڕەگەزی سپیی بمێنێتەوە و هەیمەنەی خۆی بە سەر شارستانییەتی جیهاندا بپارێزێت، دەبێ بیر لەوە بکاتەوە کە پلە و پێگەی دایک و باوکایەتیی

بۆ جارێکی دیکە بتوانێت بەختەوەریی و کامرانیی بگێڕێتەوە بۆ ئەو کەسانەی کە بە دوایەوەن.

ئەگەر سروشتی مرۆڤ لە دەرەوەی بارودۆخی ئەم سەردەمەی ئێستادا تاوتوێ بکەین بە ئاسانیی ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە پلە و پێگەی دایک و باوک لە ڕووی ڕۆحییەوە دەتوانێت باشترین و باڵاترین جۆری بەختەوەریی بۆ ڕەگەزی مرۆڤ دابین بکات. ئەمەش زیاتر لە ژناندا ڕوو دەدات بەڵام لە پیاوانیشدا زیاتر لەو ڕێژەیەی ڕوو دەدات کە نوێخوازەکان چاوەڕێ دەکەن. بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتری ئەم بابەتە دەتوانین کەڵک لە بەرهەمە ئەدەبییەکانی سەدەکانی ڕابردوو تا ئەم سەدەی دواییە وەربگرین: هێکووبا زیاتر لە پریام[١٠٢] چاودێریی منداڵەکانی دەکرد. مەکدۆف زیاتر لە هاوسەرەکەی منداڵەکانی خۆش دەویست و پێیاندا ڕادەگەییشت. لە سەردەمانی دێریندا ژن و پیاو بەوپەڕی حەز و ویستەوە و بە یەک ڕێژە، گرینگییان بە منداڵ و نەوەکانیان دەدا. لە چین و ژاپۆندا ئەم نەریتە تا ئەمڕۆش ماوەتەوە. ڕەنگە بتوانین بڵێین کە ئەم حەز و ئارەزووە بە هۆی ئەژدادپەرستییەوەیە. بە هەر حاڵ بە ڕای من ئەمە هەموو مەسەلەکە نییە و حەقیقەتەکە شتێکی ترە و مانەوەی بنەماڵە گوزارشت لە حەزی تاکەکان بۆ بەرزترین ڕێژەی گرینگیدان بە ئەژدادپەرستیی دەکات. سەبارەت بەو ژنانەی کە کار و پیشەیان هەیە و پێشتریش قسەمان لە سەر کرد، بینیتان کە پاڵنەری منداڵبوون تیایاندا تا چەند بەهێزە؛ لە ڕاستییدا دەبێ هەر واش بێت چوونکە ئەگەر وا نەبێت هیچ ژنێک ئامادەی ئەو لەخۆبوردووییە نییە کە شایستە و شیاوی دایکانە. من بەش بە حاڵی خۆم دەبێ بڵێم کە پلە و پێگەی باوکایەتیی، گەورەترین و باڵاترین بەختەوەرییەکە تا ئێستا بە نسیبم بووە و لەو باوەڕەشدام ئەگەر ژنان و پیاوان بە گوێرەی هەلومەرج واز لەم بەختەوەرییە بێنن، پێداویستییەکی قووڵی بەدینەهاتوو لە بوونیاندا ڕەگ دادەکوتێت و جۆرێک لە ناڕەزامەندییان تێدا دەچێنێت کە ڕەنگە دواتر هەندێ کێشەی ویژدانییان بۆ دروست بکات

١٠٢ - Hecuba؛ هێکووبا لە چیرۆکی ئیلیاد و "هۆمەر"دا ژنی "پریام"ە Priam و دایکی هێکتۆر Hector و پاریس Paris و چەند کەسێکی دیکەش کە یۆنانییەکان "پۆلیکسنا" «Polyxena»ی کچیان بۆ ئاشیل قوربانیی کرد و هەر هەمان ئەو ڕۆژە تەرمی کوڕەکەشیان کە پۆلیمێنستۆر Polymenstor کوشتبووی، لە دەریاوە هێنایەوە و بەڵێنی دا بە کوشتنی پۆلیمێنستۆر و منداڵەکانی، تۆڵەیان لێ بکاتەوە.

کە هەمیشە بە نەناسراوییش دەمێننەوە. بۆ بەختەوەربوون لەم جیهانەدا - بە تایبەت کاتێک کە قۆناغی لاوێتیی تێپەڕیوە - دەبێ تاک ئەو هەستەی لە لا دروست نەبێت کە تاقە ڕەوتی چارەنوسساز و دەسنیشانکەری ژیان لە کۆتایی خۆی نزیک بۆتەوە، چوونکە بوونی هەموو کەسێک بەشێکە لە ڕەوتی ژیان کە بە دەرکەوتنی یەکەم نوتفە دەستی پێ کردووە و تا داهاتوویەکی دوور و نادیار - کە بۆ ئێمە وەک کۆتایی دێتە ئەژمار - درێژەی دەبێت. بە واتایەکی ڕوونتر؛ ئەگەر بمانەوێ ئاگایانە پێڕەویی لە ئیحساساتی خۆمان بکەین، بابەتی بەرباس، پێویستی بە جۆرە بیرکردنەوەیەکی ئەقڵانیی و سەروومرۆیی سەبارەت بە جیهان هەیە. بەڵام ئەگەر نابەرهەستانە (ناخودئاگا) و بە پێی ئیحساساتی غەریزییەوە بیری لێ بکەینەوە، ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە دەگەڕێتە بۆ سەردەمانی بەربەرییەتی مرۆڤ و بە شتێکی لۆژیکیی نایەتە پێش چاو و ئەگەر لەو سۆنگەیەوە لێی بڕوانین، نەبوونی باشترە [وەک لە بوونی]. کەسێک کە دەتوانێت کارێکی شیاو و شایستە ئەنجام بدات، ناوی خۆی وەک کەسێکی نەمر تۆمار دەکات و ڕەنگە ئەم حەزەی خۆی بە ئەنجامدانی کارێک لە باشترین شێوازیدا بەدیی بێنێت؛ بەڵام ئەو ژن و پیاوانەی کە بەهرەیەکی تایبەتی ئەوتۆیان نییە، بە تەنها بوونی منداڵ دەتوانێت ئەم هەست و حەزەیان بێنێتە دی. ئەوانەی کە لێدەگەڕێن پاڵنەرە داهێنەرانەکانیان بێکەڵک و بێفایدە بمێننەوە، بە جیاکردنەوەی خۆیان لە ڕەوتی ژیان بەرەو پیری مەترسیی لەناوچوون دەچن. لای ئەوان - ئەگەر شتێکی ئاوارتە لە ژیانیاندا ڕوو نەدات - مەرگ خاڵی کۆتایی هەموو شتێکە و هیچ لێکدانەوە و شیکارییەکیان بۆ ئەو دنیایەش نییە کە پاش ئەوان دێت و، هەر بەم هۆیەشەوە کار و کردەوەکانیان بە کەمبایەخ و بێهوودە چاو لێ دەکەن. پیاو یان ژنێک کە لە قوولایی دڵەوە سۆز و میهرەبانیی بەرامبەر بە منداڵ و نەوەکانی دەنوێنێت، دیارە داهاتووی بە لاوە زۆر گرینگە و کەسێک کە حەزەکانی تا ئەوپەڕی چاوەڕوانییەکانی بەدیی هاتگن، دیسانەوە دەتوانێت پەرە بە حەز و ئارەزووەکانی بدات؛ بۆ نموونە کارێک کە حەزرەتی ئیبراهیم کردی. ئەو دڵی زۆر بەوە خۆش بوو کە سەرەنجام سەرزەمینی بەڵێندراو بە تەواوەتیی دەبێت بە موڵکی نەوەکانی ئەو - هەر چەند ئەم ڕووداوە درەنگتر و بۆ نەوەکانی دواتر لە خۆی ڕووی دا. بە هۆی ئەم جۆرە ئیحساسانەوەیە

کە مرۆڤ دەتوانێت خۆی لەو هۆکارانەی بێهوودەیی کە هەست و عاتیفەکان نابوود دەکەن ڕزگار بکات.

بناغە و بنەڕەتی بنەماڵە لە سەر ئەم حەقیقەتەدا ڕاوەستاوە کە دایک و باوکان سۆز و میهرەبانییەکی تایبەتیی بە منداڵەکانیان ببەخشن - سۆزێک کە جیاوازیی هەیە لەگەڵ ئەوەی کە بەرامبەر بە نەوەکانی تر و منداڵی کەسانی دیکە هەیانە. لە ڕاستییدا هەندێک لە دایک و باوکان سۆزێکی کەم بەرانبەر بە منداڵەکانیان دەنوێنن و تەنانەت هەندێ جاریش هیچ سۆزێکیان بەرامبەر نانوێنن، بەڵام بەو حاڵەشەوە دەبینین کە هەندێک ژن منداڵی کەسانی تریان وەک منداڵانی خۆیان خۆش دەوێت. بەڵام ئەوەی ڕاستیی بێت سۆزی دایک و باوک شتێکی ترە و ئەو سۆز و خۆشەویستییەش کە هەموو مرۆڤێک بەرامبەر بە منداڵی خۆی هەیەتی و بەڵام ناتوانێت هەمان ئەو سۆزەی بۆ کەسانی دیکە هەبێت، شتێکی ترە. خۆشویستنی منداڵ یەکێکە لەو هۆکارانەی کە لە باوباپیرانمانەوە بە میرات بۆمان ماوەتەوە. لەم بارەوە بە ڕای من بۆچوونی فرۆید وەکو پێویست پشتی بە ڕێساکانی زانستەوە قایم نییە چوونکە بە وردبوونەوە لە هەڵسوکەوتی ئاژەڵی دایک لەگەڵ بێچووەکانیدا دەبینین کە جیاوازییەکی زۆری هەیە لەگەڵ هەڵسوکەوتیدا بەرامبەر بە ئاژەڵی نێر کە دابینکەری پێویستییە سێکسیی و عاتیفییەکانێتی. هەر ئەم شێوازە جیاواز و غەریزییە، بە شێوەیەکی چاکسازیی تێداکراو و حەتمیی لە ناو تاکەکانی مرۆڤیشدا دەبینرێت. ئەگەر وەها پاڵنەرێک بوونی نەبوایە شتێک بە ناوی بنەماڵە پێک نەدەهات. چوونکە دەتوانرێت پەروەردەکردنی منداڵان بخرێتە ئەستۆی کەسانی پسپۆڕ و شارەزا. بەڵام ئێستا کە دۆخەکە وای لێ هاتووە، ئەو سۆزە تایبەتییەی کە دایک و باوک پێشکەشی منداڵانی خۆیان دەکەن، هەم بۆ دایک و باوکان و هەمیش بۆ منداڵەکانیان زۆر بایەخدارە.

سۆزی دایک و باوک هێندە گرینگ و هێندە بایەخدارە کە زیاتر لە هەموو جۆرە سۆز و عاتیفەیەکی دیکە جێی باوەڕ و متمانەیە. هاوڕێکانمان ئێمەیان لەبەر خاتری شایستەیی و لێهاتووییمانەوە خۆشیان دەوێین و کەسی دڵدۆڕاو و ئەڤینداریش لە بەر جوانیی و سەرنجڕاکێشییە کە خۆشەویستەکەی خۆی خۆش دەوێت و ئەگەر شایستەیی و جوانییەکەی لە ناو بچێت، چیدی هیچ بیانوویەک بۆ درێژەدانی خۆشەویستیی و ئەڤینداریی نامێنێتەوە.

بەڵام مرۆڤ تەنانەت لە سەختترین و ناخۆشترین بارودۆخیشدا و لە کاتی داماویی و گرفتارییشدا دەتوانێت پشت بە دایک و باوکییەوە ببەستێت.

کاتێک کەسێک مەتح و ستایشی بەهرە و شایستەییەکانمان دەکات هەست بە شادیی و خۆشییەکی لە ڕادەبەدەر دەکەین بەڵام زۆربەمان گەمژەتر لەوەین کە بزانین ئەم جۆرە ستایش و پیاهەڵدانانە درۆزنانە و ساختەن. دایک و باوکمان خۆشیان دەوێین چوونکە منداڵیانین و ئەمەش ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگرە، بۆیە زیاتر لە هەموو کەسێکی تر متمانەیان پێ دەکەین و لەگەڵیاندا هەست بە ئاسوودەیی و ئارامش دەکەین. ڕەنگە لە چرکەساتەکانی سەرکەوتنندا بە قەدەر پێویست هەست بەم ڕاستییە نەکەین بەڵام لە کاتی شکست و تێکچوونەکانماندا سووکناییمان پێ دەبەخشێت و هیچ شوێنێکی ئەمن و ئاسایشتر لە چوارچێوەی بنەماڵەمان پێ شک نابردرێت.

لە هەموو پێوەندییەکی مرۆییدا دابینکردنی بەختەوەریی یەکێک لە لایەنەکان تا ڕادەیەک ئاسانە بەڵام دابینکردنی بۆ هەر دوو لایەنەکە کارێکی ئەستەمە. لەوانەیە بەندیوان چێژ لە بەندکردنی کەسی دەستبەسەرکراو وەربگرێت و خاوەنکاریش حەز بە تووڕەبوون لە فەرمانبەرەکانی بکات یان حوکمڕانێک کە بەوپەڕی دەسەڵاتدارییەوە فەرمانڕەوایی بە سەر خەڵکانی ژێردەستیدا دەکات، خۆی بە کەسێکی بەختەوەر بزانێت و بێگومان باوکێکی مێشک ڕزیو هەست بە خۆشحاڵیی دەکات کاتێک کە بە شوول لە منداڵەکەی بدات و وانەی تەقوا و خواترسیی پێ بڵێتەوە. بەڵام دیارە هەموو ئەم چێژ و خۆشییانە یەک لایەنەن و لایەنی بەرامبەر ئەم دۆخەی بە دڵ نییە. کەواتە دەبینین کە چێژ و خۆشییە یەک لایەنەکان ناخۆش و نالەبارن. بە باوەڕی من پێوەندییە مرۆییەکان دەبێ ببنە هۆی ڕەزامەندیی و دڵخۆشیی هەر دوو لا و بەرەو ئامانجی یەکچەشنیان ببەن. بە تایبەتیی ئەم پرسە سەبارەت بە پێوەندیی نێوان دایک و باوک و منداڵان ڕاستیی لە خۆ دەگرێت. دایک و باوکانی ئەم سەردەمەی ئێستا لە پێوەندیی لەگەڵ منداڵەکانیاندا لە چاو ڕابردوو، خۆشیی و شادییەکی کەمتریان بە نسیب دەبێت و منداڵانیش ڕەنج و ئازارێکی کەمتر لە وەچەکانی پێش خۆیان لە دایک و باوکیان دەبینن. من هیچ بیانوویەک بۆ ئەوە نابینم کە دایک و باوکان لە چاو ڕابردوو، بەختەوەرییەکی کەمتر لە لایەن منداڵەکانیانەوە بە نسیبیان ببێت و هەروەها هیچ

بیانوویەکیش بۆ ئەوە نابینم کە دایک و باوکان لە دابینکردنی بەختەوەریی منداڵەکانیاندا کەمتەرخەمیی بکەن. بەڵام ئەم قسەیەشم وەکوو هەموو قسەکانی ترم سەبارەت بە پێوەندیی نێوان خەڵکانی دنیای مۆدێرن، بەندە بە دەربڕینی هەست و سۆز و میهرەبانیی و ڕێزگرتن لە کەسایەتیی دیتران و بە هیچ شێوەیەک هەڵچوون و شەڕاشۆیی، نابێتە هۆی هاندان و بەرەوپێشچوونی. با ئێستا بەختەوەریی هەڵقوڵاوی پلەی دایک و باوکایەتیی تاوتوێ بکەین. سەرەتا لە ڕوانگەی ژیانەوە باسی لێ دەکەین و پاشانیش ئەگەر بۆمان کرا دەپەرژینە سەر دۆخی دایک و باوکان و ئەو جۆرە ڕەفتارانەی کە بەرامبەر بە کەسایەتیی دیتران دەینوێنن. ئەڵبەتە ئەوەشمان لە بیر نەچێت کە باس باسی بنەڕەتیترین بنەمای جیهانییە، واتە بنەمای یەکسانیی مرۆڤ، کە ئەویش بۆ خۆی دەرەنجامی پێکەوە ژیانی کۆمەڵایەتییانەی مرۆڤە.

بە پێی چەمکە ڕوونەکان سەرچاوەی سەرەکیی چێژ و خۆشیی پلەی دایک و باوکایەتیی، دوو ڕەهەندی هەیە: لە لایەکەوە ئەم هەستە لە ئارادایە کە بەشێک لە «بوون»ی دایک و باوکان جۆرە ڕواڵەتێکی دەرەکییانە بە خۆوە دەگرێت کە تەنانەت دوای مەرگیش ئەو بەشە درێژە بە ژیان دەدات. بەم شێوەیە هەرمان و نەمریی وەچەکانی مرۆڤ مسۆگەر دەبێت. لە لایەکی تریشەوە تێکەڵەیەکی خەستوخۆڵ لە هەستی دەسەڵاتخوازیی و سۆز و خۆشەویستیی و دڵسۆزیی دێتە ئاراوە. منداڵی شیرخۆرە، لاواز و بێهێزە. بە پێی غەریزە دەبێ پێداویستییەکانی دابین بکرێت. هەر بە هۆی ئەمانەوەیە کە نەک تەنها سۆزی دایک و باوک بەرامبەر بە منداڵ، بەڵکوو حەزی دەسەڵاتخوازییان بەرامبەر بە منداڵەکەیان تێر دەبێت. مادامێک منداڵ هەست بە داماویی و لاوازیی دەکات، بەخشینی سۆز و خۆشەویستیی لە خۆپەرستییەوە سەرچاوە ناگرێت، چوونکە پاڵپشتیی و پشتیوانیکردن بەشێکە لە بوونی مرۆڤ و، زیان گەیاندن لەگەڵ سروشت و ناوەڕۆکیدا نایەتەوە. هەر لە هەمان سەرەتای لەدایکبوونی منداڵەوە و هاتنی بۆ ناو ژیانی دایک و باوک، گێرمەوکێشەی نێوان حەزی دەسەڵاتخوازیی دایک و باوک لە لایەکەوە و حەز و ئارەزوویان بۆ بەختەوەریی و سەرکەوتنی منداڵ لە لایەکی دیکەوە دێتە ئاراوە. سەرەڕای کەمبوونەوەی هێدی هێدی هێز و دەسەڵاتی دایک و باوک، منداڵ دەبێ هەرچی زووترە لەوە تێ بگات کە هەر چۆنێک بووە پشت بە خۆی ببەستێت و سەربەخۆیی خۆی بە دەست بێنێت و دیارە ئەمەش لەگەڵ سروشتی

دەسەڵاتخوازیی دایک و باوکدا نایەتەوە. هەندێک دایک و باوک هەرگیز دەرک بە جەوهەری ئەم جیاوازییە ناکەن و تا ئەو کاتەی کە منداڵەکانیان یاخیی نەبوونە و سەرکێشییان نەکردووە، درێژە بە دەسەڵات و چەوساندنەوەیان دەدەن. هەندێکیش ڕەنگە هەست بە پارادۆکس بکەن و بۆیە هەندێ سۆز و عاتیفەی «پارادۆکسیکاڵ»یان تێدا دروست دەبێت.

لە درێژەی وەها گۆڕانکارییەکدا بەختەوەریی دایک و باوک تەفروتوونا دەبێت. پاش ئەو هەموو گرینگیی و چاودێرییەی کە دایک و باوک دەرحەق بە منداڵەکانیان نواندوویانە، تازە بەوە دەزانن کە منداڵەکەیان شتێکی سەرسووڕهێنەر و نائاسایی لێ دەرچووە. بۆ نموونە ئەوان حەز دەکەن مەیلی جەنگ و شەڕاشۆیی لە منداڵەکەیاندا پەروەردە بکرێت، کەچی منداڵەکەیان بە جیاوازییەکی زۆرەوە لایەنگری ئاشتیی و ئاشتەواییە. ئەم نموونە سەبارەت بە تۆلستۆی بە تەواوەتیی ڕاستیی لە خۆ دەگرێت. دایک و باوکی لیۆی بچووک حەزیان دەکرد کەسێکی ئاشتیخواز بێت بەڵام ئەو پەیوەست بوو بە حیزبی کۆنەپەرستەکانەوە[١٠٣] و ڕێگای جەنگ و شەڕاشۆیی گرتە بەر.

بە هەر حاڵ تەنها لەم نموونەی دواییدا نییە کە کێشەکان دەردەکەون. ئەگەر خواردن بە منداڵێک بدەن کە خۆی توانای خواردنی هەیە، لە ڕاستییدا حەزی دەسەڵاتداریتان پێ باشتر بووە وەک لە ئاسایش و ئاسودەیی ئەو منداڵە، هەر چەند مەبەستی ئێوە تەنها یارمەتیدانی ئەو بووە. ئەگەر زیاتر لە ڕادەی پێویست منداڵ بترسێنن، ئەگەری ئەوەی هەیە کە ئێوە دەتانەوێت ئەو منداڵە هەرچی زیاتر پشت بە ئێوەوە ببەستێت و ئەگەر زیاد لە پێویست سۆزی لەگەڵ بنوێنن، ڕەنگە چاوەڕێی ڕەفتارێکی لەو شێوەیەی لێ دەکەن و مەبەستتان ئەوەیە کە بە هۆی هەست و سۆز و عاتیفەوە ئەو منداڵە زیاتر بە خۆتانەوە ببەستنەوە. بە هەزاران هۆی گەورە و بچووک، هەستی مولکایەتیی و زاڵبوونی دایک و باوکان، سەر لە منداڵەکانیان دەشێوێنێت مەگەر ئەوەی کە دایک و باوکان بە نییەتپاکییەوە چاودێرییان بکەن. دایک و باوکانی ئەمڕۆ کە ئاگایان لەم مەترسییانە هەیە، هەندێ جار بە هۆی نەبوونی باوەڕبەخۆبوونیانەوە کۆنترۆڵی پەروەردەی منداڵەکانیان لە دەست دەردەچێت و تووشی هەڵەگەلێک دەبن کە

١٠٣ حیزبێک کە خاڵی بەرامبەری لیبراڵ و ڕادیکاڵ بوو.

زیانێکی گەورە بە منداڵەکانیان دەگەینێت. هیچ شتێک هێندەی ڕەفتاری هەڵقوڵاوی بێمتمانەیی و باوەڕبەخۆنەبوونی دایک و باوکان، کاریگەریی خراپ لە سەر هزر و مێشکی منداڵ دانانێت. ئەو دایک و باوکانەی کە لە قووڵایی دڵەوە لە پێناوی بەختەوەریی منداڵەکانیان واز لە هەموو حەز و ویست و دەسەڵاتخوازییان دێنن، ئەگەر کەسانێکی ئاقڵ بن، بۆ پەروەردەکردنی دروستی منداڵەکانیان چیدی پێویستیان بە کتێبگەلی دەروونناسیی و تایبەت بە پەروەردەی منداڵ نابێت. لەم حاڵەتەدا پێوەندیی نێوان دایک و باوک و فرزەند هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی، هەماهەنگ دەبێت و هیچ پاڵنەرێکی سەرکێشیکردن لە منداڵدا نایەتە ئاراوە و لە ئەنجامیشدا نابێتە هۆی دەستەوەستانیی و داماویی دایک و باوک. بەڵام ئەمە تەنها لە کاتێکدا دەکرێت کە دایک و باوک ڕێز لە کەسایەتیی منداڵ بگرن و ئەم ڕێزگرتنەش دەبێ لە قووڵایی دڵەوە و بە باوەڕێکی وەها پتەوەوە ئەنجام بدرێت کە هەستی موڵکایەتیی و دەسدرێژیی و دەستێوەردان بە تەواوەتیی بسڕێتەوە. ئەم شێوە ڕەفتارە نەک تەنها سەبارەت بە منداڵان بەڵکوو لە بواری پرۆسەی هاوسەرگیریی و هەروەها دنیای هاوڕێیەتیشدا زۆر پێویستە و، ئەوەشمان لە بیر نەچێت کە لە بواری هاوڕێیەتیدا ڕەچاوکردنی ڕێزگرتن کارێکی هێندە ئەستەم نییە. لەم جیهانە پڕ پیت و بەرەکەتەدا وەها ڕێسایەک تەنانەت دزە دەکاتە ناو پێوەندییە سیاسییەکانی تاکەکانیشەوە. ئەڵبەتە ئەم هیوایەتە لە داهاتوویەکی زۆر دووردا دێتە دی و نابێ لێرەدا لەوە زیاتر لە سەری بڕۆین، بەڵام چوونکە پێویستیی ئەم نەرمونیانیی و میهرەبانییە، شێوەیەکی جیهانیی هەیە، پێویستە هەر کاتێک پێوەندیی بە چۆنیەتیی ڕەفتاری منداڵێکەوە هەبوو، لە پێناوی بەختەوەرییاندا گرینگیی زیاتری پێ بدرێت چوونکە منداڵان لە ڕووی جەستەوە لاواز و ناتەوانن و لە بەر ئەوەشە خەڵکی [نەزان و] ڕەشۆکیی سووکایەتییان پێ دەکەن.

لە خستنەڕووی بابەتەکانی ئەم کتێبەدا دەبێ ئاگامان لەوە بێت کە چێژ و خۆشیی تەواوەتیی پلە و پێگەی دایک و باوکایەتیی لەم دنیا نوێیەدا، تەنها بە نسیبی کەسانێک دەبێت کە باوەڕی تەواویان بە هەڵسوکەوتی ڕێکوپێک لەگەڵ منداڵدا هەبێت و پراکتیزەی بکەن - ئەو جۆرە ڕەفتارەی پێشتر ئاماژەم پێدا. چوونکە بە بوونی ڕەفتارێکی ڕێکوپێک و لۆژیکیی، هیچ منداڵێک بە پێویستی نازانێت یاخیی ببێت و سەرکێشیی بکات و هەستیی

دەسەڵاتخوازیی دایک و باوکی زامدار بکات. لە لایەکی تریشەوە پێویست بە سووکایەتیپێکردنی منداڵ ناکات. بە گرتنەبەری ڕەفتاری لەم جۆرە، نە سەرکێشیی ڕوو دەدات و نە ترسی ئەوەی کە منداڵ وازی لێ بێنێت.

دایک و باوکان دەبێ بۆ گەییشتن بە پلەی پیرۆزی دایکایەتیی و باوکایەتیی، خۆیان بە زانست و زانیاریی پێویست تەیار بکەن و لە تەنیشت ئەم زانستەشەوە یارمەتیی لە ئەڤین و خۆشەویستیی پاکیان وەربگرن و هەوڵی سەلماندنی هێز و دەسەڵاتی خۆیان بە سەر منداڵەکانیان نەدەن.

هەر چەند بایەخی زۆر بۆ هەستی دایک و باوکایەتیی قایلم و هەروەها سەرەڕای دابونەریت و ڕێوشوێنە باوەکان پێم وایە نابێ دایکان زیاد لە پێوی‌ست دەستێوەردانی کاروباری منداڵەکانیان بکەن. ئەگەر لە ڕابردوودا دایکان بۆیان هەبوو کە زیاد لە پێویست خۆیان بە چاودێریکردنی منداڵەکانیانەوە هیلاک بکەن، لە بەر ئەوە بوو کە پرسەکانی پێوەندیدار بە پەروەردە و ڕاهێنانی منداڵ گەشەیەکی ئەوتۆی نەکردبوو و دایکان زانیارییان لە دایکە بەساڵاچووەکانی خۆیانەوە بە دەست دێنا. بەڵام ئەمڕۆکە شێوازی پەروەردە بە شێوەیەکی تەواو پراکتیکیی، ئەم هەلە بۆ دایکان نارەخسێنێت کە بە سەپاندنی بیروڕاکانیان، منداڵەکانیان بخەنە ژێر گوشارەوە.

ئەمڕۆ کەسانێکی زۆر لە بواری چاودێریی و پەروەردەی منداڵدا خاوەن پسپۆڕیی و خوێندنی تایبەتن و کەڵک لە زانیارییەکانیان وەردەگیردرێت. ئەو بەشەی پەروەردە و فێرکاریی منداڵان کە بە «پەروەردە و فێرکاریی منداڵ» ناودێر کراوە، بەرەوڕووی ئەم کێشانە نابێتەوە. هیچ کەسێک چاوەڕێی ئەوە لە دایک ناکات منداڵەکەی فێری بیرکاریی بکات تەنانەت ئەگەر زۆریش خۆشی بوێت. منداڵان دەتوانن زانیاریی پێویست لەو کەسە خوێندەوارانەوە فێر بن کە شارەزاتر لە دایکیانن، بەڵام سەبارەت بە لقەکانی تری پەروەردە و فێرکاریی منداڵان، مەسەلەکە زۆر لێڵ و تەماوییە چوونکە ئەو ئەزموونانەی بە دەست هاتوون بە قەدەر پێویست نین و دیارە دایکان هەندێک لە کاروبارەکانی منداڵان باشتر ئەنجام دەدەن. وردە وردە کە منداڵ تەمەنی زیاتر دەبێت، ژمارەی ئەو کەسانەش کە شایستەیی ئەنجامدانی ئەم کارەیان دەبێت زیاتر دەبێت.

ئەگەر ڕاستیی مەسەلەکە وەکوو پێویست بۆ هەمووان دەربکەوێت، دایکان به دەست زۆر کاری وەڕسکەر و جاڕسکەرەوە ڕزگاریان دەبێت. دایکان لە هەموو بوارەکاندا پسپۆڕیی و زانیاریی تەکنیکیی پێویستیان نییە و ئەو ژنەش کە خاوەن لێهاتوویی و پسپۆڕییە، هەم لە پێناوی خۆی و هەم لە بەرژەوەندیی کۆمەڵگادا و هەروەها بۆ ئەوەی کە بتوانێت ئازادانە پەرە بە تواناییەکەی بدات، دەبێ واز لە پلەی دایکایەتیی بێنێت. ئەو ڕەنگە نەتوانێت لە دوامانگەکانی دووگیانییدا و تا ماوەیەک دوای منداڵبوونیش - چوونکە دەبێ شیر بە منداڵەکەی بدات - درێژە بە لێکۆڵینەوە و گواستنەوەی زانیارییەکانی بدات. منداڵ نابێ زیاتر لە نۆ مانگ ڕێ لە چالاکییە پسپۆڕییەکانی دایکی بگرێت. هەر کاتێک کۆمەڵگا، چاوەڕێی لەخۆبوردوویی و فیداکارییەکی لە ڕادەبەدەر لە دایکێک بکات سەبارەت بە منداڵەکەی، تەنانەت ئەگەر ئەو دایکە کەسێکی ئایینییش نەبێت، دیسانەوە چاوەڕێی پاداشێکی زیاتر لە پێویست لە منداڵەکەی دەکات. دایکێک کە بە پێی ڕێسایەکی باوی گشتیی بە نموونەی فیداکاریی و لەخۆبوردوویی دەژمێردرێت، زۆربەی کات لە ئاست منداڵەکانیدا خۆپەرست و ملهوڕ بووە، بەڵام هەر چەند پلەی دایکایەتیی و باوکایەتیی لە ژیاندا گرینگییەکی زۆری هەیە، شایستە نییە بە سەر هەموو چالاکییەکانی ژیانی ڕۆژانەدا بیگشتێنین و، دایک و باوکی ناڕازییش بە هۆی دەسەڵاتخوازییەوە پەنا بەرنە بەر هەست و سۆز. کەواتە چ لە بەر حەز و ئارەزووی منداڵان یاخود خۆشەویستیی و لایەنە جوانەکانی بە دایکبوون (دایکایەتی)، کارێکی ئاقڵانە نییە پلەی دایکایەتیی ببێتە هۆی پچڕانی حەز و کاروبارەکانی تری ژیان. ئەگەر دایک لە بواری پەروەردە و چاودێریکردنی منداڵان ئامادەیی و توانای پێویستی هەبێت، دەبێ کۆمەڵگا بە گشتیی کەڵکی لێ وەربگرێت و [قازانجی] پسپۆڕییەکەی، منداڵانی تریش بگرێتەوە. ئەگەر دایک و باوکان لانیکەمی ئەو هەلومەرجانەی کە دەوڵەت دەسنیشانی کردووە سەبارەت بە منداڵانیان ڕەچاویان بکەن، دەبێ بۆشیان هەبێت بزانن کێ چاودێریی منداڵەکانی دەکات و چۆن! دیارە نابێ خۆمان لە کاری کەسانی شارەزا و شایستەوە هەڵقورتێنین. بەڵام نابێ هیچ داب و ڕێسایەکی تایبەتیی لەم بوارەدا هەبێت کە هەموو دایکێک ناچار بێت کاتی خۆی بۆ کارێک تەرخان بکات کە ژنانی دیکە باشتر لەو دەتوانن ئەنجامی بدەن. ئەو دایکانەی کە سەبارەت بە پەروەردەی منداڵەکانیان هەست بە لێنەهاتوویی و نەشارەزایی دەکەن، دەبێ بەبێ هیچ گومان و دوودڵییەک ئەرکی پەروەردەی منداڵەکانیان بسپێرنە دەست ئەو ژنانەی کە توانای ئەو کارەیان هەیە و ئەزموون و فێرکارییان لەو بوارەدا وەرگرتووە. هیچ غەریزەیەکی خوداپێداو

بوونی نییە کە ژنان فێر بکات لە بواری پەروەردەی منداڵاندا چی بکەن و چی نەکەن و هەر کاتێک حەز و وردبینیی لە ڕادەیەکی دیاریکراوی تێپەڕاند، ئەوە سەرپۆشێکە بۆ هەستی موڵکایەتیی. ڕەفتاری دایکە نەزان و هەستیارەکان، زیانی ڕۆحیی و دەروونیی زۆر بە منداڵانیان دەگەینێت. لە کاری پەروەردەی منداڵدا ناتوانین چاوەڕێیەکی ئەوتۆمان لە باوک هەبێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا منداڵان باوکیان بە قەدەر دایک خۆش دەوێت. ئەگەر بڕیار بێت ژنان لەم دیلیی و کۆیلایەتییە بێبنەمایەی ئەمڕۆ ڕزگاریان بێت و جەستە و ڕۆحی منداڵان کەڵک لەو زانیارییە زانستییانە وەربگرێت کە لەم بوارەدا بوونیان هەیە، دەبێ پێوەندیی دایک و فرزەند لە داهاتوودا لە جۆری پێوەندییەک بێت کە ئەمڕۆ لە نێوان باوک و فرزەندا هەیە.

## ١٤

## کار

دەسنیشانکردنی «کار» وەک یەکێک لە هۆکارەکانی بەختەوەریی یان ناکامیی، کارێکی زۆر دژوارە، چوونکە هەندێک کار بە ڕاستیی وەڕسکەر و ماندووکەرن و کاری قورسیش هەمیشە ڕەنج و ئازار و خەمۆکیی لێ دەکەوێتەوە. بەڵام ئەگەر کارێکیش قورس نەبێت تەنانەت نزمترین و پلەخوارترین کاریش کەمتر لە بێکاریی، تاک بێزار دەکات. هەندێک چێژی وەک ئاسوودەیی دوای هیلاکیی و شەکەتیی و تا دەگاتە قووڵترین چێژ و خۆشیی، بەندە بە جۆری کار یان شایستەیی و لێهاتوویی کرێکارەوە. زۆربەی ئەو کارانەی خەڵک ئەنجامیان دەدەن لە ڕاستییدا سەرنجڕاکێش نین کەچی هەندێک تایبەتمەندیی زۆر گەورەیان هەیە. کار، کاتێکی زۆر لە مرۆڤ دەگرێت - بەبێ ئەوەی کە تاک بڕیار بدات چی بکات و چی نەکات، زۆربەی خەڵک ئەگەر لە هەڵبژاردنی جۆری «کار»دا سەربەست بن، دۆش دادەمێنن کە توانای ئەنجامدانی چ کارێکی بەکەڵک و سوودبەخشیان هەیە و هەڵبژاردنەکەشیان هەر چییەک بێت، دیسانەوە پێیان وایە کاری لەوە خۆشتر و باشتریش هەیە و هەر ئەمەش تووشی خەم و خەفەتیان دەکات. توانای پڕکردنەوەی وشیارانە و واقعبینانەی کاتەکانی بێکاریی، دوایین داهێنانی کۆمەڵگا شارستانییەکانە و لە ئێستادا تەنها چەند کۆمەڵگایەکی کەم گەییشتوونەتە ئەم ئاستە.

پرسی هەڵبژارنی کار، خۆی لە خۆیدا جارسکەرە و بێجگە لە کەسانی ژیر و داهێنەر، دەبێ بەردەوام بەوانی تر بڵێیت چی بکەن و چی نەکەن بە مەرجێک ئامۆژگارییەکانیش نابەجێ و نادروست نەبن. زۆربەی دەوڵەمەندە بێکارەکان بە هۆی ئەو هەموو زۆریی کاتەوە

بێزار دەبن [و نازانن کاتەکانیان چۆن پڕ بکەنەوە]. ئەم کەسانە بە چەندین شێواز خۆیان سەرگەرم دەکەن و بۆ نموونە بە ڕاوکردن لە "ئەفریقا" یان گەشت و گەڕان بە دەوری دنیادا هەوڵی ڕەواندنەوەی دڵتەنگییەکانیان دەدەن، بەڵام چوونکە ژمارەی کارە ورووژێنەرەکان زۆر کەمە و بە تێپەڕبوونی قۆناغی لاوێتیی، سەردەمی ئەو کارانەش تێدەپەڕێت، پیاوە ژیرە دەوڵەمەندەکان بە جۆرێکی وەها کار دەکەن کە وەک بڵێی هەژارن و ناچارن کار بکەن. ژنە دەوڵەمەندەکانیش زۆربەی کات خۆیان بە کارگەلێکەوە سەرقاڵ دەکەن کە خۆشیان دەزانن هیچ بایەخێکیان نییە.

کەواتە کاری باش لە بەر ئەوە گرینگیی تایبەت بە خۆی هەیە چوونکە ڕێ لە خەمۆکیی دەگرێت. ئەو شەکەتیی و وەڕسییەی کە تاک لە کاتی ئەنجامدانی کارێکدا هەستی پێ دەکات، هەرگیز هێندەی وەڕسیی و بێتاقەتیی کاتی بێکاریی، ئازاری نادات. قازانجێکی تری کار ئەوەیە کە ڕۆژانی پشوو و ڕۆژانی بێکاریی بە بەر چاوی مرۆڤەوە خۆش و دڵبزوێن دەکات. ئەڵبەتە ئەمەی دواییان بە مەرجێک دڵبزوێنە کە تاک ئەوەندە کار نەکات کە وزە و هێزیی جەستەیی کەم بکاتەوە. لە ڕۆژانی پشوودا کەسێک کە سەرقاڵی کارێک بێت، لە چاو کەسی بێکاردا هەست بە کەیف و خۆشییەکی زیاتر دەکات.

تایبەتمەندیی دووهەمی کار: دیارە سەبارەت بە کارگەلی پڕداهات و تەنانەت هەندێ کاری کەمداهاتیش دەبێ بڵێین کە سەرەڕای شانسی سەرکەتن و بەدەستهێنانی هەلی پێویست، هەستی پلەوپایەخوازییش تێر دەکات.

لە زۆربەی کارەکاندا ڕێژەی داهات پێوەری سەرکەوتنە. تا کاتێک کۆمەڵگای سەرمایەداریی بوونی هەیە، ئەم ڕوانگەیەش وەک خۆی دەمێنتەوە. ئەم پێوەرە تەنها لە بواری کارگەلێکدا نائاسایی دێتە بەر چاو کە کارێکی گەورە و مەزن لە گۆڕێدا بێت. حەز و ویستی تاکەکان بۆ زیادکردنی داهاتیش، دەگەڕێتەوە بۆ حەزی سەرکەوتن و هەروەها حەزی بەدەستهێنانی ئارامشی زیاتر کە دیارە ئەوەش پێویستی بە داهاتێکی زۆر هەیە. بە هەر حاڵ کار تەنانەت ئەگەر وەڕسکەریش بێت بەڵام بە مەرجێک تاک بە ناوبانگێکی جیهانیی یان هیچ نەبێت ناوبانگێکی کەمیش بگەینێت قابیلی تەحەمولکردنە. شێلگیریی و خۆڕاگریی بۆ گەییشتن بە ئامانج، یەکێک لە بنەڕەتیترین کۆڵەکەکانی بەختەوەرییە و، بۆ زۆربەی

تاکەکانیش ئەم بەختەوەرییە تەنها بە هۆی کارەوە دەستەبەر دەبێت. هەر لە بەر ئەوەشە کە ژنانی ماڵەوە کەمتر لەو ژن و پیاوانە بەختەوەرن کە لە دەرەوەی ماڵدا کار دەکەن. ژنی ماڵەوە هیچ حەقدەسێک وەرناگرێت و بۆیە هیچ ڕێگایەکی بۆ باشترکردنی بارودۆخی خۆی نییە و پیاویش نەک لە بەر ڕاپەڕاندنی کارەکانی ماڵەوە، بەڵکوو لە بەر هەندێ سیفەت و تایبەتمەندیی دیکەیە کە ڕێز لە ژنەکەی دەگرێت. دیارە ئەمە سەبارەت بەو ژنە دەوڵەمەندانەی کە خانوو و باخی جوانیان هەیە و ئێرەیی دراوسێکانیان دەورووژێنن ڕاستیی لە خۆ ناگرێت، بەڵام ژمارەی ئەم جۆرە ژنانە ئێجگار کەمە و «ماڵ» هێندەی کارەکانی دەرەوە - وەک چۆن دڵخۆشیی ژنان و پیاوانی پسپۆڕ و شارەزا دابین دەکات - دڵخۆشییەکی ئەوتۆیان بۆ دابین ناکات.

هەر چەند لە ئەنجامی کات بەسەربردن و دەستەبەرکردنی ڕێگەکانی هەستی پلەوپایەخوازییدا جۆرە ڕەزامەندیی و دڵخۆشییەک بە ڕێژەیەکی کەم لە زۆربەی کارەکاندا بەدیی دەکرێت، بەڵام بە گشتیی تاکێک کە کار دەکات - تەنانەت ئەگەر کارەکەشی وەڕسکەر بێت - دڵخۆشتر و بەختەوەرتر لە کەسی بێکارە. کاری سەرنجڕاکێشیش دەتوانێت زیاتر لە کاری ناسەرنجڕاکێش ڕەزامەندیی و دڵخۆشیی لێ بکەوێتەوە. کارگەلی گرینگ و چارەنووسساز زۆر کەمن و دەکرێت بیانژمێریت. من تەنها ئاماژە بەوانەیان دەکەم کە تا ڕادەیەک سەرنجڕاکێشن و کاری خۆشم دەخەمە ڕیزی کاری کەسانی گەورەوە.

ئامێر و کەرەسەکانی کار و جۆری کەڵک لێوەرگرتنیان، گرینگترین هۆکارن بۆ ئەوەی تاک حەز لە کارێک بکات و خۆشی بوێت. هەر کەسێک کە لە کارەکەیدا بە ڕادەی پێویست [ئەزموون و] توانایی بە دەست بێنێت، تا کاتێک کارەکە بە لای خۆیەوە ئاسایی نەبێتەوە، چێژی لێ دەبینێت. ئەمەش هەر لە سەرەتای منداڵییەوە دەست پێ دەکات. منداڵێک کە فێر دەبێت سەرمەقولات بدات و بە »سەر« خۆی ڕابگرێت، چیدی حەزی بەرامبەر بە وەستانی سەر قاچەکانی نامێنێت. کاری زۆریش هێندەی توانایی دەبێتە هۆی خۆشیی و شادمانیی. کاری مافناس یان سیاسەتمەدارێک زیاتر لە یاریی «بریج» شادیی و خۆشیی بە نسیب دەکات. ئەڵبەتە لێرەدا تەنها مەسەلەی توانایی لە گۆڕێدا نییە بەڵکوو سەرکەوتن بە سەر ڕکابەریش لە ئارادایە. لەو کاتانەشدا کە هۆکارێک بۆ ڕکابەریی لە ئارادا نەبێت،

دیسانەوە ئەنجامدانی کارە سەختەکان دەبێتە هۆی شادیی و خۆشیی. کەسێک کە دەتوانێت بە فڕۆکە سووڕانەوە و جووڵەگەلی سەرسووڕهێنەر ئەنجام بدات، هێندە چێژ لەو کارەی خۆی دەبینێت کە ئامادەیە گیانی لە پێناودا بخاتە مەترسییەوە. من پێم وایە نەشتەرگەرێک سەرەڕای هەلومەرجی سەخت و وەڕسکەری کارەکەی، زۆر لە نەشتەرگەرییەکانی خۆی ڕازییە. ئەم جۆرە خۆشیی و شادییانە لە کارە ئاسانەکانەوە بە ڕێژەیەکی زۆر دەستەبەر دەبێت. هەموو ئەو کارانەی کە پێویستیان بە توانایی و لێهاتوویی هەیە دەتوانن ببنە هۆی ڕەزامەندیی و چێژبینین بە مەرجێک لێهاتوویی و لێوەشاوەیی لە وەها کارێکدا سەرکەوتن و پێشکەوتنی بێسنووری بە دواوە بێت. ئەگەر ئەم هەلومەرجە لە ئارادا نەبێت، کاتێک تاک دەگاتە لووتکەی توانایی و لێهاتوویی، چیدی کارەکەی بە لایەوە سەرنجڕاکێش نابێت. کەسێک کە لە پێشبڕکێی ڕاکردندا بە بڕینی سێ مایل پلەی یەکەم بە دەست دێنێت، لە تەمەنی پیرییدا کە چیدی ناتوانێت ئەو ژمارە پێوانەییە تۆمار بکات، چیدی چێژ لەو کارە نابینێت. خۆشبەختانە زۆر کار هەن کە تازەگەرییان تێدا دەکرێت و دەتوانن تاک بەرەو خۆیان ڕابکێشن و تاک دەتوانێت تا ناوەڕاستەکانی تەمەنی، پێشکەوتنیان تێدا بە دەست بێنێت. هەندێ کاری وەک سیاسەت کە پێویستی بە پسپۆڕێتیی هەیە، پێدەچێت تەمەنی نێوان شەست تا حەفتا ساڵیی باشترین قۆناغی ئەزموونداریی و گەییشتن بە لووتکەی پسپۆڕیی و هێز و توانای فکریی بێت، چوونکە دەرفەتی زۆری بۆ کۆکردنەوە و شرۆڤەکردنی ئەزموونی کەسانی تر هەبووە و هەر لە بەر ئەوەشە کە سیاسەتمەدارە سەرکەوتووەکان لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا بەختەوەرترن لە کەسانی هاوتەمەن و هاوئاستی خۆیان. لەم بوارەدا تەنها بەڕێوەبەرانی کۆمپانیا هەرە گەورەکان دەتوانن ڕکابەرییان بکەن.

لە کارە باڵاکاندا هۆکارێکی تریش هەیە کە ڕۆڵێکی زیاتر لە بەکارهێنانی لێهاتوویی دەبینێت بۆ بەدەستهێنانی بەختەوەریی؛ ئەو هۆکارەش «بنیاتنان»ە. لە هەندێ کاردا بەرهەمێک هەیە کە بە نەمریی دەمێنێتەوە. ئەم بەراوردکردنەی خوارەوە خاڵی جیاوازیی بنیاتنان و ڕووخاندن دەسنیشان دەکات. قۆناغی سەرەتایی کار واتە کاری کەسی بناغەدانەر و بنیاتنەر، زۆربەی کات بە هەڵکەوت دەبێت، بەڵام قۆناغی کۆتایی، دەستەبەرکردنی ئامانج و مەبەستێکی لێ دەکەوێتەوە.

هۆکاری ڕووخاندن بیر لە مەبەست و ئامانج ناکاتەوە. بۆ ڕوونکردنەوەی بابەتەکە سەرنج بدەنە بنیاتنان و ڕووخاندنی بینایەک.

بۆ دروستکردنی بینایەک بە گوێرەی نەخشە و پلانێک کار دەست پێ دەکات بەڵام کاتێک بڕیارە بڕووخێنرێت، هیچ نەخشە و پلانێک لە گۆڕێدا نییە. کەس گرینگیی بەوە نادات کە بۆ ڕووخاندنی بینایەک پلانێک داڕێژێت و لە سەر بنەمای نەخشە و پلانێکی دیاریکراو کارەکە کۆتایی پێ بێنێت. کەس بڕیاری ئەوە نادات کەلوپەلی بەجێماو و بەکەڵک چۆن نەکەوێتە بەر هەڵمەتی ڕووخاندنەکە و تیا نەچێت. ئەڵبەتە دیارە ڕووخاندن سەرەتایەکە بۆ بنیاتنانەوەیەکی دیکە کە لەم حاڵەتەدا ڕووخاندن خۆی وەک قۆناغێکی بنیاتنانەوە دێتە ئەژمار. ئەڵبەتە کەسانی ڕووخێنەری بیناکەش لە وەها کارێکدا ڕووخاندن بە سەرەتای بنیاتنانەوە لە قەڵەم دەدەن، بەڵام لە ئاکامدا کارەکە بە بنیاتنانەوە کۆتایی پێ نایەت. بۆ نموونە دەبێ کەسانی ئاژاوەگێڕ و ئەنارشیی و کەسانی لایەنگریی سیاسەتیی میلیتاریستیی لەم خانەیەدا پۆلینبەندیی بکەین.

ئەوان بەبێ ئەوەی کە خۆیان بزانن وە دوای هەستی ڕق و نەفرەت و کینە دەکەون تا هەموو ئەو شتانە لە ناو بەرن کە ڕقیان لێیانە. ئەوان گوێ بەم پرسیارە نادەن کە ئایا لە داهاتوودا چی دەبێت؟ لە بەر ئەوەشە ناتوانم نکووڵیی لەوە بکەم کە لە کاری ڕووخاندن و لەناوبردنیشدا کەیف و شادییەکی لە جۆری دامەزراندن و بنیاتنان بوونی هەیە. لەوانەیە لە سەرەتادا چێژ و خۆشیی لە شێوەی حاشاکردنی دەسکەوتە ڕۆحییەکاندا دەربکەوێت کە کەمتر دەبێتە هۆی ڕەزامەندیی و دڵخۆشیی، چوونکە لە پرۆسەی ڕووخاندندا ڕەزامەندیی، گەوهەرێکی نایابە.

ئێوە دوژمنەکەی خۆتان دەکوژن بەڵام کاتێک بینیتان بێگیان داکەوتووە و کارەکە کۆتایی هاتووە، خۆشیی و ڕەزامەندیی گەییشتن بە ئامانجەکەتان بە خێرایی لە ناو دەچێت. کەچی لە پاش تەواوکردنی کارگەلی بنیاتنەرانەدا، بیرلێکردنەوەیان دەبێتە هۆی خۆشحاڵیی و شادمانییتان. جیا لەوەش کاری بنیاتنان کۆتایی نایەت و هەر بۆیە ڕێ لە کاری زیاتر و فراوانتر ناگرێت. ئامانجگەلێک ڕەزامەندیی زیاتریان لێ دەکەوێتەوە کە سەرکەوتنی تریان بە دواوە بێت و ئەم پرۆسەیەش کۆتایی بە دواوە نەبێت و هەر لە بەر ئەوەشە کە بنیاتنان،

ڕەزامەندیی و دڵخۆشیی لێ دەکەوێتەوە. ڕەنگە وا باشتر بێت بڵێین کەسانێک کە ڕەزامەندیی لە بنیاتناندا دەبینن، چێژی زیاتر لە سەوداسەرانی ڕووخاندن دەبینن چوونکە بە هۆی ئەو ڕق و نەفرەتەی کە لە کاری ڕووخاندنەوە دێتە ئاراوە، چیدی ڕەزامەندیی لە کاری بنیاتنانیش هێندە ئاسان نییە و ئەم بابەتە هەرگیز قابیلی بەراوردکردن لەگەڵ چێژی بنیاتناندا نییە.

جیا لەوەش کەم شت هەیە هێندەی ئەنجامدانی کارگەلی گرینگ بتوانێت خووی ڕق و نەفرەت و قین لەدڵیی، چارەسەر بکات.

ئەو ڕەزامەندیی و خۆشحاڵییەی کە بە هۆی کارێکی بنیاتنەرانەوە بە نسیبی مرۆڤ دەبێت، یەکێک لە گەورەترین هۆکارەکانی چێژ و خۆشییە کە ژیان پێی بەخشیوین، هەر چەند بە داخەوە باڵاترین شێوازی [ئەو چێژ و خۆشییانە] تەنها بە نسیبی کەسانێک دەبێت کە بەهرە و توانای لە ڕادەبەدەریان هەیە. هیچ هۆکارێک ناتوانێت بەختەوەریی پاش سەرکەوتنی کارە گرینگەکان لە مرۆڤ بستێنێتەوە مەگەر ئەوەی کە هۆیەک بۆ خراپ و نەشیاو و قێزەونبوونی کارەکە دەسنیشان بکرێت. ڕەزامەندیی و خۆشحاڵیی لەو چەشنە چەندین جۆری هەیە. کەسێک کە بە جێبەجێکردنی پرۆژەیەکی ئاودێریی، بیابانێکی وشکەڵ دەگۆڕێت بە گوڵزارێک، چێژ و خۆشییەکی بێوێنەی هەیە. دامەزراندنی ڕێکخراوێک کارێکی زۆر گرینگ و بەختەوەریهێنەرە و کاری ئەو پیاوانەش کە لە پێناوی لەناوبردنی گێرەشێوێنیی و بشێویی و بێنەزمییدا، گیانیان دەخەنە مەترسییەوە، یەکێکە لەو کارانە. دەتوانین بۆ ئەم سەردەمەی ئێمە لە ناو سیاسەتمەداراندا لینین وەک شازترین و بەرچاوترین نموونە بێنینەوە. نموونە باشەکانی تری کاری بنیاتنەر، شانۆکاران و بیرمەندانن. شکسپیر لە یەکێک لە شێعرەکانیدا سەبارەت بە ژیان دەڵێ:

«تا کاتێک تیشکی هەتاو لە مرۆڤ دەدات و
چاوەکان توانای بینینیان هەیە، ژیان بەم شێوەیە»

گومان لەوەدا نییە کە ئەم ئەندێشانە لە کاتی ناکامیی و تێکچوونە ڕۆحییەکاندا سووکناییان بە شکسپیر بەخشیوە. ئەو لە غەزەلەکانیدا لەم باوەڕەدا بوو کە یادکردنی خۆشەویستەکەی، بە ژیانەوە گرێی دەدات، بەڵام من گومانم لەوە نییە ئەو شێعرانەی کە بە ناوی خۆشەویستەکەیەوە دەینووسین، ڕوونکردنەوەی سۆز و عاتیفەکانی مرۆڤن. لەم باوەڕە

بێکۆتاییەدا کاریگەرییەکی بەهێزتر لە خودی خۆشەویستەکەی لە ئارادایە. دەسگرۆییکردنی هونەرمەندە گەورەکان و کەسایەتییە گەورەکانی بواری زانست و مەعریفە، خۆی لە خۆیدا دەبێتە هۆی ڕەزامەندیی و دڵخۆشییان و لە هەمان کاتدا هەندێ پاڵنەری واش دێنێتە ئاراوە کە لای خەڵک ڕێز و بایەخیان هەیە. گرینگیی کاری ئەوان، کاریگەرییدانانە لە سەر بیروڕا و هەستی تاکەکان بۆ ئەنجامدانی ئەو کار و کردەوانەی کە کۆمەڵگا قبووڵیەتی. ئەم کەسانە هۆکارگەلی پتەو و قایمیان هەیە بۆ ئەوەی کە قەناعەتیان بە خۆیان هەبێت. بە باوەڕی مرۆڤ تێکەڵبوونی ئەم هەلومەرجە و هۆکارەکانی ڕەزامەندیی، وەکوو پێویست ناتوانێت بەختەوەرییەکی تەواوەتیی بۆ تاک دابین بکات، بەڵام لە ڕاستییدا وا نییە. بۆ نموونە «مایکڵ ئانژ» پیاوێکی ئاتاجمەند و سیاچارە بوو کە وای نووسی: «من باوەڕم بە حەقیقەتی ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانە نییە». دیارە ئەگەر ناچار بە دانەوەی قەرزی کەسوکار و خزمەکانی نەبوایە، هەرگیز خۆی بە داهێنانی ئەو شاکارە هونەرییانەوە هیلاک و ماندوو نەدەکرد.

توانای داهێنانی شاکارێکی هونەریی، زۆربەی کات لە ژێر کاریگەریی هەستێکی توندی پڕ لە نائومێدییەوە دێتە ئاراوە و ئەگەر قەناعەتی هونەریی بە دواوە نەبوایە، ئەگەری ئەوە زۆر بوو کە هونەرمەند لە جیاتیدا بیر لە خۆکوژیی بکاتەوە. کەواتە ئێمە ناتوانین پێداگریی لە سەر ڕەتکردنەوەی ئەم باوەڕە بکەین کە تەنانەت دەبێ گەورەترین کاریش تاک بەختەوەر بکات. ئێمە تەنها دەتوانین ئەوە بڵێین کە کاری هونەریی، ڕەنگە ڕێژەی بەدبەختیی تاک کەم بکاتەوە. بیرمەندان و زانیاران بە گشتیی کەمتر لە هونەرمەندان دەستەویەخەی بەدبەختیی دەبنەوە و بە گشتیی کەسانێک کە لە بوارە زانستییەکاندا هەوڵ و تەقەلایان داوە، کەسانێکی بەختەوەرن و بەختەوەرییەکەشیان بەرئەنجامی هەوڵ و ماندووبوونەکانیانە.

یەکێک لە هۆکارەکانی بەدبەختیی لە ناو چینی ڕۆشنبیری ئەم سەردەمەی ئێمەدا ئەوەیە کە زۆربەیان - بە تایبەت ئەوانەی کە لە بواری ئەدەبییدا خاوەن هێز و توانایین - هەل و دەرفەتی پێویستیان بۆ دەرخستن و پێشکەشکردنی بەهرە و تواناکانیان نییە و بە ناچار خۆیان دەخەنە خزمەتی ئەو دامودەزگا دەوڵەمەندانەی کە لە لایەن کەسانی مادیی و بێفەرهەنگەوە بەڕێوە دەبردرێن و، هەروەها لە ژێر کاریگەریی بارودۆخێکی ناڕەسەن و نادروستدا ناچارن هەندێک کار بکەن کە بە

لایانەوە بێهوودە و پڕوپووچن. ئەگەر لە ڕۆژنامەنووسانی - چ بەریتانیا چ ئەمریکا - پرسیار بکەن ئایا باوەڕیان بە ڕچە و پڕۆگرامەکانی ئەو ڕۆژنامە هەیە کە کاری تیا دەکەن، ژمارەیەکی ئێجگار کەمیان وەڵامی ئەرێنیی دەدەنەوە و، نکوولیی لەوەش ناکرێت کە ئەوانی تریان لە پێناوی بەدەستهێنانی بژێویی ژیاندا، تواناکانیان بۆ گەییشتن بە ئامانجگەلێک تەرخان دەکەن کە تەنانەت لە دیدی خۆشیانەوە هەڵەن. وەها شێوازێک کە لە بەرژەوەندیی و لە پێناوی دابینکردنی بژێویی ژیاندایە، ناتوانێت ڕەزامەندیی و بەختەوەریی دابین بکات. ئەو پێویستییانەی کە بە پێچەوانەی داخوازە ڕۆحییەکانی تاک، ناچاری دەکەن خۆی هەماهەنگ و هاوشێوە بکات، ئەنجامێک جگە لە ڕەشبینیی و ڕقهەڵگرتنی بە دواوە نابێت و دواجاریش دەبێتە هۆی ناڕەزامەندیی و ناخۆشحاڵیی لە هەموو کاروبارەکاندا. من ئەو کەسانە بە تاوانبار نازانم کە کاری لەم جۆرەیان لە ئەستۆیە چوونکە ئەگەر ئەم کارە نەکەن برسێتیی و بێبەشیی چاوەڕێیان دەکات، بەڵام پێم وایە دەبێ هێندەی بۆمان بکرێت بەبێ ئەوەی کە مەترسیی برسێتیی بە دواوە بێت، کارێکی وا ئەنجام بدەین کە هیچ نەبێت هەندێ لایەنی بەرچاوی سوودبەخشی تێدا هەبێت. بۆ گەییشتن بە بەختەوەریی، ئاقڵانەترین کار ئەوەیە کە هەوڵ بدەین زیاتر بایەخ بەو کاروبارە پڕبایەخانە بدین کە پشتئەستوور بە تایبەتمەندییە زەینییەکانی خۆمانن و هەموو جەخت و گرینگیدانمان نەخرێتە سەر ئەو کارانەی کە داهاتی زۆریان هەیە. ناخی مرۆڤ ئەگەر ڕێزی لێ نەگیردرێت، دەستەبەربوونی بەختەوەریی ڕاستەقینە زۆر ئەستەم دەبێت. تاکێک کە بە هۆی کارەکانییەوە هەست بە شەرمەزاریی دەکات، بە سەختیی دەتوانێت ئاسایش و ئاسوودەیی «ڕۆح»ی دابین بکات.

هەر چەند لەوانەیە ڕەزامەندیی هەڵقوڵاوی «کاری بنیاتنەر»یش وەکوو هەموو شتێکی تر، مافی تایبەتیی کەسانێکی دەگمەن بێت بەڵام دەتوانرێت ئەم تایبەتمەندییە بە نسیبی کەسانێکی زیاتریش بکرێت. هەر تاکێک کە لە کارەکەی خۆیدا شارەزایی تەواوی هەبێت، هەست بەم بەختەوەرییە دەکات و هەروەها سەبارەت بەو کەسەش کە بە گشتیی کارکردنی پێ خۆشە و بە چاوی ڕێزەوە سەیری دەکات و تواناشی زۆرە، ڕاستیی لە خۆ دەگرێت. پەروەردەکردنی منداڵگەلی جیدیی، یەکێکە لەو کارە بنیاتنەرانەی کە ڕەزامەندیی و دڵکاوییەکی قووڵی لێ دەکەوێتەوە. هەر ژنێک گەییشتبێتە ئەم قۆناغە، دەتوانێت هەست بەوە

بکات کە بە هۆی کار و ماندووبوونی ئەوەوە بوونەوەرێکی بەنرخ و بایەخدار پێشکەشی جیهان کراوە کە ئەگەر ئەو نەبوایە ئەم پێشکەشکردنە ڕووی نەدەدا.

هەموو تاکێکی مرۆڤ بە شێوەیەکی جیاواز و تایبەتیی لە ژیانی کەسەکیی دەڕوانێت و دیدیان جیاوازە. لە ڕوانگەی هەندێکیانەوە پەروەردەکردنی منداڵی شایستە، یەکێکە لە کۆڵەکەکانی بەختەوەریی و بە ڕای هەندێکی تریش بەختەوەریی تێکەڵەیەکە لە ڕووداوگەلی سەربەخۆ کە پێوەندیشیان بە یەکەوە نییە و بە دوای هیچ ئامانجێکی دیاریکراویشدا نییە. من پێم وایە بە ئەگەرێکی زۆرەوە هۆکارەکانی بەختەوەریی لای گرووپی یەکەم بەهێزتر لەوانەی گرووپی دووهەمن چوونکە ئەوان هێدی هێدی بارودۆخێک دێننە ئاراوە کە بوار بۆ ڕەزامەندیی و ڕێزگرتن لە نەفس (ناخ/دەروون) خۆش دەکات، کەچی گرووپی دووهەم گرفتاری گەردەلوولی کێشەگەلی ناسازگار دەبێت و هەروەها تووشی هەندێک هەوراز و نشێوی ناخۆش و نالەبار دەبن و هەرگیز ناگەنە شوێنی مەبەست. پێگەی مرۆڤی ڕۆشنبیر و هزرمەند لە چوارچێوەی بنەماکانی ژیاندا، بە گشتیی کۆڵەکەی بنەڕەتیی ئەقڵ و ئاوەز و ڕەچاوکردنی ڕێساکانی ئاکاری ڕاستەقینەیە و، یەکێکە لەو پرسە پڕبایەخانەی کە دەبێ لە خوێندنگەکاندا وەک وانە بوترێتەوە. سووربوون لە سەر [بەدیهێنانی] ئامانج بە تەنها بەس نییە بۆ دابینکردنی بەختەوەریی، بەڵام تا ڕادەیەکی زۆر، یەکێکە لە هەلومەرجە هەرە پێویستەکانی ژیانێکی تێکەڵ بە بەختەوەریی و، پێداگریی لە سەر [بەدیهێنانی] ئامانجیش تەنها لە ڕێگەی «کارکردن»ەوە دەردەکەوێت.

١٥

## حەزە ڕەواکان

لەم بەشەدا نامەوێ سەبارەت بەو حەز و ئارەزووە گرینگانەی باس بکەم کە بناغە و کۆڵەکەی ژیانی تاکەکانن. مەبەستم لێرەدا تاوتوێکردنی ئەو حەزە لاوەکییانەیە کە بەشی هەرە زۆری کاتی تاکەکانی بۆ تەرخان دەکرێت و، کاتێک مرۆڤ شەکەتیی و ماندوویی کارە گرینگ و جیدییەکانی بە سەرەوە ماوەتەوە، سووکنایی و ئارامشی بۆ دەستەبەر دەکەن.

لە ژیانی هەموو تاکێکی مامناوەندییدا هاوسەر، منداڵ، کار و هەروەها باری ئابووریی، بێئەملاولا بەشێکی زۆری نیگەرانیی و دڵەڕاوکێ و بیرۆکە جیدییەکانی داگیر دەکەن و، تەنانەت ئەگەر سەرەڕای هاوسەرگیرییش خۆشەویستێکی دیکەش بدۆزێتەوە، لەوانەیە کاریگەریی ئەوتۆ لە سەر دۆخی ژیانیدا دانەنێت. من بەش بە حاڵی خۆم ئەو حەزانەی کە پێوەندییان بە کار و پیشەی مرۆڤەوە هەیە، لە ڕیزی حەزە ڕەواکاندا دانانێم؛ بۆ نموونە بیرمەندێک دەبێ بەردەوام لێکۆڵینەوە و توێژینەوە لە بواری پسپۆڕییەکەیدا درێژە پێ بدات. لە وەها لێکۆڵینەوەیەکدا مرۆڤ هێشتا گەرموگوڕ و پڕجۆش و خرۆشە و پێوەندییەکی نزیکی لەگەڵ کارەکاندا هەیە. بەڵام ئەگەر بەرەوڕووی توێژینەوەیەکی تری زاستیی ببێتەوە کە هیچ پێوەندییەکی بە پیشەکەیەوە نەبێت، ناچارە دەست بە خوێندنەوە بکات و بە سەلیقەیەکی جیاوازی ناپێوەندیدار بە بوارەکەی خۆیەوە و دوور لە حەز و ڕەخنەی داهێنەرانە، کارەکە ئەنجام بدات.

تەنانەت ئەگەر ناچار بێت بۆ تێگەییشتن لە بابەتێک کە دەیەوێت کەڵک لە مێشک و هزری خۆی وەربگرێت، دیسانەوە خوێندنەوە دەبێتە هۆی وەڕسبوونی، چوونکە پێوەندییان بە

ئەرکە پسپۆڕییەکانەوە نییە و ئەگەریش کتێبێک سەرنجی ڕابکێشێت، چوونکە حەزەکانی بە تەواوەتیی بە ئاراستەیەکی تردا دەڕۆن، ناتوانێت لە توێژینەوەکانی تری پێوەندیدار بە بوارەکەی خۆی، کەڵکیان لێ وەربگرێت. من بە تەمام لەم بەشەدا سەبارەت بەم جۆرە حەزانە باس بکەم کە وەک بەشێکی سەربەخۆ لە چالاکییە سەرەکییەکانی ژیانی هەموو تاکێک دێنە ئەژمار.

یەکێک لە هۆکارەکانی ناکامیی، شەکەتیی و داڕزینی عەسەبیی و «ڕۆحیی»یە کە لە گرینگینەدان و ئاوڕنەدانەوە لەو شتانە سەرچاوە دەگرێت کە لە ژیانی کەسەکیی تاکەکاندا هیچ گرینگییەکی ڕاستەقینەیان نییە. ئەنجامەکەشی ئەوە دەبێت کە هەست (زەینی وشیار و ئاگا) لە ژێر گوشاری هەندێ شتی بچووک و کەمبایەخدا کە ڕەنگە هەندێکیشیان تێکەڵ بە پەرێشانیی و هەندێک هۆکاری خەم و دڵەڕاوکێ بن، ئیسراحەتی لێ زەوت دەکەن. بێجگە لە کاتەکانی خەو نەبێت، هەست (خودئاگا)ی تاک هەمیشە چالاکە و لە هەمان کاتدا نەست (ناخودئاگا)یش وردە وردە ئەزموونەکانی کەڵەکە دەکات و تەواوتریان دەکات. دەرەنجامەکەشی دەبێتە لە دەستدانی ژیریی و وشیاریی، دڵناسکیی، تووڕەیی و سەرەنجام داڕمانی میانەڕۆیی و هاوسەنگیی. هەموو ئەم حاڵەتانە دەرەنجامی هێرشی «شەکەتیی»ن. کاتێک تاک تەواو شەکەت دەبێت، حەزە دەرەکییەکانی کەم دەبنەوە و کاتێکیش ئەم جۆرە حەزانە کەم بوونەوە، ئەو ئارامش و سووکناییەی کە دەتوانێت لێیانەوە وەربگرێت لە دەست دەدات و نیشانەکانی شەکەتییش هەرچی زیاتر دەردەکەون. بە ئەگەرێکی زۆرەوە ئەم سیکل(سووڕ)ە دووبارە و چەند بارەیە، وردە وردە جەستەی تاک دەتوێنێتەوە و تووشی نەخۆشیی توندی عەسەبیی دەکات. ئەو ئارامش و سووکناییەی کە بە هۆی حەزە دەرەکییەکانەوە دەستەبەر دەبێت، پێویستی بە هیچ جۆرە جووڵە و جموجۆڵێک نییە. بڕیاردان و ڕاییکردنی ئیرادە، دەبێتە هۆی شەکەتیی و خەم و دڵتەنگیی، بە تایبەت ئەگەر تاک هەڵەشە بێت و لە کارەکەیدا پەلە بکات و نەست(ناخودئاگا)یشی یارمەتیی بدات. کەسانێک کە بڕیارە گرینگەکان پشتگوێ دەخەن بۆ دوای خەو، کارێکی باش دەکەن. بەڵام تەنها لە کاتی خەودا نییە کە نەستی مرۆڤ چالاک دەبێت بەڵکوو لە هەمان کاتدا کە هەست(خودئاگا) لە شوێنێکی دیکەدا خەریکی کار و چالاکییە، نەستیش لە شوێنێکی تردا سەرقاڵی زنجیرە کار و چالاکییەکی بەردەوامی دیکەیە. تاکێک کە دەتوانێت کارەکەی دوای کۆتاییهاتن تا

ڕۆژی دواتر کە دەستی پێ دەکاتەوە، لە بیر بکات، بە ئەگەری زۆرەوە سەرکەوتووترە لە تاکێک کە لە کاتەکانی نێوان دەسپێکردن و کۆتایی و دەسپێکردنی دووبارە، بەردەوام بیری لێ دەکاتەوە. ئەگەر تاک هەندێ حەزی دیکەشی لە دەرەوەی بازنەی کاری ڕۆژانەیدا هەبێت، ئاسانتر دەتوانێت ڕۆڵی «کارکردن» لە ناو هزر و مێشکیدا بسڕێتەوە، بەڵام ئەم خاڵە گرینگەشمان لە بیر نەچێت کە هەرگیز نابێ حەزە لاوەکییەکان ئەو هێز و وزەیەی مرۆڤ کە لە کاری ڕۆژانەیدا بە لاڕێدا چووە بخەنە خزمەتی خۆیانەوە و هەروەها ناشبێ پێویستیان بە بڕیاری دەسبەجێ و خێرا هەبێت. بۆ نموونە یارییەکی بۆ کەیفخۆشقیی، نابێ هیچ هۆکارێکی مادیی لە پشتییەوە بێت کە ببێتە هۆی شەکەتیی و سەرنجڕاکێشان و داگیرکردنی هەست و نەست[ی تاک].

چەندین یاریی و کەیفخۆشیی جۆراوجۆر هەن کە ئەم هەلومەرجانە دێننەوە ئاراوە: تەماشاکردنی پێشبڕێکان، بینینی شانۆ، یاریی گۆڵف و زۆر شتی تر کە لەو گۆشەنیگایەوە قابیلی لۆمەکردن نین. کەسێک کە حەزی لە خوێندنەوەیە، تەنانەت خوێندنەوەی ئەو بەرهەمانەی کە پێوەندیشیان بە بوارەکەی خۆشیەوە نییە، بە قازانجی دەشکێتەوە و سوودیان لێ دەبینێت. بە هەر حاڵ مرۆڤ چەند گرفتار و سەرقاڵیش بێت نابێ بە درێژایی ڕۆژ بیریان لێ بکاتەوە و مێشکی داگیر بکەن.

لەم ڕووەوە جیاوازییەکی زۆر لە نێوان ژنان و پیاواندا هەیە. بە گشتیی پیاوان زووتر لە ژنان کارەکەیان فەرامۆش دەکەن. چوونکە ئەوان پاش بەجێهێشتنی فەرمانگە، دەکەونە بارودۆخێکی تازەوە، بەڵام ژنان پێویستیان بە گۆڕینی شوێن نییە تا یارمەتییان بدات ڕێوشوێنێکی باشتر بدۆزنەوە بۆ بڕینی ڕێگای ژیان. بەڵام ئەگەر بە هەڵەدا نەچم ئەو ژنانەی کە لە دەرەوەی ماڵەوە کار دەکەن، لەم ڕووەوە دۆخیان زیاتر لە ژنانی ماڵەوە نزیکترە وەک لە پیاوە هاوکارەکانیان. واتە بە لای ژنانەوە زۆر ئەستەمە حەز لە شتێک بکەن کە بە ڕاستیی بە لایانەوە گرینگ نەبێت. مەبەست و ئامانجەکانی ژنان کاریگەرییەکی زۆر لە سەر بیر و ئەندێشەیاندا دادەنێن و ئەوان زۆر بە دەگمەن ئاوڕ لە شتانێک دەدەنەوە کە وەک پێویست بە لایانەوە گرینگ نەبن. ئەڵبەتە دیارە هەندێ ئاوارتەش هەن کە من نکووڵیی لە بوونیان ناکەم، بەڵام لێرەدا باس لە سەر ئەو پرسانە دەکەین کە گشتیین و جارێک قسە لە سەر ئاوارتەکان

ناکەم؛ بۆ نموونە لە کۆلێژێکی تایبەتی کچاندا ئەگەر پیاوێک حزووری نەبێت، ژنانی مامۆستا لە کاتی خواردنی نانی دەمەو ئێوارەدا باسی بازار و کڕین دەکەن، بەڵام لە کۆلێژ و زانکۆکانی تایبەت بە کوڕاندا ئەم جۆرە قسە و باسانە لە گۆڕێدا نین. ئەم تایبەتمەندییەی ژنان هێمایە بۆ ئەرکناسیی و گرینگیدانی زیاتریان لە چاو پیاواندا. بەڵام من پێم وا نییە ئەم تایبەتمەندییانە کاریگەرییەکی ئەوتۆ لە سەر کارەکەیاندا دابنێت. ئەم جۆرە ڕەفتارانە جۆرێک بەرچاوتەنگیی و تەنانەت سەرسووڕمانیشی لێ دەکەوێتەوە.

سەرجەم حەزە ڕەواکان سەرەڕای گرینگبوونیان وەک سووکناییبەخش و هێورکەرەوە، چەندین سوود و قازانجی دیکەشیان هەیە، بۆ نموونە ئامادەکردنی مرۆڤ بۆ پاراستن(ڕاگرتنی)ی هاوسەنگیی و میانەڕۆیی کە بە هۆیەوە تاک بە دوای ئامانجەکانیدا پەیوەست دەبێت بە گرووپەکانی ترەوە، یان بە دوای دۆزینەوەی کار و کاسپییەکدا بە ئاسانیی سەرکەوتن بە دەست دێنێت. لە لایەکی ترەوە هەر ئەم مەسەلەیە وامان لێ دەکات ئەوە فەرامۆش بکەین کە کارەکەی ئێمە بە بەراورد لەگەڵ کۆی کار و چالاکییە مرۆییەکاندا چەند بێبایەخە و چۆن هیچ کاریگەرییەکی لە سەر کاروبار و پرسەکانی دنیادا نییە. ڕەنگە پرسیار بکەن سەرقاڵبوون بەم باس و خواستانەوە چ سوودێکی هەیە؟ ئەم پرسیارە چەندین وەڵام هەڵدەگرێت: یەکەم مرۆڤ دەبێ بە وردبینیی و تێڕامانێکی دروستەوە لە دیاردە و دەرکەوتەکانی جیهان بڕوانێت تا بتوانێت چالاکییە پێویستەکانی خۆی لەگەڵیاندا بگونجێنێت. هەر کام لە ئێمە تەمەنێکی تایبەت و کورتمان بۆ ژیان هەیە کە بە بەراورد لەگەڵ تەمەنی جیهاندا زۆر کورتە و لەم تەمەنە کورتەشدا ناچارین دەرک بە قورسترین و ئەستەمترین پرسەکانی پێوەندیدار بە جەوهەری شتومەکەکان و حەقیقەتەکانی دنیا بکەین. چاوپۆشیکردن لەو هەلانەی کە بۆ بەدەستهێنانی زانیاریی لە ئارادایە، ڕێک لەوە دەچێت کە کەسێک بچێت بۆ تەماشای شانۆگەرییەک بەڵام هیچ سەرنجێکی پێ نەدات. دنیا پڕە لە ڕووداوی خەمهێنەر و شادیهێنەری قارەمانانەی تێکەڵ بە سەرسامیی و سەرسووڕمان و، کەسانێکیش کە غافڵ بن لەو شتانەی کە ژیان پێشکەشی کردووین، بە ڕاستیی لەو نیعمەتانەی کە ژیان پێی بەخشیوین هیچیان دەست ناکەوێت.

کەواتە جارێکی دیکە لەوە تێ دەگەین کە هەستی هاوسەنگیی، زۆر بایەخدار و هەندێ جاریش سووکنایییبەخشە. ئێمە هەموومان حەز دەکەین هەر لە خۆوە ورووژان و جۆشوخرۆشەکانمان دەرببڕین و لە پڕێکدا بەرەوڕووی گوشار و کێشە ببینەوە و بەبێ هیچ هۆیەک بکەوینە ژێر کاریگەریی گرینگایەتیی و نهێنییەکانی ئەو سووچە بچووکەی دنیا کە تیایدا دەژین و ژیان و مەرگمانی تێدا ڕوو دەدات. ئەم ورووژانە لە ڕادەبەدەرەی سەبارەت بە گرینگیی «بوون»ی خۆمان بە هیچ شێوەیەک جوان و پەسەند نییە، چوونکە ئەگەرچی لە ڕاستییدا وامان لێ دەکات کاری زیاتر بکەین بەڵام وامان لێ ناکات کاری باشتر بکەین. بە گوێرەی ئەو دەرەنجامانەی دەستم کەوتوون، لەو باوەڕەدام گرینگیی «کار» لەوەدا نییە گەورە بێت، بەڵکوو گرینگیی لەوەدایە کۆمەڵگا چەند سوودی لێ دەبینێت. هەر چەند پێدەچێت ئەو کەسە پێشەنگانەی کە ژیان بە گۆڕەپانی هەوڵ و تەقەلا و ماندووبوون دەزانن، بە شێوەیەکی تر بیر دەکەنەوە. کەسانێک کە لە کارەکەیاندا زێدەڕۆیی دەکەن هەمیشە دەکەونە داوی وشکەڕۆیییەوە و ئەم مەیلە ناهاوسەنگە و ئەم خۆبەزلزانینە نەشیاوە، دەبێتە هۆی ئەوە کە کارەکانی دیکەیان لە بیر بکەن و پێیان وا بێت بە هەڵبژاردنی کارێک و وازهێنان لەوانی دیکە، دەبێتە هۆی ئەوە کە لە زەرەر و زیانە کوتوپڕیی و هەڵکەوتەکانی کارەکانی تر بەدوور بن. تەنها بە یارمەتیی یەک ڕێوشوێن دەتوانین بەرەنگاری ئەم عادەت و ڕەفتارە وشکەڕۆیانە ببینەوە، ئەویش تێگەییشتن و بەدەستهێنانی دەرکێکی باڵایە لە سەر ژیانی مرۆڤ و پلە و پێگەی لە دنیادا، ڕەنگە ئەم قسەیە لە کاتی ئێستادا زۆر گەورە بنوێنێت بەڵام سەرەڕای ئەو شتانەی باسمان کرد، خۆی لە خۆیدا بەها و بایەخێکی گەلێک زۆری هەیە.

یەکێک لە کەموکوڕییەکانی خوێندنی باڵا (خوێدندنی ئەکادیمی) لەم سەردەمە نوێیەدا ئەوەیە کە ئامرازەکانی فێرکاریی لەگەڵ بەدەستهێنانی توانایی و شارەزاییدا نایەنەوە و پێکەوە ناگونجێن و فکر و دڵ لە ڕێگەی توێژینەوەگەلی بێلایەنانەی لە ئاست بارودۆخی جیهانەوە پەرە ناستێنن و گەشە ناکەن. ئەمانەی خوارەوە وەک نموونە دێنینەوە تا ڕوونکردنەوەی زیاترمان لە سەر باسەکە کردبێت:

ئێوە بە ئاگاییەکی تەواوەوە دەچنە ناو خەبات و تێکۆشانێکی سیاسییەوە و ئەوپەڕی هەوڵی خۆتان دەدەن بۆ سەرکەوتنی حیزبەکەتان. تا ئێرە کارەکەی ئێوە ئاقڵانە و جێی

داکۆکیی لێکردنە و هیچ ڕەخنەیەکی لە سەر نییە. بەڵام ڕەنگە لە ماوەی ئەم خەباتە سەختەدا هەلومەرجەکە وای لیٚ بێت کە سەرکەوتنتان بەند بێت بە پەرەپێدانی ڕق و کینە، توندوتیژیی، دڵپیسیی و ڕەشبینیی بەرامبەر بە هەموو دنیا و، بەو ئەنجامەش بگەن کە باشترین ڕێگا لەو هەلومەرجەدا، سووکایەتیکردن بە هەندێک نەتەوەی بیانییە. ئەگەر پانتایی ئەندێشەی ئێوە تەنها قۆناغی «ئێستا» بگرێتەوە یان ئەگەر پلان و بەرنامەتان ئەوە بێت کە هەر چۆنێک بووە دەبیٚ بە ئامانجەکەتان بگەن و بە تەنها بیر لە سەرکەوتن بکەنەوە، ئەم ڕێگە گومانلێکراو و باوەڕپێنەکراوانە هەڵدەبژێرن و بە هۆیانەوە بە زووترین کات سەرکەوتن بە دەست دێنن، ئەوەش لە کاتێکدایە ڕەنگە دەرەنجامەکەشی زۆر نالەبار و کارەساتبار بێت. لە لایەکی ترەوە ئەگەر پێکهاتە و چوارچێوەی مێشکتان بیر لە گۆڕان و وەرگۆڕەکانەکانی جۆری مرۆڤ بکاتەوە و هێدی هێدی لە قۆناغی دڕندەیی و نامرۆیی دوور بکەوێتەوە و، ئەم قۆناغە کورتەی ژیانی مرۆڤ لەگەڵ تەمەنی ئەستێرە و هەسارەکاندا بەراورد بکات، بەو دەرەنجامە دەگەن ئەو ململانێیە بێوچانەی کە خۆتان تووش کردووە، ئەوە ناهێنێت خۆتان بەرەوڕووی وەها مەترسییەک بکەنەوە و بەرەو ئەو تاریکیی و نەزانییەی هەنگاو بهاوێن کە تازە وردە وردە لێی ڕزگار بووگن.

دیارە تەنها هەر ئەمە نییە. چوونکە ئەگەر لە گەییشتن بە ئامانجەکەتان شکست بهێنن، ئەم هەستە کە جیهان زووتێپەڕ و کاتییە پاڵپشتییان دەکات و ناهێڵێت خەم و خەفەتی داڕمان و زەبوونیی، بێتە دڵتانەوە. لە وەها دۆخێکدا جگە لە چالاکییە سەرەکییەکانی خۆتان، ئەو ئامانج و مەبەستانەش کە زۆر لێتانەوە دوورن، بە ئەسپایی دەردەکەون و دەزانن کە کەسێکی تاک و تەنیا نین، بەڵکوو یەکێکی ناو ئەو سوپا گەورە و مەزنەن کە مرۆڤی بەرەو شارستانییەت پاڵ پێوە ناوە. کاتێک ئەمەتان بۆ دەرکەوت، چارەنووستان هەر چییەک بێت بە دڵنیاییەوە بەختەوەریی هەرگیز بە جێتان ناهێڵێت و ژیانتان هاوشێوەی ژیانی گەورەپیاوانی هەموو سەردەمەکان دەبێت و لەم حاڵەتەشدا مەرگی تاک، ڕووداوێکی بچووک و کەمبایەخ دەبێت.

ئەگەر من ڕێم پیٚ بدرایە خوێندنی ئەکادیمیم بە دڵی خۆم ڕێک بخستایە، وام پیٚ باشتر بوو لە جیاتیی دابونەریتەکانی ئەرتۆدۆکسی کۆن - کە هەندێک لەو لاوانەی کە دیارە

توانای تێگەییشتنی کەمتریان هەیە و دژی چالاکیی و پرۆسە ڕۆشنبیرییەکانن، حەزیان لێیە - شتێک دابنێم کە بە زەحمەت بتوانرێت ناوی ئایینزای لێ بنرێت، چوونکە ئەوە، تەنها چڕبوونەوەی فام و تێگەییشتنە لە سەر حەقیقەتە بەرچاو و ئاشکراکان. من دەبێ لاوان لە ڕابردوو ئاگادار بکەمەوە و تێیان بگەینم کە داهاتووی مرۆڤ بە ئەگەرێکی زۆرەوە ئێجگار درێژترخایەنتر لە ڕابردوویەتی و، هەروەها زانیاریگەلێکی دروستیان سەبارەت بەم هەسارەی لە سەری دەژین بخەمە بەردەستیان تا بەم ڕاستییە بگەن کە ژیانی سەر ئەم هەسارەیە، تەنها ڕووداوێکی کاتییە و هیچی تر. من لە هەمان کاتدا کە هەندێک حەقیقەت سەبارەت بە ناگرینگبوونیی تاک باس دەکەم، هەندێک حەقیقەتی تریش ئاشکرا دەکەم کە تاک دەتوانێت لە ڕێگەیانەوە چ کارگەلێکی گەورە و مەزن ئەنجام بدات. دەبێ ئەم حەقیقەتەش قبووڵ بکەین کە هیچ شتێک لەم دنیا بەرین و بێکۆتاییەدا بەبێ شیکردنەوەی چڕوپڕی چەمکە تایبەتییەکانی، هیچ بەها و بایەخێکی نییە. سپینۆزا[١٠٤] چەندین ساڵ پێش ئێستا سەبارەت بە کۆیلایەتی و ئازادیی مرۆڤ بابەتێکی نووسی. ئەو جۆرە نووسین و زمانەی کە بۆ دەربڕینی بیر و ئەندێشەکانی بە کاری هێنا، تێگەییشتنی بەشێکی زۆری چەمکەکانی هێندە ئەستەم کرد کە تەنها خوێندکارانی بواری فەلسەفە دەیانتوانی لێی تێبگەن. بەڵام ئەو شتەی کە من دەمەوێ باسی لێوە بکەم:

هەر تاکێک کە بۆ جارێک تەنانەت ئەگەر کورت و خێراش دەرکی بە مەزنایەتیی ڕۆحی مرۆڤ کردبێت، ئەگەر ڕێ بە خۆی بدات ڕێگای پەستیی و ناپاکیی و خۆپەرستیی بگرێتە بەر و بە بچووکترین ناکامییەکان لە پەلوپۆ بکەوێت و لەو شتەی بترسێت کە چارەنووس بۆی لە هەگبە ناوە، هەرگیز ناتوانێت بەختەوەر ببێت. کەسێک کە ڕۆحێکی بەرز

١٠٤ - Spinoza، ١٦٣٢ - ١٦٧٧؛ فەیلەسوفی گەورەی ئیتاڵیی و یەکێک لە کەسایەتییە گەورەکانی سەدەی حەڤدەیەمە. سپینۆزا بە هۆی فێرکارییە زانستییەکانەوە وردە وردە باوەڕی خۆی بە بنەما ئایینییەکان لە دەست دا و دابونەریتە ئاینییەکانی لە بیر کرد و قسەکانیشی ڕقی ئیمانداره جوولەکەکانی ورووژاند و جوولەکەیەکی وشکەڕۆ هەوڵی کوشتنی دا بەڵام سپینۆزا گیانی دەرباز کرد و سەرەنجام کۆمەڵگای جوولەکە ساڵی ١٦٥٦ حوکمی کافربوون(تەکفیر)یان دەرکرد. بەرهەمەکانی بریتین لە: **بنەماکانی فەلسەفەی دیکارت**، **زانستی ئاکار**، **نامیلکەی سیاسەت و چاکسازی لە ئەقڵدا**. ژیانی سپینۆزا لەوپەڕی هەژاریی و قەناعەتدا تێپەڕی. یەکەمین فەیلەسوفە کە خوا بە سەرچاوەی زانایی و مەعریفە دەزانێت و هەروەها خواناسیی بە تاقە ڕێگەی **خۆناسین** و **ئەویدیناسین** لە قەڵەم دەدات.

و باڵای هەیە، سەرەڕای بەئاگابوونی لە پارادۆکسەکان دەبێ دەلاقەی فکر و هزری خۆی بە تەواوەتیی بکاتەوە تا شنەبا و کاریگەریی سوودبەخشی هەموو بوونەوەرانی سرووشتی بەر بکەوێت و بە ئازادانە پیایدا تێپەڕ بن. لە وەها حاڵەتێکدا ئەو، بە قەدەر تواناکانی خۆی وەک مرۆڤێک ژیان و دنیا بەوپەڕی ڕاستگۆییەوە دەبینێت و دەرک بە کەمتەرخەمیی و بچووکیی مرۆڤ دەکات و لەوەش تێ دەگات کە هەموو شتە بەنرخەکانی دنیا لە ناو هزری مرۆڤدا کۆ بۆتەوە و، تاکێکیش کە بیر و ئەندێشەکانی بۆتە ئاوێنەی سەرجەم کائینات، ئەگەر لە گۆشەنیگای تێکۆشانە مرۆییەکانەوە هەڵبسەنگێنرێت، ڕێک هێندەی مەزنایەتیی ئەم جیهانە، گەورەیە و، بە ڕزگاربوون لەو ترسانەی کە کۆیلەکانی ڕووداوەکانی جیهانیان داگیر کردووە، هەست بە چێژ و خۆشییەکی قووڵ دەکات و سەرەڕای هەموو هەوراز و نشێو و گۆڕانکارییەکانی ژیانی ڕواڵەتیی، لە قووڵایی بوونیدا هەست بە بەختەوەریی دەکات.

ئێستا با واز لەم بیر و ئەندێشانە بێنین و باس لە بابەتێک بکەین کە شایەنی باسکردن و گرینگی پێدانە، واتە بایەخی حەزە ڕەواکان، چوونکە هۆکارێکی دیکەش هەیە بۆ ئەوەی کە ئەم حەزانە تا ڕادەیەکی زۆر، کاریگەرییان لە سەر بەدەستهێنانی بەختەوەرییدا هەیە. تەنانەت لە ناو خۆشترین و بەختەوەرانەترین ژیانەکانیشدا هەندێ جار شتانێک ڕوو دەدەن کە دەبنە هۆی خەم و خەفەت. ژمارەیەکی ئێجگار کەمی پیاوان هەن کە - بێجگە ئەوانەی کە هاوسەرگیرییان نەکردووە - هەرگیز لەگەڵ هاوسەرەکانیاندا هیچ کێشە و دەمقاڵێیان نەبووە و، کەم دایک باوکیش هەیە نەخۆشیی منداڵەکانی، تووشی خەم و خەفەت و نیگەرانیی نەکردبێت و، کەم پیشەوەر هەیە تووشی قەیرانی ئابووریی نەبووبێت و، کەم پسپۆڕ هەیە چەند قۆناغی شکست و ناکامیی ئەزموون نەکردبێت. لە کاتی پێشهاتنی ئەم جررە شتانەدا ئەوە نیعمەتێکی زۆر گەورەیە کە مرۆڤ بتوانێت بیر و مێشکی بخاتە سەر کارێکی تر. لە وەها کاتێکدا بە هۆی بوونی نیگەرانیی و دڵەڕاوکێ، هیچ کارێکی دیکە لە تواناندا نییە. ڕەنگە کەسێک بە یارمەتیی یاریی شەترەنج و ئەویدی بە خوێندنەوەی چیرۆککگەلی پۆلیسیی و کەسی سێهەمیش لە دنیای هەسارەکاندا و کەسی چوارەمیش بە خوێدنەوەی هەواڵەکانی سەبارەت بە هەڵکۆڵین و پشکینینی کەلدانی و "ئاشوورییەکان"ەوە نیگەرانیی و دڵەڕاوکێکانیان کەم بکەنەوە و سووکنایی بە دەروونیان ببەخشن. ڕەفتار و هەڵسوکەوتی ئەم

چوار کەسە، ئاقڵانەیە و بە پێچەوانەشەوە ئەگەر کەسێک کە بۆ چارەسەرکردنی نیگەرانییەکانی هیچ هەنگاوێک هەڵنەگرێت و لێگەڕێت نیگەرانیی بە سەریدا زاڵ بێت و قەیرانیی عاتیفیی، فکر و هزری داگیر بکات، کارێکی ئاقڵانەی نەکردووە و شیرازەی ئەقڵی تێک چووە و لەوە بە دواش بۆ بەرەنگاربوونەوەی مەترسیی و گرفتارییەکانی دیکە، لاوازتر و بێهێزتر دەبێت.

هەر ئەم تێبینییانە سەبارەت بە خەم و خەفەتە لە قەرەبوو نەهاتووەکانیش ڕاستیی لە خۆ دەگرێت، بۆ نموونە خەمی مەرگی کەسێک کە زۆرمان خۆش دەوێت. لە وەها بارودۆخێکدا خۆ نوقمکردن لە ناو دەریای خەم و ماتەمدا هیچ سوودێکی نییە. ئەڵبەتە دیارە خەم شتێکە پێشی پێ ناگیردرێت و دەبێ چاوەڕوانی بکەین، بەڵام هێندەی بۆمان بکرێت دەبێ هەوڵ بدەین کەمی بکەینەوە. کاتێک بەدبەختیی ڕوومان تێ دەکات، نابێ بە ملکەچکردن بۆ ئیحساسەکانمان تا دوادڵۆپی نەهامەتیی و چەرمەسەرییەکان هەڵلووشین و ژیان لە خۆمان تاڵ بکەین. ئەڵبەتە من نکووڵیی لەوە ناکەم کە لەوانەیە خەم، مرۆڤ لە پەلوپۆ بخات، بەڵام جەخت دەکەمەوە هەموو تاکێک دەبێ ئەوپەڕی هەوڵی خۆی بخاتە گەڕ تا لەم چارەنووسە نگریس و لە چاوەڕواننەکراوە ڕزگاری بێت. من پێشنیار دەکەم تاک فکر و هزری خۆی بخاتە سەر هەر بابەتێکی دیکە بە مەرجێک ئەو بابەتە خۆی زیانبەخش و ڕووخێنەر نەبێت. یەکێک لەو هۆکارانەی کە بە ڕای من دەتوانێت زیانبەخش بێت، مەشرووبخواردنەوە و ئالوودەبوون بە مادە هۆشبەرەکانە. تەنانەت ئەگەر بۆ ماوەیەکی زۆر کورتیش بێت، بێجگە لە نابوودیی و تیاچوون هیچ ئەنجامێکی نابێت و ئەمەش چارەسەری ڕاستەقینەی خەم و خەفەتە دەروونییەکان ناکات، بەڵکوو دەبێ بە ئاراستەیەکی تازەدا بیانبەین یان بیانخەینە ڕێڕەوێکەوە کە لانیکەم لەم ناکامییانەی ئێستا دوور بن.

ئەگەر سەرنج و وزەمان لە سەر چەند حەزێکی دیاریکراو چڕ بکەینەوە کارێکی سەختمان ئەنجام داوە، چوونکە ئەم حەزانەش دوای ماوەیەکی کەم وەڕسکەر دەبن و تاک تووشی خەم و خەفەت دەکەن. بۆ تەحەمولکردنی ناکامییەکان لە کاتی بەرەوڕووبوونەوەیاندا ئاقڵانەترین کار ئەوەیە لە کاتی خۆشیی و پشووکانماندا ژمارەی ئەم حەزانە زیاتر بکەین تا فکر و هزرمان لە

کاتی ڕوودانی کارەساتێکی کتوپڕییدا ئامادەیی هەبێت و خۆی بەو حەزانەوە سەرقاڵ بکات کە بتوانن یارمەتیمان بدەن بارودۆخە قەیراناوییەکان تەحەمول بکەین و بەرگەیان بگرین.

تاکێک کە بە قەدەر پێویست حەز و ڕەغبەت و هێز و وزەی هەبێت، بە سەر هەموو ناکامییەکاندا زاڵ دەبێت. ئەو دەبێ بە سەرهەڵدانی هەموو کارەسات و خەم و خەفەتێک سەرنجی بخاتە سەر حەزەکانی تری ژیان. نابێ دنیا ئەوەندە بچووک و سنووردار بکات کە بە ڕوودانی هەر کارەساتێکی دڵتەزێن لە پەلوپۆ بکەوێت و تیا بچێت. ئەگەر تاک بە ڕوودانی چەند کێشە و گرفتارییی، خۆی وەک کەسێکی شکستخواردوو و هەرەسهێناو تەماشا بکات، چوونکە هیچ پاساوێکی بۆ نییە بڵێین ئەوە کەسێکی دڵناسک و هەستیارە و... دەبێ بە کەسێکی مردووی لە قەڵەم بدەین و بە حاڵی بگرین. سەرجەم هەست و عاتیفەکانی مرۆڤ لە بەردەم مەترسیی «مەرگ»دان و ڕەنگە لە هەموو ئان و ساتێکدا ئەگەری ئەوە هەبێت کەسانێکمان لێ بمرن کە زۆر خۆشمان دەوێن، کەواتە پێویستە ژیانمان دوور لە بەرچاوتەنگیی و سنوورداریێتیی بێت تا مانا و چەمکی ژیان نەکەوێتە مەترسییەوە.

بە هۆی ئەو هەموو هۆکارانەی باسمان کردن، تاکێک کە ئاقڵانە بە دوای بەختەوەرییدا دەگەڕێت، جیا لە حەزە سەرەکییەکان کە کۆڵەکەی ژیانی هەموو تاکێکن، هەندێ حەزی تریشی بۆ خۆی هەڵبژاردووە.

١٦

## هەوڵدان و چۆکدادان

میانەڕۆیی و خۆپاراستن لە زێدەڕۆیی و یاریی و کەیفخۆشییەکان، ڕێوشوێنێکی گونجاو و دورست نییە. باش لە بیرمە لە قۆناغی لاوێتیمدا زۆر ڕقم لەم بۆچوونە بوو و سووک سەیرم دەکرد چوونکە لەو ڕۆژانەدا کارگەلی قارەمانانەم زۆر پێ خۆش بوو و ستایشم دەکرد، بەڵام حەقیقەت هەمیشە دڵبزوێن و سەرنجڕاکێش نییە و زۆرێک لە شتانی دەرەوەی بازنەی ئەقڵ و لۆژیک تەنها لە ڕووی ئیحساسییەوە پەسەند دەکرێن و هیچ بەڵگەیەک بۆ سەلماندنیان لە ئارادا نییە. میانەڕۆیی، باشترین ڕێوشوێنە لە عورفی خەڵکدا و ڕەنگە ئەمە ڕێکارێکی دروستیش نەبێت، بەڵام زۆربەی کات ئەم بۆچوونە لەگەڵ ڕاستییەکاندا دێتەوە.

یەکێک لە نموونە پێویستەکانی میانەڕۆیی، ڕەچاوکردنی هاوسەنگیی نێوان هەوڵدان و خۆبەدەستەوەدان (=خۆڕادەستکردن)ە: هەر دوو بۆچوونەکەش لایەنگری زۆریان هەیە. بۆچوونی خۆبەدەستەوەدان لە لایەن گرووپی مەسیحییە "پۆریتەن"ەکان و جادووگەرەکان و، بۆچوونی «هەوڵدان»یش لە لایەن پسپۆڕانی لایەنگری قوتابخانەی چالاکیی و کار و مەسیحییە وشکەڕۆکانەوە پڕوپاگەندەی بۆ کراوە. هەردوو لایەنیش هەندێک حەقیقەتیان لە لایە، بەڵام هیچکام بە تەنێ هەڵگری حەقیقەتە هەمەکییەکان نین. لەم بەشەدا دەمەوێ هاوسەنگیی لە نێوان هەر دووکیاندا بێنمە ئاراوە و بۆیە باسەکەشم بە «هەوڵدان» دەست پێ دەکەم:

بەختەوەریی - بێجگە لە چەند نموونەی دەگمەندا نەبێت - شتێک نییە وەکوو میوەیەکی پێگەییو و بە هەڵکەوت بەر بێتەوە و بکەوێتە دەممانەوە؛ هەر بۆیەشە ناوی ئەم کتێبەمە ناوە

**هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی بەختەوەریی** (**داگیرکردنی بەختەوەریی**). چوونکە لە دنیایەکدا کە پڕە لە نەهامەتیی و نەخۆشیی و هەیەجانگەلی ڕۆحیی و هەوڵدان بۆ دابینکردنی بژێویی ژیان، ژن و پیاوێک کە دەیانەوێ بەختەوەر بن، دەبێ فێری فێڵ و تەڵەکە و ڕێکارگەلێک بن کە بتوانن بە سەر ئەو ناکامیی و نەهامەتییانەدا زاڵ بن کە لە هەموو لایەکەوە شاڵاویان بۆ دێنن. ڕەنگە لە هەندێ هەلومەرجی ئاوارتەدا پێویست بە هیچ هەوڵدانێکی گەورە نەکات. تاکێک کە سروشتی پاک و بێگەردی هەیە و سامانێکی زۆریشی بە میرات بۆ ماوەتەوە و تەندروستیی باش و سەلیقەیەکی ڕێکوپێکیشی هەیە، ڕەنگە ژیانێکی ئاسان و ئاسایی بەرێتە سەر و سەریشی لەو هەموو جەنجاڵ و هەرایەی چواردەوری بسووڕمێت کە بۆ زاڵبوون بە سەر کێشەکانی ژیان بەرپا بووە. ژنێکی جوان و قەشەنگ کە بە سروشت حەزی لە ئاسوودەیی و خۆشگوزەرانییە و بە هەڵکەوت دەبێتە هاوسەری پیاوێکی دەوڵەمەند کە هیچ چاوەڕوانییەکی لێ نییە و تەنانەت دوای هاوسەرگیرییش گوێ بە قەڵەوییە لە ڕادەبەدەرەکەی نادات، ڕەنگە لەم قەڵەویی و تەمەڵیی و ئاسوودەبوونەی چێژ وەربگرێت بە مەرجێک لە بواری منداڵەکانیشیدا بەخت یاری بێت، بەڵام دیارە شتی وا بە دەگمەن ڕوو دەدات. هەموو خەڵک دەوڵەمەند نین و هەموانیش بە سروشتی چاکەوە لە دایک نابن و زۆربەی مرۆڤەکانیش ئیحساساتی ناجێگیریان هەیە و ژیانی بێدەنگ و ئارام و یەکچەشن وەڕسیان دەکات. تەندروستیی نیعمەتێکە هیچ کەسێک لە مانەوە و بەردەوامبوونی دڵنیا نییە. هاوسەرگیریی، هەمیشە سەرچاوەی خێر و بەختەوەریی نییە. لە بەر ئەم هەموو هۆکارانەشە کە پیاوان و ژنان دەبێ لە پێناوی بەدەستهێنانی بەختەوەرییدا هەوڵ بدەن، نەک ئەوەی کە چاوەڕێ بن وەکوو خەڵاتێکی خوایی پێیان ببەخشرێت. لە بەدەستهێنانی بەختەوەرییدا هەر دوو هەوڵدانی دەروونیی و دەرەکیی دەوری گرینگی خۆیان هەیە.

هەوڵدانی دەروونیی ڕەنگە لەخۆگری تێکۆشانی پێویست بۆ خۆبەدەستەوەدان بێت، کەواتە ڕێم بدەن لێرەدا تەنها هەلومەرجەکانی هەوڵدان و تێکۆشانی دەرەکیی(ڕواڵەتیی) تاوتوێ بکەین.

سەبارەت بەو ژن و پیاوانەی کە ناچارن لە پێناوی دابینکردنی بژێویدا هەوڵ بدەن، دیارە «هەوڵدان» کارێکی زۆر پێویستە و پێویست بە جەخت لەسەرکردنیش ناکات. ئەمە

ڕاستییەکە "مورتاز"ە هەژارە هیندییەکان بەبێ هیچ هەوڵدانێک و تەنها بە وەرگرتنی خێر و بەخششی کەسانی خێرخواز دەتوانن درێژە بە ژیان بدەن. بەڵام دەسەڵاتدارانی وڵاتانی ڕۆژئاوا لەگەڵ ئەم جۆرە ژیان و دابینکردنی بژێوییەدا نین، جیا لەوەش دۆخی کەش و هەوا و باری جوغرافیایی ناوچەکە، کارەکە لە چاو وڵاتانی وشک و گەرمەسێردا نالەبارتر و ئەستەمتر دەکات؛ بەم واتایە کە لە زستاندا ڕەنگە کەم کەس هێندە تەمەڵ بێت کە بێکاریی ناو هەوای ساردی لە کارکردن لە ژوورە گەرمەکان پێ خۆشتر بێت.

کەواتە لە وڵاتانی ڕۆژئاوادا بە تەنها خۆبەدەستەوەدان، مەرجی بەدەستهێنانی بەختەوەریی نییە.

بە ڕای زۆربەی خەڵکی ڕۆژئاوا، بە تەنها دابینکردنی ئامێر و ئیمکاناتی ژیان، بۆ دابینکردنی بەختەوەریی بەس نییە، چوونکە حەزی سەرکەوتن تیایاندا هەیە. لە هەندێ پیشەدا لەوانە توێژینەوەگەلی زانستیی، ئەم هەستە تەنانەت بۆ ئەوانەش کە داهاتیان کەمە قابیلی بەدەستهێنانە، بەڵام لە زۆربەی پیشەکاندا داهات پێوەری سەرکەوتنە. بۆیە ڕەزامەندیی و خۆبەدەستەوەدان زۆربەی کات ئەنجامی پەسەند و لەباری هەیە. چوونکە لە دنیای پڕ لە ڕکابەرییدا سەرکەوتنی یەکجاریی تەنها بۆ ژمارەیەکی کەمی تاکەکان دەڕەخسێت.

هاوسەرگیریی پرسێکی گرینگە کە هەوڵدان لە پێناویدا بەندە بە هەلومەرجی شوێنەکەوە و بە پێی هەلومەرج لەوانەیە وەک زەروورەت چاوی لێ بکرێت یاخود هیچ زەرووڕەتێکی نەبێت. لە هەندێک وڵاتدا لە ڕووی ژمارەوە هاوسەنگیی لە نێوان ژنان و پیاواندا نییە، بۆ نموونە بەریتانیا کە ژمارەی پیاوان زیاترە، یان ئۆستراليا کە ژمارەی ژنان کەمترە. لە وەها دۆخێکدا ئەو ڕەگەزەی کە لە ڕووی ژمارەوە کەمترە، بە مەبەستی هاوسەرگیریی، پێویستی بە هەوڵدانێکی زیاتر هەیە و بۆ ئەو ڕەگەزەش کە لە ڕووی ژمارەوە زیاترە دۆخەکە پێچەوانە دەبێتەوە. زۆربوونی ژمارەی ژنان پاڵنەرە بۆ هەوڵدان و بیرکردنەوەی زیاتریان و ئەو کەسانەی کە ڕاگەیاندن و ڕیکلامەکانی گۆڤاری ژنان دەخوێننەوە، زیاتر بەم مەسەلەیە ئاشنان. لە شوێنێکدا کە ژمارەی پیاوان زیاتر بێت، بۆ گەییشتن بە مەبەستەکەیان زۆرجار پەنا دەبەنە بەر هەندێ کار و کردەوەی سەرسووڕهێنەری وەکوو توانای تیرهاویشتن. ئەمە شتێکی ئاساییە چوونکە زۆربەی تاکەکان لە سنووری شارستانییەتدا گیریان خواردووە و وەستاون. من بە ڕاستیی نازانم ئەگەر بە هۆی هەندێ گۆڕانکارییەوە ژمارەی پیاوان لە "بەریتانیا"دا زیاتر

ببێت چی دەقەومێت! ڕەنگە لەو حاڵەتەدا ناچار بن دابونەریتی پاڵەوانانی سەردەمی کۆن بگرنە بەر.

گرینگیی ئەو ڕێژە هەوڵ و تەقەلایەی کە بۆ پەروەردەی منداڵان پێویستە، هێندە زۆر بووە کە ڕەنگە کەس نەتوانێت حاشای لێ بکات. ئەو وڵاتانەی کە تیایاندا باوەڕەکان لە سەر بنەمای ڕازیبوون و خۆبەدەستەوەدان ڕاوەستاون و بە هەڵە لایەنی ڕۆحانیی پێ دەبەخشن، زیاتر ئەو وڵاتانەن کە مەرگ و میر و مردنی منداڵیان تێدا زۆرە؛ دەرمان، پاکژیی، پاکبوونەوە لە چڵک و نەخۆشیی و خواردنی دروست و ڕێکوپێک شتانێکن کە خەڵکی ئەو ناوچانە بە هیچ شێوەیەک گرینگییان پێ نادەن، چوونکە دابینکردنی ئەم شتانە پێویستی بە ئاوەز و وزەیەکی زۆر هەیە بۆ لەبارکردنی باری ئابووریی. کەسانێک کە وەها بیرۆکەگەلی وەهمئاسایان هەیە و لە مێشکیاندا ستایشی چڵک و پیسیی دەکەن بە دڵنیاییەوە بە هۆی جۆری بیرکردنەوەیانەوە دەبنە هۆی مەرگ و تەفروتوونابوونی منداڵەکانیان.

ئەگەر بمانەوێ بە شێوەیەکی گشتیتر باسی ئەم بابەتە بکەین، دەتوانین بڵێین هەموو تاکێک بە دوای هێز و دەسەڵاتێکی ڕەوا و ڕێپێدراوی کۆمەڵایەتیی و سیاسییەوەیە، تاکێک کە حەز و ئارەزووە سروشتییەکانی سەرکوت نەکرابێت. ئەو جۆرە هێز و دەسەڵاتەی کە تاک خوازیاریەتی، بەندە بە هەستە گرینگ و گەورەکانییەوە. یەکێک بەم خەون و خولیایەوە دەژیت کە بە سەر کردەوەکانی دیتراندا زاڵ ببێت و ئەوی تریش دەیهەوێت فکر و هزری کەسانی تر بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە و کەسێکی دیکەش حەز بە داگیرکردنی ورووژان و سۆز و عاتیفەکانی خەڵکی تر دەکات. یەکێک بە تەمایە گۆڕانکارییەکانی چواردەوری بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە و ئەوی تریش حەز بە دەسەڵاتێک دەکات کە لە هێز و توانایەکی مەعنەوییەوە سەرچاوە دەگرێت. بە گشتیی ئەو کردەوانەی کە دەوریان لە دابینکردنی خێر و ئاسایشی گشتییدا هەیە، لە ویستێکی دەسەڵاتخوازانەوە سەرچاوە دەگرن، مەگەر لە حاڵەتێکدا نەبێت کە تەنها و تەنها لایەنی مادیی مەسەلەکە لەبەرچاو بگیردرێت کە لەو حاڵەتەدا دەبێتە هۆی گەندەڵیی و دارزینی کەسانی ئەنجامدەر.

تاکێک کە بە هەستێکی مرۆڤدۆستانەوە بینینی بەدبەختیی و نەهامەتییەکانی مرۆڤ ئازاری دەدات، بە دڵنیاییەوە دەرک بەو ڕەنج و ئازارە ڕاستەقینانە دەکات و حەزی

دەسەڵاتخوازییش ئامرازێکە بۆ هێورکردنەوەی دەرد و ئازارەکانی. بە تەنها کەسانێک گوێ نادەنە کاریگەریی و تایبەتمەندییەکانی دەسەڵات کە هیچ دڵسۆزییەکی ڕاستەقینەیان بەرامبەر بە هاوڕەگەزەکانیان نییە. کەواتە هەندێک لە جۆرەکانی هێز، وەک بەشێک لە کەرەسەی پێویست و کاریگەر بۆ بنیاتنانی کۆمەڵگایەکی باش و پێشکەوتوو، ڕەوا و جێی پەسەندن و هەر جۆرە حەزکردنێک لە هێز و دەسەڵات، مادامێک بتوانێت بەربەستێک لە سەر ڕێگا لا بەرێت، ئەوە هەڵقوڵاوی هەوڵدانێکی ئاگایانەیە و، [بۆیە] ڕەوا و ڕێپێدراوە. شتێک بە ناوی «شارستانییەتی ڕۆژهەڵات» کەوتۆتە بەر سەرنجی ڕۆشنبیرانی ڕۆژئاوا، لە کاتێکدا ڕۆژهەڵاتییەکان خۆیان بە تەمان وازی لێ بێنن. ڕەنگە ئەوان گومانیان لە سەر ئەو شتانەی هەبێت کە باسمان لێ کردن و بۆیە بیرهێنانەوەی ئەم خاڵانە ئەوەندەش بێهوودە نەبووە.

بە هەر حاڵ خۆبەدەستەوەدان و ڕەزامەندیی، دەورێکی گرینگ دەگێڕن لە داگیرکردنی بەختەوەرییدا، دەورێک کە ناتوانین کەمبایەختر لە دەوری هەوڵدان و خۆبەدەستەوەدانی بزانین. پیاوی ئاقڵ لە ژێر گوشاری ناکامییە حەتمییەکانی سەردەمدا ناکەوێتە ژێر کاریگەریی عاتیفەکانییەوە و کاتەکانی خۆی بە ئاه و هەناسەی حەسرەتکێشانەوە بە فیڕۆ نادات، بەڵکوو بە پێچەوانەوە بە پەرەپێدانی ئەندێشەکانی، خۆی لە ڕووداوە ناخۆشە حەتمییەکان بەدوور دەگرێت و بە مەبەستی شوێنکەوتنی ئامانجە باڵاکان، لە ئاست ڕووداوە نالەبارەکاندا ڕێی خۆبەدەستەوەدان و ڕەزامەندیی دەگرێتە بەر.

زۆربەی تاکەکان لە کاتی بەرەوڕووبوونەوەی ڕووداوە بچووکەکاندا ناڕەحەت و تووڕە دەبن و بەم جۆرە بەشێکی زۆری ئەو وزەیەی کە دەبێ کەڵک و سوودی هەبێت، بە فیڕۆ دەدەن. تەنانەت لە بەدواداچوونی پرسە ئێجگار گرینگەکانیشدا کارێکی ئاقڵانی نییە ئەگەر هەست و عاتیفەمان هێندە بە خۆیانەوە سەرقاڵ بکەن کە بیرکردنەوە لە شکستهێنان، بەردەوام هەڕەشە لە ئارامشی فکرمان بکات. مەسیحییەت خەڵک فێری خۆبەدەستەوەدان و چۆکدادانی تەواوەتیی لە بەرانبەر ئیرادەی خوای گەورەدا دەکات و تەنانەت ئەو کەسانەش کە توانای قبووڵکردنی ئەم بابەتەیان نییە، خۆبەدەستەوەدان لە هەموو کار و چالاکییەکانیاندا بەدیی دەکرێت. لێهاتوویی و کارایی لە پرسە گرینگەکاندا بەندە بە نەبوونی هەندێک ورووژانی دەروونییەوە، چوونکە دڵەڕاوکێ و شڵەژانی ڕۆحیی، ناوەناوە بەربەستگەلی گەورە دەخاتە

بەردەم گەییشتن بە ئامانجەکان. لەم حاڵەتەدا شێوازی دروست ئەوەیە کە تاک هەموو هەوڵی خۆی بۆ بەرەوپێشبردنی ئامانجەکەی بخاتە گەڕ و ئەگەریش سەرکەوتنی بە دەست نەهێنا، بابەتەکان بخاتە ئەستۆی قەدەر و چارەنووس. خۆبەدەستەوەدان و ڕەزامەندیی دوو جۆرە: سەرچاوەی یەکێکیان فەرامۆشیی و سەرچاوەی ئەوی تریان بێهیوایی لەو خەونانەیە کە هەرگیز نایەنە دی. جۆری یەکەم ناپەسەندە و جۆری دووهەم پەسەندە. کەسێک کە وەها شکستێکی گەورە تەحەمول بکات کە هیوای خۆی بەرانبەر بە گەییشتن بە مەسەلە گرینگەکان لە دەست بدات، لەوانەیە خۆی فێری ڕادەستکردنی لەبیرکردن و فەرامۆشیی بکات و لە وەها حاڵەتێکدا واز لە هەموو کار و چالاکییە جدییەکانی بێنێت و، لەوانەشە بێهیوایییەکەی خۆی لە ژێر پەردەی ڕستەگەلێکی ئایینیی یان هێڵی دیاریکراوی قەدەرێک کە «بیرکردنەوە، کۆتایی ڕاستەقینەی هەموو تاکێکە»، بشارێتەوە یان دەرببڕێت. بەڵام ئەم کەسە سەرەڕای هەموو هەوڵەکانی بۆ شاردنەوەی شکستە دەروونییەکانی، دیسانەوە تووشی بەدبەختیی و سیاچارەیی دەبێت. بەڵام کەسێک کە خۆبەدەستەوەدانەکەی، لە هیوایەکی لە شکستنەهاتووەوە سەرچاوە دەگرێت - هیوایەکی لە شکستنەهاتوو کە خاوەن مەزنایەتییەکی ڕاستەقینە بێت - دەبێ بە تەواوەتیی بە شێوەیەکی دیکە هەڵسوکەوت بکات. دەشێ چالاکییەکانی تاک لە هەمبەر مەرگ یان هەندێک نەخۆشییدا شکست بێنن. هەروەها شکستخواردن لە بەرانبەر دوژمناندا وانەیەکە فێری ئەوەمان دەکات کە بزانین پێمان ناوەتە ڕێڕەوێکی هەڵەوە کە سەرکەوتنی بە دواوە نابێت. بەڵام ئەگەر ئامانجە کەسەکییەکان، بەشێک بن لە هیوایەتە گەورەکانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتیی، ئەگەر بەرەوڕووی شکست ببنەوە ناتوانرێت بە شکستیی ڕاستەقینە لە قەڵەم بدرێت.

بیرمەندێک کە خەون بە بینینی دۆزینەوەگەلی گەورەوە دەبینێت، ڕەنگە نەتوانێت بەو هیوایەتە گەورەیەی بگات یان چالاکییەکانی بۆ نموونە لەبەر خاتری زیانبەرکەوتنێکی جەستەییەوە، بوەستێت، بەڵام ئەگەر لە قووڵایی دڵەوە خوازیاری پێشکەوتنی زانست بێت و مەبەستەکەی تەنها لە خۆپەرستییەکی بیرمەندانەوە سەرچاوەی نەگرتبێت، تووشی ئەو فەرامۆشیی و بێهیوایییەی نابێت کە کەسانی چالاک لە بواری توێژینەوە خۆپەرستانە زانستییانەکانەوە تووش دەبن. تاکێک کە شێلگیرانە لە پێناوی چاکسازییە پێویستەکاندا

هەوڵ و تەقەلا دەدات، لەوانەیە بە هۆی هەندێ ڕووداوی کتوپڕەوە بە دەرەنجامێکی گونجاو نەگات و دیارە لەم حاڵەتەدا لەوە تێ دەگات کە ئامانج و مەبەستەکەی قابیلی بەدەستهێنان نەبووە بەڵام نوقمی شەپۆلی نائومێدیی نابێت، ئەڵبەتە بە مەرجێک کە بە ڕاستیی بیری لە بەرژەوەندیی داهاتووی مرۆڤایەتیی بە گشتیی کردبێتەوە نەک حەز و ئارەزووە کەسەکییەکانی خۆی.

ئێمە قسەمان لە سەر بابەتگەلێک کرد کە دەلاقەکانی خۆبەدەستەوەدان و ڕەزامەندییان بە ڕوودا داخراوە، بەڵام لە بوارگەلی دیکەدا کە دەستەبەرکردنی ئامانج ئاسانترە، دورستبوونی لەمپەر لە سەر ڕێگای بڕیارە بچووکەکان شتێکی هێندە گرینگ نییە و ئەگەر بەرەوپێشچوون بە ئاراستەی خاڵی کۆتایی (فیناڵ) نەوەستێت و بەردەوام بێت، ئەو بێهیوایی و فەرامۆشییەی کە باسمان لێ کرد، بوونی نابێت. بۆ نموونە تاکێک کە بەرپرسیارێتیی کارێکی گرینگی وە ئەستۆ گرتووە، شکستهێنان لە کار و چالاکییە سادە و ئاسانەکان بەوپەڕی خۆبەدەستەوەدان و ڕەزامەندییەوە و بە ئاسانیی قەرەبوو دەکاتەوە و باوەڕی بەئەنجامگەیاندنی ئەو کارە گرینگەی، هێز و ورەیەکی ئەوتۆ لە دەروونیدا دێنێتە ئاراوە کە لە بەرانبەر پرسە نائومێدکەرەکانی ژیاندا خۆڕاگریی بکات - بەم واتایە کە ئەم ڕووداوانە بە هەند وەرناگرێت و سەرچاوەی دەربڕینی ناتەوانیی لە هەبەریاندا دەگەڕێنێتەوە بۆ تێکچوونی ئاوەز.

هەندێک لە تاکەکان تەنانەت ناتوانن بەرەوڕووی بچووکترین کێشەکانی ژیانیش ببنەوە، هەمان ئەو کێشانەی کە ئەگەر چارەسەر نەکرێن، بەشێکی ئێجگار زۆری ژیانی مرۆڤ داگیر دەکەن. ئەم جۆرە کەسانە لە کاتی درەنگ گەییشتن بە شەمەندەفەر یان ناخۆشبوونی تامی شێو یان دووکەڵکردنی زۆپا، بە توندیی تووڕە دەبن و نوقمی بێهیوایی دەبن و ئەگەر جلەکانیان لە کاتی خۆیدا لە جلشۆرخانەوە نەهێننەوە، جنێو بە هەموو ئامێرە پیشەسازییەکانی دنیا دەدەن. ئەو هێز و ورەیەی کە ئەم جۆرە کەسانە بۆ بەرەنگاربوونەوەی کێشە بچووکەکان سەرفی دەکەن ئەگەر بە ڕێگایەکی ئاقڵانەدا نەڕوات، بەشی ڕووخاندن و نۆژەنکردنەوەی ئیمپراتۆرییەکی مەزن دەکات. پیاوی ژیر و ئاقڵ، ئەو تەپوتۆزەی کە خزمەتکاری ماڵەکەی خاوێنی نەکردۆتەوە و ئەو پەتاتەی کە چێشلێنەر لێی نەناوە و ئەو ڕەشاییەی کە پاک نەکراوەتەوە، خۆی ئەنجامیان دەدات. مەبەستم ئەوە نییە کە هیچ هەنگاوێک بۆ

چارەسەرکردنیان نەهاوێت، بەڵکوو مەبەستم ئەوەیە کە دەشی بەبێ شڵەژان و دڵەڕاوکێ بەرەوڕووی ئەم پرسانە ببێتەوە. خەم و خەفەت و ئازارچەشتن، پەرچەکرداریگەلێکی بێهوودەن و دەتوانین بڵێین کەسانێک کە بە توندیی هەستیان پێ دەکەن، ناتوانن بە سەریاندا زاڵ ببن و دڵنیاش نیم کە ئەم جۆرە کەسانە بتوانن هیچ قازانجێک لەو خۆبەدەستەوەدان و ڕەزامەندییە هەڵکرێنن کە پێشتر باسمان لێ کرد. هەر ئەم بایەخدانی تەواوەتیی بە ئارەزووە گشتییەکانە کە تاک وا لێ دەکەن بتوانێت شکست و کێشە کەسەکییەکانی پێوەندیدار بە پرۆسەی هاوسەرگیرییەکی ناکام تەحەمول بکات، هەروەها ئەو توانایەی پێ دەبەخشێت کە ئەگەر لە شەمەندەفەر بەجێ ما، یان چەترەکەی بەربووەوە سەر قوڕ و لیتەکان، دان بەخۆدا بگرێت و تەحەمول بکات. ئەگەر کەسێکی دڵناسک بێت و تووڕەییشی بێتە سەر، دڵنیا نیم لەوەی کە ئەم ڕێگەچارە بتوانێت چارەسەری بکات.

تاکێک کە لە گوشار و هرووژمی خەم و خەفەت ڕزگاری بووە، ژیانی بە لاوە زۆر خۆشترە وەک لەو کاتانەی کە هەمیشە تووڕە و دڵئێشاو بووە. هەمان ئەو کەسوکار و خزمانەی کە پێشتر دەبوونە هۆی تووڕەیی و هەڵچوونی، ئێستا پێیان سەرگەرم [و کەیفخۆش] دەبێت. کاتێک بەڕێز "ئا" بۆ ٣٤٧ ەمین جار چیرۆکی "**تیرادل فۆگۆ**"ی گێڕایەوە، دڵی خۆی بەوە خۆش کردبوو کە دەزانێ تا ئێستا چەند جار گێڕاویەتەوە و حیسابەکەی لە دەست دەرنەچووە و بە هیچ شێوەیەکیش هەستی بە بێهوودەبوونی گێڕانەوەی ئەم چیرۆکە نەدەکرد. ڕۆژێکیان ڕێک لە کاتێکدا کە بە پەلە بەرەو وێستگەی شەمەندەفەری سەرلەبەیانیی ڕای دەکرد بۆ ئەوەی بیگاتێ، قەیتانی پۆستاڵەکانی پچڕا و پاش کەمێک تێڕامان پێی وا بوو کە ئەم بەسەرهاتە لە مێژووی ئەم جیهانەدا هیچ بەها و بایەخێکی نییە و کاتێکیش خەریک بوو پێشنیاری هاوسەرگیریی ئاراستە[ی خانمێک] دەکرد، بە هاتنی دراوسێیەکی ناوەخت قسەکانی پچڕا، بە خۆی وت هەموو تاکەکانی مرۆڤ لەم جۆرە نامرادییانەیان هەبووە!

حەزرەتی "ئادەم"یش لەم ڕووەوە کەسێکی ئاوارتە نەبوو و ئەویش بەشی خۆی کێشە و گرفتی هەبوو. زۆرن ئەو کەسانەی کە پێشهات و ڕووداوە تاڵەکان لەگەڵ ئەوانەی کەسانی دیکەدا دەشوبهێنن و بەراوردکاریی لە نێوانیاندا دەکەن بۆ ئەوەی ناکامییە بچووکەکانیان هێور بکەنەوە. بە باوەڕی من هەموو ژن و پیاوێکی شارستانیی، وێنایەکی لە سەر خۆی لە

مێشکدا هەیە و هەر کات ڕووداوێک هاتە ئاراوە کە کاریگەریی نەرێنیی لە سەر ئەو وێنایە دابنێت، دڵیان دەڕەنجێت. باشترین چارەسەریش ئەوەیە کە تاک نەک تەنها تاقە وێنەیەک بەڵکوو پیشانگایەک لە وێنەی لە مێشکدا هەبێت و هەر جارەو لە هەر بوارێکدا وێنەیەکی گونجاویان هەڵبژێرێت. ئەگەر هەندێک لەم وێنانە پێکەنیناویی بن باشترە. کارێکی ئاقڵانە نییە تاک بە درێژایی ڕۆژ خۆی وەک قارەمانی تراژێدیایەک ببینێتەوە. من پێشنیاری ئەوە ناکەم تاک هەمیشە خۆی وەک قەشمەرێک ببینێت، چوونکە کەسانێک کە وا دەکەن زیاتر کێشە و ئاریشە بۆ خۆیان ساز دەکەن. لە هەموو بوارێکدا سەلیقە و هزر پێویستە، دیارە ئەگەر ئێوە بتوانن خۆتان فەراموش بکەن و بە گشتیی خۆتان هیچ دەستێوەردان و دەورێکتان لەم ڕووەوە نەبێت شتێکی جوانە، بەڵام ئەگەر دەستێوەردان و دەورگێڕان بەشێک بێت لە سروشتیی دووهەمتان (سروشتی سانەوی)، ئاگادار بن بە ڕەچاوکردنی فرەچەشنیی و خۆشگوزەرانیی، خۆتان لە ژیانی یەکچەشن ڕزگار بکەن.

زۆرێک لەم تاکە چالاکانە لەو باوەڕەدان کە تۆسقاڵێک حەزکردن بە خۆبەدەستەوەدان و ڕەزامەندیی و تەنانەت تۆزێک گاڵتە و گەپ و قسەخۆشیی، کاریگەرییەکی زۆری لە سەر سڕینەوەی هێزی ئیرادە و بڕیار دەبێت، هێندەی کە سەرکەوتنیان بەرەوڕووی هەندێک مەترسیی دەکاتەوە. بە ڕای من ئەم کەسانە لە هەڵەدان. کەسانێک کە هەڵدەستن بە ئەنجامدانی کارێکی بەنرخ و بایەخدار، تەنها لە بەر ئەوە نییە کە کارەکە گرینگ یاخود ئاسانە و، خۆیان بەوە هەڵناخەڵەتێنن. کەسانێک کە بە خۆهەڵخەڵەتاندن کارەکەیان ئەنجام دەدەن، وا باشترە پێش درێژەدان بە کارەکە، وانەی بەرەنگاربوونەوەی حەقیقەت بخوێنن چوونکە درەنگ یاخود زوو پێویستیی پەنابردنە بەر وەهم و خەیاڵات دەبێتە هۆی ئەوە کە وەچنگ نەهێنانی سوود و قازانج دەیانڕەنجێنێت. ئەگەر تاک هیچ کارێک نەکات زۆر باشترە لەوەی کارێک بکات کە زەرەر و زیانی لێ بکەوێتەوە. نیوەیەک لە کارە زەروورییەکانی دنیا لە پێناوی ڕێگرتن لە کارە زیانبەخشەکان ئەنجام دەدرێن. ئەو زەمەنە کورتەی کە بۆ فێربوونی حەقیقەتەکان سەرف دەکرێت، زەمەنێکی لەکیسچوو نییە؛ بەڵکوو کارێک کە لە پاش ئەو زەمەنەدا ئەنجام دەدرێت بێگومان زیانێکی کەمتری هەیە لەو کارانەی کە بۆ پاڵپێوەنانی دەروون و وروژاندنی وزە ئەنجام دەدرێت.

تۆزێک هەوێنی خۆبەدەستەوەدان بۆ بەرەوڕووبونەوەی هەندێک ڕاستیی سەبارەت بە خۆتان پێویستە. ئەگەرچی ئەم شێوازە ڕەنگە لە سەرەتادا تێکەڵ بە خەم و خەفەت بێت بەڵام دواجار دەبێتە پاڵپشت و لە ڕاستییدا تاقە هۆکاری بەرەنگاریکەری ناکامیی و بێهیوایی و هەڵاتنە لەو ئەندێشە پڕوپووچانەی کە تاکی خۆهەڵخەڵەتێنەر ئاگایانە ئەسیریان بووە. سەرەنجامیش لەوە تێ دەگەین کە هیچ شتێک وەڕسکەر و جاڕسکەرتر لە هەوڵدانی بێوچان بۆ باوەڕهێنان بەو پرسانە نییە کە قبووڵکردنیان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ سەختتر دەبێت و بۆ ئەوەش کە خەم و کەسەری دڵ بە تەواوەتیی بڕەوێتەوە، هەوڵدانی جدیی و شێلگیرانە، پێویستترین مەرجی بەختەوەرییەکی جێگیر و سەقامگیرە.

## ١٧

## تاکی بەختەوەر

تا ئێرە بۆمان دەرکەوت کە بەختەوەریی تا ڕادەیەک لە دەرەوەی بازنەی هۆکارە دەرەکییەکانەوە نییە و بەشێکیشی دەگەڕێتەوە بۆ ڕێساکانی دەروونی تاک خۆی. ئێمە ئەو بەشە لە کاریگەرییەکانی بەختەوەرییمان تاوتوێ کردووە کە لە سەر بنەماکانی «بوون»ی تاک ڕاوەستاون و دەرەنجامی ئەو تاوتوێکردنەش، ئەوەیە کە بەدەستهێنانی بەختەوەریی هێندەی پێوەندیی بە کردەوەکانی تاکەوە هەبێت زۆر ئاسانە. زۆرێک لە خەڵک وا بیر دەکەنەوە کە ئەگەر کەسێک باوەڕێکی تا ڕادەیەک ئایینیی نەبێت، مەحاڵە بەختەوەر بێت و ژمارەیەکی زۆریش کە خۆیان بەختەوەر نین لەو باوەڕەدان کە خەمەکانیان پێوەندیی بە [نەبوون یان کزبوونی] لایەنی ڕۆحیی و مەعنەوییەوە هەیە. من پێم وا نییە وەها هۆکارگەلێک هۆکاری ڕاستەقینەی بەختەوەریی یان بەدبەختیی بن، بەڵکوو پێم وایە ئەمانە تەنها نیشانە و دەرکەوتەکانین. بە گشتیی تاکی بەدبەخت، باوەڕ(ئیمان)ێکی تێکەڵ بە بەدبەختیی پێ قبووڵە، بەڵام مرۆڤی بەختەوەر لەوپەڕی باوەڕ و ئیماندا بەختەوەریی قبووڵ دەکات. هەر کام لەم دوانە ڕەنگە سەرچاوەی بەدبەختیی یان بەختەوەرییان بگەڕێننەوە بۆ باوەڕەکەیان، لە کاتێکدا هۆکاری ڕاستەقینە شتێکی دیکەیە. هەندێک هۆکاری وەک دابینکردنی تەندروستیی، خۆشەویستیی، کاری سەرکەوتنانە و ڕێزگرتن لە لایەن خەڵکەوە، هەر چەندە شتی زۆر سادەن بەڵام بۆ بەدەستهێنانی بەختەوەریی پێویستن. بە ڕای هەندێک کەس، پلەی دایکایەتیی و باوکایەتیش لە بنەما هەرە سەرەکییەکانە و ئەگەر بوونیان نەبێت، تەنها کەسانێکی ئاوارتە دەتوانن هەست بە بەختەوەریی بکەن و ئەگەر ئەم تایبەتمەندییانە لە ئارادا

بن، یاخود بە هەوڵ و تەقەلای شێلگیرانەوە بە دەست بێن، بەڵام لە کاتی سڕانەوەی گرفتارییەکانی تاکدا هەلی دەرکەوتنیان بۆ نەڕەخسێت، بە دڵنیاییەوە دەبێ سەرچاوەی بابەتەکە بگەڕێنینەوە بۆ هۆکارە دەروونی(ڕۆحی)یەکان و ئەگەریش ئەم حاڵەتە ڕووی لەزیادبوون و قەیرانییبوون نا، پێویستمان بە دەروونشیکار دەبێت. بەڵام لە دۆخە ئاساییەکاندا کەسی نەخۆش دەتوانێت بە پاڵپشتیی خۆی دەست بە چارەسەرکردنی خۆی بکات، بە مەرجێک مەعریفەی بە ڕێژەیەکی زۆر بخاتە گەڕ. لە کاتێکدا کە هەلومەرجی دەرەکیی بە شێوەیەکی حەتمیی و لێبڕاوانە هۆکاری بەدبەختیی نین، دەبێ تاک بتوانێت بە بەختەوەریی بگات بە مەرجێک ورووژان و حەزەکانی بە ئاراستەی خۆکردنەوەدا[١٠٥] سەرف بکرێن نەک ئەوەی کە لە بازنەی وەهمە دەروونییەکانیدا بە سەرگەردانیی بمێنێتەوە. کەواتە دەبێ هەوڵ و تەقەلامان لە بواری ئەو زانستانەی کە فێریان دەبین، هەماهەنگ بێت لەگەڵ یاسا پەسەندکراوە جیهانییەکاندا، تا بتوانین خۆمان لە عاتیفەگەلی خەستوخۆڵ دوور بگرین و هەست و عاتیفەگەلێک بە دەست بێنین کە نەهێڵن بیر و بیرۆکەکان، بوونمان داگیر بکەن. سروشتی هیچ تاکێک بەم شێوەیە نییە کە لە گرتووخانەدا هەست بە بەختەوەریی بکات و ئەو عاتیفانەش کە ئێمە لە ناو خۆماندا قەتیس دەکەن، یەکێک لە خراپترین زیندانەکانە. لە ناو ئەم دەرکەوتە ئیحساسیی و عاتیفییانەدا، ترس، هەستی تاوانباریی، سستیی و لاوازیی، بەزەیی پێداهاتنەوە و خودشەیدایی، زیاتر لە هاوشێوەکانیان سیستمی فکریی تێک دەدەن. لە هەموو ئەم نموونانەدا بە هۆی کۆبوونەوەی عاتیفەکان لە نەفسدا، هیچ حەزێک بەرامبەر بە جیهانی مادیی بەدیی ناکرێت و لە هەمان کاتیشدا دەبێتە هۆی هاتنەئارای شڵەژانی فکریی و وەهمی پێکادانی دەروونیی و، لە ئەنجامیشدا هەڵاتن لە حەقیقەت دەبێتە هۆی زاڵبوونی وەهم و خەیاڵ بە سەر ئەقڵدا.

پێویست بە بەڵگەهێنانەوە ناکات کە ترس یەکێک لە هۆکارە سەرەکییەکانی خۆگێلکردن لە ڕاستییەکانە و بەم هۆیەشەوە تاکەکان تەنانەت خۆیان بە شتە ڕواڵەتییەکانی جیهانەوە سەرقاڵ دەکەن بەڵام بە هۆی کێشمەکێشە چاوەڕواننەکراوەکانی سەردەمەوە لەم ململانێیەدا

١٠٥ - مەبەست کرانەوە لە ڕووی ڕۆحیی و دەروونییەوە بە پێچەوانەی ڕۆچوونە ناوخۆ. و. ک.

زیانیان بەر دەکەوێت. کەسانێک کە توانای هەڵخەڵەتاندن و فریودانیان هەیە، ئەگەر بە ویژدانەوە تێ ڕابمێنن، دەرک بەوە دەکەن کە کارەکەیان کارێکی نائاکاریی و پڕ لە ڕق و نەفرەتە. یەکێک لە کەموکوڕییە سەرەکییەکانی کۆبوونەوەی عاتیفەکان لە نەفسدا، لەناوچوونی جیاوازیی و فرەچەشنییەکانی ژیانە. تاکێک کە هەموو حەزەکانی بەرەوڕووی نەفسی خۆی دەکاتەوە، ڕەنگە هۆیەکی تایبەتیی بۆ تێبینیکردنی ئەم بابەتەی پێ شک نەبردرێت، بەڵام سەرەنجام تووشی تەنگژەی یەکچەشنییەکی تاقەتپڕووکێن دەبێت و هەست بە پەشیمانیی دەکات.

لە ڕاستیدا تاوانکاران کەسانێکی لەخۆبایی و خۆپەرستن کە لە دەروونیاندا گرینگییەکی زۆر بۆ پاکیی و خواترسیی قایلن و ئەوەی جێی سەرسووڕمانە ئەوەیە کە هەندێک ئایین، پەسن و ستایشی ئەم جۆرە تاوانانەیان کردووە و بەرزیان نرخاندوون.

مرۆڤی بەختەوەر بە کەسێک دەوترێت کە لە ژیاندا بە دوای ئامانجێکەوە بێت و بنەما گشتییەکانی سۆز و خۆشەویستیی دەگوێزێتەوە بۆ کەسانی چواردەوریشی و سەرەنجام کاتێک بەختەوەریی خۆی لە بەرزترین حاڵەتی مرۆییدا دەبینێتەوە کە سەرکۆنەی[١٠٦] ئەو سۆز و خۆشەویستییە نەکات کە دەیبەخشێت. هەرگیز ناتوانین چاوەڕێی ڕزگاربوون و سەرکەوتن لەو کەسانە بکەین کە لە ناو هەوای نەفسیاندا قەتیس ماون و تا کاتێکیش گیرۆدەی ئەم قەیرانە گەندەڵەن، هۆکارەکانی بەدبەختیی، بە ئاسانیی لە دەوریان کەڵەکە دەبێت. ئەڵبەتە ئەگەر وەها کەسێک حەز بکات خۆی لە زیانە دەروونییەکان ڕزگار بکات نابێ گاڵتە بە حەقیقەت بکات چوونکە دۆزینەوەی نەخۆشیی، چارەسەرکردنی نەخۆشییەکەی بە دواوە دەبێت و لەم قۆناغەی دۆزینەوەدا پێویستە بەم شێوەیە ڕەفتار بکات. سەرەتا زەینی ئاگا دەبێ خۆی قەناعەت بە خۆی بێنێت و ناتوانین لەم قۆناغەدا هیچ بیانوویەک بۆ هەستی تاوانباریی بیبینینەوە. پاشان وەک پێشتر وتمان، دەبێ بەردەوام ئەنجامگیرییەکی لۆژیکیی هەڵگری تێکۆشان و هەوڵدانی دەروونیی، لە نەستماندا جێگیر بکەین. دیارە لە هەلومەرجی هەڵاتن لە تاوان، حەزە مرۆییەکان بە ئاراستەی بەرژەوەندییە ڕەواکانی تاک و کۆمەڵگا جێگیر و

١٠٦ - سەرکۆنە کردن بە واتای منەت بەسەر کەسێکدا کردن. و. ک.

سەقامگیر دەبن. ئەڵبەتە داماویی و زەبوونیی و ترس و زەلیلیی، بە هۆکارە سەرەکییەکانی بەدبەختیی دێنە ئەژمار.

ئەگەر ترس، هەندێ وەهمی ئاڵۆز و بێکۆتایی لە بوونماندا بچێنێت، دەبێ پەرە بە بوێریی و ئازایەتیمان بدەین چوونکە لە سەردەمانی ڕابردوودا ئازایەتیی و چاونەترسیی جەنگاوەران لە گۆڕەپانەکانی شەڕدا، بە هێمای بەهێزتربوونیان هاتۆتە ئەژمار. زۆربەی کات لە بواری پەروەردەی منداڵاندا، گرینگترین ئەرک هێنانەئارای خەسڵەتی ئازایەتیی بۆ گۆڕەپانی شەڕ بووە بەڵام بە داخەوە ئەمڕۆ لە هۆڵی شانۆی ژیاندا دەوری بوێریگەلی ئاکاریی و ڕۆحیی، کەمتر گرینگیی پێ دەدرێت. دیارە ئەم ڕاستییە لە کۆمەگا مرۆییەکاندا قابیلی هەستپێکردن و جێبەجێکردنە و، لە کاتێکدا کە مرۆڤ توانای ئەوەشی تێدایە بە ڕێژەیەکی زیاتر و بەرینتر ئەم ڕاستییە قبووڵ بکات، [بە ڕەچاوکردنی ئەم ڕاستییە] چیدی بوونەوەرێکی ملکەچ و گوێڕایەڵ نەدەبوو، بەڵکوو بە شێوەیەکی بەرفراوان بەهێز و بەتوانا دەبوو. کاریگەرییەکانی دەوروبەر هەمان ئەو هۆکارانەن کە بە ئەگەرێکی زۆرەوە ڕەوتی حەزەکان دەگۆڕن، بەڵام هەرکە تاک توانیی نهێنییە دەروونییەکانی خۆی بدۆزێتەوە، توانای بەرێکەوتن بەرەو شوێنی مەبەستی ڕاستەقینەشی بە دەست هێناوە. هەوڵ و ماندووبوونی بەرفراوانی نووسەران بۆ ئاراستەکردنی شێوازەکانی ئاکار، بە پاساودانەوەیەک بۆ وازهێنان لە دەروون (تەرکی نەفس) لە قەڵەم دراوە، بەڵام مەبەست لەم هەموو هەول و تەقەلایە بە گشتیی وازهێنان لە دەروون نییە بەڵکوو پێویستیی ڕێکخستنی شێوازە ڕەواکانی دەروون (نەفس)ە.

لەم کتێبەدا هەوڵی ڕوونکردنەوەی ئەم خاڵەم داوە کە تەنها لە ئامانجێکی یۆتۆپیایی تەواودا، هەمووان هەموو شتێکیان هەیە - ئەڵبەتە بێجگە لە کاتە ئاوارتە و حەتمییەکان - مەبەستم لەو بیروڕایانەیە کە لە لایەن خاوەن قوتابخانە ڕۆحانیی و ئاکارییەکانەوە بە سەر هزری کۆمەڵگاکاندا زاڵ بووە و ماوەتەوە و، ئەوانەی کە وە دوایآن کەوتوون پەسەندن و، ئەوانەش کە بە پشتبەستن بە دیاردە و ڕواڵەتە دەرەکیی و ئیحساسییەکانەوە، وە دوای حوکمە نامەعقوولەکان کەوتوون، لە ڕاستییدا لە دژی ڕاستییەکان وەستاونەتەوە. یەکێک لە غەریزە جوانەکانی مرۆڤ، یارمەتیدان و هاریکارییە و، لە کاتی شاڵاوی مەترسییەکاندا لە ناخی زۆربەی مرۆڤەکاندا دەردەکەوێت. بۆ نموونە کاتێک منداڵێک خەریکە [لە ئاوی ڕووبار یان

دەریایەكدا] نوقم دەبێت، غەریزەی هاریكاریی هانتان دەدات ڕزگاری بكەن و ئەمە ڕێک هەمان ئەو شێوازەیە كە ئاكارخوازەكان ناوی «سیفەتە چاكەكان»ی لێ دەنێن. جیاوازییەكی بەرچاو لە نێوان بۆچوونەكانی من و ئاكارخوازەكاندا هەیە سەبارەت بە شێوازەكانی ژیان. بۆ نموونە ئەوان لەو باوەڕەدان خۆشەویستیی دەبێ دوور لە كۆتوبەندەكانی خۆپەرستیی بێت كە دیارە ئەمە خۆی قسەیەكی پڕ بایەخە بەڵام بێگومان نابێ چەمكە چەسپاوەكان بە شێوەیەكی ئەوتۆ بڕازێنینەوە كە لەگەڵ بەختەوەریی تاكەكاندا نەیەتەوە.

ئێمە بیر لە بەختەوەریی هاوڕێكانمان دەكەینەوە بەڵام هەرگیز ئەم باوەڕەمان نابێت كە بەختەوەریی ئەوانمان لە بەختەوەریی خۆمان لە لا گرینگتر بێت. بەڵام هەر ئەوەندەی كە لە بازنەی ڕێز و حورمەت و خۆشویستنی كەسانی دەوروبەرماندا لێكهەڵپڕژان و پێكادانێكی بەرچاو ڕوو نەدات، بە شێوەیەكی ڕەوا و ئابڕوومەندانە لە دژی سەركێشییەكانی نەفسمان خەباتمان كردووە و لە وەها هەلومەرجێكدا مەعریفە تێكەڵ بە بوونی مرۆڤ دەبێت و لە ئەنجامیشدا دەبێتە هۆی ئەوە كە تاک لە پرۆسە سۆزاویی و ئیحساسییەكان بەجێ نەمێنێت و وەكوو تۆپی بیلیارد تەنها بە هۆی بەریەككەوتنەوە پێوەندیی بە یەكەوە نەكەن. بە هەر حاڵ تاكی بەختەوەر، هۆكارەكانی شڵەژان و پەرێشانیی نایگرێتەوە و بەبێ هیچ گیر و گرفتێک كۆنترۆڵی نەفسی خۆی بە دەستەوە دەگرێت و، بە خێرایی مەعریفەی هزری بەهێز دەكات. كەسێكی ئاوها چێژ لە هەلەكانی ژیان وەردەگرێت و هەرگیز لە مەرگ ناترسێت چوونكە خۆی بە نەوەكانی داهاتووەوە پەیوست كردووە و لە هەلومەرجەكانی سەردەمەكەی خۆی غافڵ نەبووە و هەر بۆیەش بە سەر لووتكەی بەختەوەرییدا سەردەكەوێت.

## کتێبە چاپکراوەکانی وەرگێڕ:

١ - **هەشت نامە.** گۆنتەرگراس. کینزابۆرۆ. (بە هاوبەشی). دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم. سلێمانی ٢٠٠٢

٢ - **فێر بین چۆن بە سەر ترس و دڵەڕاوکێی خۆماندا زاڵ بێن.** جۆرج باربارن. (بە هاوبەشی). بنکەی ئەدەبیی گەلاوێژ. سلێمانی ٢٠٠٢

٣ - **نامەیەك دەربارەی لێکبووردن.** جۆن لۆك. (بە هاوبەشی). خانەی وەرگێڕان. سلێمانی ٢٠٠٤

٤ - **تێگەییشتنی تیۆرە سیاسییەکان.** تۆماس سپراگێنز. خانەی وەرگێڕان. سلێمانی ٢٠٠٥

٥ - **کورتە مێژووی گۆڕانکارییەکانی کۆمەڵناسیی.** بۆتول. خانەی وەرگێڕان. سلێمانی ٢٠٠٥ ـ (ئەم کتێبە هەر لە هەمان ساڵدا بە ناوی «دامەزرێنەران و سەرهەڵدانی کۆمەڵناسیی»ەوە لە دەزگای چاپ و پەخشی سەردەمیشدا چاپ کراوە)

٦ - **فیمینیزم.** جیەن فریدمەن . خانەی وەرگێڕان . سلێمانی ٢٠٠٦

٧ - **فەرهەنگی زاراوەکانی فەلسەفە و زانستە کۆمەڵایەتییەکان.** دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم . سلێمانی ٢٠٠٧

٨ - **ئێمە و مۆدێرنیتە.** داریوش ئاشووری. دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم. سلێمانی ٢٠٠٩

٩ - **ئاینی زەردەشت، (سێ هەزار ساڵ باوەڕ و دەسەڵاتی نەمر).** مێری بۆیس. دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم. سلێمانی ٢٠١٠

١٠ - **ژیانی منداڵیم.** نووسینی چارلی چاپلین. دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی. هەولێر ٢٠١١

١١ - **چیرۆکە نەمرەکانی فەلسەفە.** هێنری تۆماس - دانالی تۆماس. دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم. سلێمانی ٢٠١١

١٢ - – **مێژووی ئەندێشە و قوتابخانە سیاسییەکان.** گایتانۆ مۆسکا. دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم. سلێمانی ٢٠١٢

**بەرهەمەکانی ئامادەی چاپ:**

١٣ - **داگیرکردنی بەختەوەریی**. بێرتراند ڕاسڵ. براوەی خەڵاتی نۆبڵی ساڵی ١٩٥٠.

١٤ — **داستانەی ناتەمامە**. کورتە ڕۆمان. نووسین.

١٥ — **هەناسێوە تا یاوای**. کورتە ڕۆمان. نووسین

١٦ - **تارمایێ بۆگەنێ**. کۆمەڵە چیرۆک. نووسین

١٧ - **چاخی سەهۆڵبەندان**. کۆمەڵێک وتار و وەرگێڕان و ڕەخنەی ئەدەبیی. نووسین و وەرگێڕان.

١٨ - **ئەقڵ دژی ئەقڵ**. کۆمەڵێک وتاری وەرگێڕدراوی فکریی، فەلسەفیی، ئەدەبیی.

١٩ - **نامەیەك دەربارەی لێبوردەیی**. جۆن لۆك. (ئەم کتێبەم یەکەمجار و لە چاپی یەکەمدا(ساڵی ٢٠٠٤) بە هاوکاریی شۆڕش جوانڕۆیی و، ئەمجارەیان سەرلەنوێ و بە تەنهایی وەرمگێڕاوەتەوە).

٢٠ - **ئەو ڕۆژەی کە خۆی، فرمێسکەکانم دەسڕێتەوە**. کینزابۆرۆ ئۆ. ڕۆمان.

٢١ ـ **ڕاڤەی نوێ لەسەر فەیلەسووفانی سیاسی مۆدێرن.**

٢٢ ـ **ڕێگای خۆشەویستی... ژیان و ئەندێشەکانی ماهاتما گاندی**. ئێکنات ئیسواران.

www.emrro.com/malperifershid
baran١٣٥٦@gmail.com




**کتێبەکانی:**

**"ڕاڤەی نوێ لە سەر فەیلەسووفانی سیاسی مۆدێرن"**

**"ڕێگای خۆشەویستی...ژیان و ئەندێشەکانی ماهاتما گاندی"**

**وەرگێڕانی فەرشید شەریفی، بەم زووانە دەکەونە بەر دەستی خوێنەران.**